16

# بۆ ئازادی

## کۆبەرهەمی شیعری
## ڕێبوار

پێشەکی، لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن
ئەنوەر حسێن (بازگر)

2021

# بۆ ئازادی


| | |
|---|---|
| بابەت: | کۆبەرهەمی شیعری ڕێبوار |
| پێشەکی، لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: | ئەنوەر حسێن (بازگر) |
| دیزاینی ناوەوە: | ئومێد محەمەد |
| پێداچوونەوە: | هیوا کازم |
| بەرگ: | ئارام عەلی |
| تیراژ: | 500 دانە |
| چاپی یەکەم: | 2013 |
| چاپی دووەم: | 2021 |
| چاپی سێیەم: | 2021 |
| نرخ: | 7000 دینار |
| چاپ : | ئایدیا |

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی (1621)ی ساڵی 2020 پێدراوە

شیعر

# بۆ ئازادی

## کۆبەرهەمی شیعری
## ڕێبوار

پێشەکی، لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن
ئەنوەر حسێن (بازگر)

2021

## پێڕست


بۆ چاپی دووەم: ڕێبوار، ژانی هەموانە.............(بازگر).........11
بۆ ئازادی هەوڵێکی تر بۆ گەنجینەی شیعر.......(بازگر).........15
ڕێبازی ئەم ڕێبوارە.......................................ڕێبوار.........19
ڕێبواری شاعیر، «ئوژێن پۆتیە»ی کوردە....حسێن بەفرین..29
ڕێبوار، شاعیری هەمووان.........................(بازگر)...........37

**دەفتەری یەکەم: گەشتێ لە کوردستان**.............................63
گەشتێ لە کوردستان..........................................................64
هەورامان...........................................................................65
مەریوان.............................................................................67
سنە..................................................................................69
سەقز و بانە........................................................................71
لادێ.................................................................................73
بۆکان.................................................................................76
سابڵاغ...............................................................................78
ویڵ ئەبم............................................................................80
خەونی سوور......................................................................82
براڕۆ.................................................................................86

**دەفتەری دووەم: سروودی سڵاوی ئازادی**.............................87
سڵاوێک لە عاشقانی ئازادی.................................................88
ئەنتەرناسیۆنال...................................................................90
بڕیاری یەکی ئەیار............................................................92
پێشمەرگەی کۆمەڵە..........................................................95
سروودی ژنانی تێکۆشەر......................................................98
سروودی کاک فوئاد............................................................100

سرودی کاک شوان........................................................ 102
سرودی مام ڕەحمان........................................................ 106
ئاسۆی سۆسیالیزم........................................................ 108
سڵاو لە پێشمەرگە........................................................ 110
زەحمەتکێشان چەکداربن........................................................ 111
حیزبی خەباتکار........................................................ 113
سروودی پێشڕەو........................................................ 115
دوو پەیکەرە........................................................ 117
نامە بۆ دایکانی زیندانیەکان........................................................ 121
ماڵاوایی........................................................ 125
وەڵامی نامەکەی ڕووناک........................................................ 127
سەد بەهار بەشوێن «مارکس»دا........................................................ 129
گۆرانی زارە بچکۆلەکان........................................................ 131
نامەت نایەت نازانم بۆ؟........................................................ 135
دەنگی سرود........................................................ 139
ئەم دڵەی من........................................................ 141
بۆ هاوڕێ جەمال........................................................ 142
دۆشکا........................................................ 147
بۆ: ڤیکتۆر خارا........................................................ 149
دەریای جەماوەر........................................................ 152
دەرزی قژ........................................................ 154

**دەفتەری سێهەم: دەنگ هەڵبڕە........................................................ 155**
دەنگ هەڵبڕە........................................................ 157
بانگەواز........................................................ 159
سواری ماندوو........................................................ 165
بیهێنە پێش چاو........................................................ 171
دڵی شکاو........................................................ 173
لەم بازاڕە بێڕەحمەدا........................................................ 174
بەرەژان........................................................ 175

سەد ساڵە، سەد ئەیار............................................178
با هیچ خەمێ رێی پێنەگرێ........................................185
جەژنی ئەیارم خۆش ئەوێ..........................................188
ماسی............................................................190
لێم دەپرسی......................................................191
کاتێک شەش دەرت گیراوە..........................................192
جێ پێ...........................................................193
بەختە-باران.....................................................195
هاوڕەنج.........................................................197
خۆشەویستیت.....................................................198
وەڵام............................................................199
وەرە.............................................................201
سەرنجی مانگ....................................................202
دوو گەلاوێژ......................................................203
ئاو..............................................................204
درەخت...........................................................205
نەرگسی بەر باران...............................................208
ئاخێزێک.........................................................211
ســڵاو...........................................................215
بمتوانیایە.......................................................216
ژانی لەدەستچوونی یاران.........................................217
ئەی رابەرە دڵسۆزەکە.............................................219
هەتاو نەبوو.....................................................231
گوێگرن..........................................................234
لەگەل شاعیرانی تر..............................................237
گۆرانی پارچە چنانی «سیلزی»....................................239
داستانێکی زستانە...............................................242
لەشکری برسیەتی.................................................244
لەگەل دەریای شینی «پوشکین»....................................246
کلووچە..........................................................248

دەمانەوێن................................................249
ئاواتەکەم................................................250
سپاس................................................251
لایە لایە................................................254
باخچە................................................262
ڤیکتۆر هوگو................................................263
لەگەل کێتە؟................................................265
بۆ دەرەوە................................................268
ئۆکتۆبەر، بە شوێن چریکەی «لێنین»ی «مایاکۆڤسکی»دا.....269

**دەفتەری چوارەم: چەند لاپەڕە لە دەفتەری رۆژانەم................279**
چەند لاپەڕێک لە دەفتەری رۆژانەم................................................280
چ بەستەزمانە ئازادی................................................287
شاژن................................................288
هەڵەبجە................................................289
عەفوو................................................293
حەقتان چییە؟!................................................295
قەڵادزێ................................................297
شەهید................................................298
نەفرەت................................................299
جەنازە................................................300
هەرزانی................................................301

**دەفتەری پێنجەم: هەستی پاراو................................303**
وەرگێڕاوی ئازاد لە گۆرانییەکانی ترەیسی چاپمەن............304
قسە لە شۆڕشە................................................305
ماشێنی تیژ-ڕەو................................................307
ئەوبەری خەت................................................312
ئەودیو دیوار................................................314
ژیکەلانە! ئەمشەو لام دەمێنیتەوە؟................................316
عالەمێک شت................................................318
کچە، بلیتی خۆی وەرگرتووە................................................321

بۆچی؟..................................... 323
بۆ ئازیزم..................................... 325
ئەگەر ئێستا نە..................................... 327
بۆ تۆ..................................... 328

**دەفتەری شەشەم: چەند شیعرێکی تر..................... 331**
بەڕێز جەنابی سەرکۆمار..................................... 332
دەستی ماندوو..................................... 336
میوانی تۆن..................................... 338
شیرین ئەدوێ..................................... 340
تا هەتایە..................................... 341

**دەفتەری کۆتایی: چاپ نەکراوەکان..................... 343**
بۆ فوئاد..................................... 345
بەهار..................................... 348
سیمان..................................... 350
مەگری، پایز!..................................... 353
پاریسی «پێرلاشەز»..................................... 356
بڤە!..................................... 359
بۆ فەرخوندە؛..................................... 361
بژی کوبانێی بەرەنگار..................................... 364
بەجێم هێشتی..................................... 367
ئەچین بە گژ رۆژ-گیرانا..................................... 369
یەک بین..................................... 372
دیالۆگ..................................... 376
وەرە هاوڕێ!..................................... 379
ئاسنگەران ..................................... 382
ئەم ڕێبوارە..................................... 385
بێنە پێش چاو..................................... 390
عەقڵی مەیموونی..................................... 392

بەهار.................................................................395
مۆنۆلۆگ لە گەڵ بەهار...................................................396
هەرگیزیش دەبێتە ئەمڕۆ!.................................................399
بەهاری بژوێن.......................................................401
لە ئاوێنە خوێناوی یەکەی................................................403
نەک شار-بەدەر؛ دنیا-بەدەر!..................................................405
دەستەکانت.........................................................407
کچی بەهار.........................................................411
هێز لە یەکیەتی دایە.....................................................414
کچی شۆڕشگێڕ.........................................................417
لەشفرۆش!.........................................................419
بە شوێنەواری باب دیلانا؟..................................................422
دژی سێدارە و ئیعدام.....................................................425
خیابان خرۆشاوە.........................................................429
بۆ سولەیمان.........................................................431
بەڕێزە گیانبازیتان.........................................................434
ئازادی، بەڕابەری، حکومەتی کارگەر.....................................437
پەپوولە.........................................................438
وەک چۆلەکە.........................................................439
تاسەم لێت نەشکا.........................................................441
دەسا ڕاپەڕن.........................................................442
هەروا تاوێک.........................................................443
سروودی دوو پەیکەرە.........................................................445

**لێکۆڵینەوەکان دەربارەی شیعری ڕێبوار**

ڕێبوار، ئەلگۆ و سیمبوڵی ئەدەبی کرێکاری و چینایەتی.....449
ڕێبوار، سمبول و ڕەمزی ئەدەبی بەرگری.............................499
ژنبوون و جوانناسی لە شیعری شیرین ئەدوێ...............................525
دوالیزمی شیعر و شۆڕش لەخاکی ژیاندۆستیدا.................533
شیعری گۆرانی و ڕۆمانسییەت لای ڕێبوار.........................541

## بۆ چاپی دووەم:

## ڕێبوار، ژانی هەموانە

لە هەنگاوێکی نوێدا، چاپی دوەمی دیوانی "بۆ ئازادی"ی ڕێبوار پێشکەشی خوێنەران و ئەدەبدۆستان دەکەین، ئەم دیوانەمان بۆیە چاپ کردەوە، تا بە دیزاینێکی تازە و چاککردنی هەڵە و کەموکورتییەکانی چاپی یەکەم، بەرگێکی نوێ بە بەر شیعرەکان و دیوانەکەی ڕێبواردا بکەین. چاپی یەکەمی دیوانی ڕێبوار کە لە ساڵی (2013) بڵاو کرایەوە، وەک پێویست نەگەیشتبوە بەر دەستی شاعیران و ئەدیبان و لێکۆڵەران، بەشێکی زۆر لە خوێنەران داوای دووبارە چاپکردنەوەیان دەکرد، بگرە داوای شیعرە تازەکانی ڕێبواریشیان دەکرد تا لە کتێبەکەدا هەبێت. لە لایەکی ترەوە کەسانێکی هەبوون دەیانویست زیاتر ڕۆ بچنە ناو دەق و وێنە مێژوویی و شیعرییەکانی ڕێبوار، بۆیە ڕەنگە ئەم دیوانە پێویستی بەوە بێت چەند جارێک چاپ بکرێتەوە، تا بکەوێتە بەر دەستی زۆرینەی خەڵک و لێکۆڵەران، بۆ ئەوەی بتوانن لێکۆڵینەوە لە سەر شیعرەکانی بکەن.

ڕێبوار، شاعیری مرۆڤدۆست و ئازادیخواز، دەنگی کرێکار و چەوساوەکان و مرۆڤە ستەملێکراوەکان بوو، هەر زوو بوەتە هەڵگری بیروباوەڕی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم و بە ئەدەبیاتەکەی دێتە ڕیزی خەبات دژی فاشیزم و ئیمپریالیزم و تێکۆشان لە پێناو ژیانێکی خاڵی لە چەوسانەوە و تژی لە دادپەروەری. ڕێبوار بە

شێوەیەکی چڕتر و تۆختر و زەقتر لە هەر شاعیرێکی تر، خەبات دژی داگیرکاری و ئیمپریالیزم و ناعەدالەتی و چەوساندنەوە، بە شێوەی وێژە و شیعر و نووسراوی سیاسی بەرپا دەکات، یەکێکیش بوە لەو شاعیرانەی لە گۆڤاری "پێشەنگ"دا، کە بڵاوکراوەی کانوونی هونەری و ئەدەبیاتی کرێکاری بوو، شیعرەکانی بڵاو کردوەتەوە. لە زەمەنی خۆیدا و لە سەرەتاکانی بڵاوکردنەوەی شیعرەکانیدا، دەبێتە جێگای سەرنج و ڕامانی خوێنەرانی، بەشێکی زۆری شیعرەکانی ڕێبوار لە لایەن گەورە هونەرمەندانەوە کراون بە گۆرانی و سروود، کە دیارترینیان شیعری پێشمەرگەیە:

"سڵاوی گەرمی دڵی پڕ ئومێدی مەت پێشکەش،
پڵنگی هەردی وڵات ئەی هەڤاڵی پێشمەرگە
لە دەوری دەست و تفەنگت گەڕێم، کە ڕۆژی خەبات
لە ئاستی هەڵمەتی تیژت هیچ ناگرێت بەرگە"

ئەگەر قەرار بێت پێوانەکانی شیعر، شیعری سەرکەوتوو، بریتی بێت لە (ڕاستگۆیی، جوانناسی، کورتبێژی)، لە شیعرەکانی ڕێبواردا، هەر سێ پێوەر بە دی دەکرێن. بە ڕادەیەک کە ڕووداو و بەسەرهاتی چیرۆکەکانی ئەم شیعرانە پڕاوپڕن لە ڕاستگۆیی و واقیعیەتی سەردەمەکەی خۆی.

ئەم شیعرانە، دەکرێت وەکوو بیرەوەری و یاداشت و گێڕانەوەی مێژووی چینێک و نەتەوەیەک سەیر بکرێن، کە پڕن لە گێڕانەوەی ئەو حیکایەتانەی مرۆڤ ڕەنگە

بەم حاڵەی ئێستا، بۆی جێگای بڕوا نەبێت، بەڵام واقیع ئەوەیە کە ڕووی داوە، ئەو واقیعەی وا لە ناو دڵی شیعرەکانی ڕێبواردا، نووسینی شیعر لە هەلومەرجی دەیەی هەشتاکان دا. کارێکی تاقەتپڕووکێن و ماندووکەر بوە، لە ناو شەڕی سەختی شۆڕشگێڕی و لە ناو جەرگەی خەباتی کۆمۆنیستی، هیومانیستیدا دژی نابەرابەری و ستەم، چەوساندنەوەی ئینسان و تەحقیر و سوکایەتی بە ژنان، بەڵام جیا لەوانە، ڕێبوار بە عەزمەوە، بە ئیرادەوە دژی ئەو ناعەدالەتییانە وەستایەوە. ڕوو بە هەموو لایەک هاواری کرد، من ژانی هەمووتانم... من داکۆکیی ژنانم... من دیفاعکەری کرێکاران و زەحمەتکێشانم، ئەو نەک هەر پێشەنگی ئەدەبیاتی کرێکاری بوو، بەڵکوو لە مەیدانی وەرگێڕانی شیعریشدا ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی گێڕا، وەرگێڕانی شیعری "ئینتەرناسیۆنال" بۆ یەکەم جار بە زمانی کوردی و مانفێستی حیزبی کۆمۆنیست دوو کاری وەرگێڕان بوون، کە بە بەرینایی مەوجی شەپۆلی کرێکاری گرتەوە .

هیوادارم بەم کارەم توانیبێتم خزمەتێکی پڕ خۆشەویستی بە شیعری خۆرهەڵاتی کوردستان، بە ئەدەبدۆستان، دوا جار پێشکەش ڕێبواری هاوڕێم بکەم، کە شایستەی ئەوەیە کاری زیاتر و باشتر و جوانتر بۆ بەرهەمەکانی بکرێت. هیوادارم ڕێبوار تا چاپی سێیەم و چوارەم و چەندەمی تر، بە شیعرە قەشەنگەکانی، لاپەڕەکانی دیوانەکەی دەوڵەمەندتر بکات. پێم وایە ئەمەیش لە توانای ڕێبواردایە،

چونکە هێشتا توانای خەیاڵی جوان و داهێنانی گەورەی هەیە و دەکرێت دەقی ئاوازەی جوانتر بەرهەم بهێنێت، دڵنیام دەتوانێت ئەو کارە بکات.

بە هیوای خۆشبەختی بۆ هەموان، بە تایبەت بۆ ئەو مرۆڤە چەوساوانەی بوونەتە بەشێک لە کارەکتەری شیعرەکانی ڕێبوار.

**ئەنوەر حسێن (بازگر)**
**ژانوەی** 2020
**سلێمانی**

## پێشەکی بۆ چاپی یەکەم:

## (بۆ ئازادی) هەوڵێکی تر بۆ گەنجینەی شیعر

شیعر، وەک یەکێک لە ژانرە گرنگەکانی ئەدەب، پێ بەپێی ژانرەکانی تر، هەنگاوی گەورەی ناوە. لەو نێوەشدا شیعری کوردی، پشکی خۆی هەیە توانیویەتی لەپاڵ سەدان دەقی ناوازەی دونیادا، شوێن و جێگەو پێگەیەک بۆ خۆی بگرێت و شاعیرەکانی، لەسەر تاسەری دونیادا بناسرێن.

ئەوەش شاراوە نییە، زۆر هەل و ڕێ وشوێن و بوونی دەوڵەت، بۆ شاعیری دونیا، فاکتەرو یارمەتیدەر بوون، تابەزوویی بناسرێن و شیعرو دیوانەکانیان بەدونیادا بڵاوبکرێنەوەو بەسەدان رەخنە و لێکۆڵینەوە لەمێدیاکاناندا لەسەریان بنوسرێت، کە بەداخەوە ئەمە تاسەردەمێک بۆ شاعیرو نووسەرو هونەر مەندانی کورد زەحمەت بوو، ئەگەر چی هێشتاش ئەو فاکتەرانە، بێ-رێگر نین!

بەڵام سەرباری ئەو هەموو رێگریانە، شاعیری کورد دەق و قەسیدەی وای بەرهەمهێناوە کەهیچ کەسێکی ئاشنا بەشیعرو ویژدانی مرۆڤایەتی ناتوانێت سەرنجی نەداتێ و دان بەو هەقیقەتەدا نەنێت کە داهێنانن!

بێگومان لە خۆرهەڵاتی کوردستانیشدا، دەیان شاعیری گەورەو باش هەڵکەوتوون، کەخاوەنی قەسیدەی جوان و شیعری هاوچارخ و گەورەن، بەڵام وەکو باسمکرد، رەنگە زۆر فاکتەر هەبن، رێگایان نەداوە، ئەو هەقیقەتە وەکو خۆی بناسرێت، ئەگەرچی شیعر وەکو دڵۆپی ئاو وایە، بەتەنها درزێکی بەسە بۆ شکاندنی تینویەتی خاک، بێگومان

ڕۆژێکیش دێ تینویەتی ئەو شیعرانە بشکێ کە بێ هەناسە جێماون، ئەم هەوڵەی ئێمەش دەیەوێت دەربیجەیەکی بچووک بێت بۆ ناساندنی بەشێک لەشیعری شاعیران و هەوڵەکانیان لەکوردستانی ئێران، کەسەدان دەنگی جدی و شیعریی پڕ بەگەڕوو هاوارن بۆیە ئەم دیوانە بەشێکی پەیوەستە بەدەرخستنی هەوڵ و کۆششەکانی ئەوان، بەشێکی پەیوەستە بەدەرخستنی تواناو قودرەتی ئەوان بەسەر شیعردا، کە ڕەنگە مێژوو غەدری لێکردبن، ئێمە دەمانەوێت بەم کتێبە ئێوە ئاشنابکەین بەبەشێک لەهەناسە و شیعرو ڕەنج و ماندووبونی ئەم شاعیرە، کە پڕن لەدەردو ڕەنج و ئازاری ئینسان و بەش-مەینەتان و سروشتی کوردستان و قسەکردن لەسەر چەوساندنەوەی ئینسان و گەڕانەوەی بەهارو جوانیەکان بۆی، ژن و ستەم و بێ مافەییەکانی منداڵان و دەردو ئازاری کرێکاران و ئینسانی زەحمەتکێش و بەشمەینەت و بەدبەختی ئینسانی کورد، وەسفکردنی سروشتی جوانی کوردستان، پانتایی شیعرەکانی ئەم شاعیرەی داگیرکردووە، ئەو قسەی دڵی سەدان لەکچانو ژنانو منداڵانی کوردستان و ڕەنجدەران و زەحمەتکێشانی کردووە بۆیە، گەر بمانەوێت لەو ڕەنج و ئازارنەی تێبگەین دەبێ گوێ لەم شاعیرە بگرین و بەشیعرەکانی ئاشنابین

ڕێبوار (مصلح شێخولئیسلامی) ڕەنگە بۆ زۆر کەس ئاشنا نەبێ یان خوێنەرانی کورد هەمووی ئاشنا نەبێت، بەڵام کەمن ئەوانەی کە کاتێ ئەم شیعرانەی دەخوێننەوە، نەزانن ڕێبوار کێ یە.

ڕێبوار (مصلح شێخولئیسلامی) دەکرێت وەکو دەنگ

و ڕەنگی چەوساوەکان سەیری بکرێت؛ وەکو دەنگی کرێکاران و زەحمەتکێشان بناسرێت و تا ئێستاش بەوەفا ماوە لەسەر ئەو هەنگاو و ڕێبازانەی کە لە شیعرەکانیدا پیادەی کردون، ڕێبوار، سەرەڕای هەر پێنج کتێبی شیعری (گەشتی کوردستان) ( بۆ ئازادی) ( دەنگ هەڵبڕە) (چەند لاپەڕە...) (گۆرانیەکانی ترەیسی چاپمەن) کە هەرکامیان لەکات و ساتی جیاوازدا نوسراون؛ بەتیراژێکی کەم و خراپەوەو خراونەتەڕوو، و ڕەنگە بەدەستی خەڵکانێکی کەم گەیشتبێت؛ یان هەر نەیاندیبێت، بەهۆی بارودۆخی سیاسی لەزەمەنی بەعس وسانسۆری ئێراندا؛

بەڵام جیاواز لەوانە، دەیان شیعری تری لەرادیۆو گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، کەهەوڵماندا‌وە هەندێکیان لیرەدا چاپ بکەین و ئەوانەشی کەدەمێنێتەوە لەچاپەکانی دواییدا بەدەستتان بگات.

جیا لەوانە، ڕێبوار چەند بەرهەمی منالانی هەیە کە ئەوانیش لەدەرفەتێکی تردا دەخەینە بەردەست.

بەڵام لەئێستادا، پاش سالێک کارکردن بۆ کۆکردنەوەو سەر لەنوێ دارشتنەوەو چاپکردنەوەی لەگەل هاوکارەکانم، توانیمان زۆربەی شیعرەکانی کۆبکەینەوە لەدوو توێی دیوانی شیعری ڕێبوار (بۆ ئازادی) کۆیان بکەینەوەو چاپیان بکەین. ڕێبوار و شیعرەکانی، خوێنەرانی شیعرو مێژوو شاهیدی بۆ دەدەن کەپاراستن و مانەوەیان گرنگی شیعری و سیاسی... تایبەتی هەیە

بەم دیوانەی ڕێبوار، دەکریت خزمەتیکی گەورە بەشیعرو ڕێبوار، ئەدەبیاتی کارگەری و کرێکاران

زەحمەتکێشان بکەین، چونکە لەئێستادا دەتوانین ئەو رەنج و ماندوبووونەی سالآنی رابردووی رێبوار لەفەوتان رزگاربکەین تا (بۆ ئازادی) ببێتە دیوانێکی دەگمەن لەناو سەدان هەزار لەشیعرو دیوانی شیعری کتێبخای کوردی و ئەدەبیاتی کرێکاری

دیوانی (بۆ ئازادی) هەولێکی تری ئێمەیە بۆ بەدەستهێنانی گەنجینەیەکی گەورەی ون و کۆکردنەوەیان.

**ئەنوەر حسێن**

**سەرەتای** 2013

## ڕێبازی ئەم ڕێبوارە:

هونەر، هەتا بووە، بەرهەمی هەستی ئینسان بووە. ئینسان و سروشت، بووە تا بووە، دووبەری کێشەیەکی هەمیشەیی بوون. لەسەرەتای ژین و بوونماوە، لێک ئالآنی ئێمەو سروشت کاردانەوەی هەردوولای پێوە دیارە، ئەگەر سروشت، لەم کاردانەوەیەدا، زاڵ بووە، لێک-ئالآنەکە باسی زانستە؛ ئەگەر هەست، دەورێکی زاڵی هەبووە، لێک-ئالآنەکە چالاکی هونەرییە!

بەڵام، سروشتیترین زانست و تەکنیک، بێبەش نیە لە هەستی ئینسانی و هونەریترین بەرهەم و هەست نواندن، سەربەخۆ نیە لە سروشت؛ لەوەی پێی ئەڵێین زانست!

کەلتوور، فەلسەفەو ئایدیولۆجیا، لێک-هەڵپێکرانی چەندین چالاکی جۆراوجۆر بوون کە لێرەدا مەودا نیە لە هەمووی وردبینەوە. مەبەست لێرەدا، کەلتوور، هونەرەو شیعر؛ مەبەست بەرچاوخستنی ڕێبازێکی ئاڵترناتیوە کە من خۆم و چالآکی هونەری من، بە ڕێبواری ئەو ڕێبازە دەزانم.

لە نێو کۆنترین بەرهەمی هونەری ناسراودا، ئاماژە بەوێنەکێشانی نێو ئەشکەوتەکان دەکەین. دەیان هەزار ساڵ لەمەوپێش، ئینسانی ڕاوچی، وێنەی نێچیرەکانی کێشاوەتەوە، بەنیزەیەکەوە لەتەموودا، بەو خەیاڵەوە کە بتوانێ ئاسانتر ڕاویان بکا. شیعرو گۆرانی و هەڵپەڕکێی ئەو ئینسانانە نەماونەتەوە بەڵام، ئەگەر ئەو ژانرە هونەرییانە، لەنێو کۆمەڵانی ساکاری ئینسانی هاوچەرخدا ببینین، هونەری ئەوانیش، بەشێکە لە خەباتیان بۆ ژیانێکی

ئاسانترو پڕ دەسکەوتتر. دانس و ئاوازو وێنەگەری و خۆ-ڕازاندنەوەیان، بەشێکە لە تێگەیشتن و تەقەللایان بۆئەوەی باشتر ڕاو بکەن، یارگیری بکەن، منداڵ بەبار بێنن، یان بچنە شەڕی نەیارانیان.

لەو کاتەوەش کە کۆمەڵگەی ئینسانی، چینایەتی بووەتەوە، واتە لەم دەهەزار ساڵەی دواییدا، ئەم چالاکییانە، کەوتوونە بەر کاردانەوەی کارەساتی کێشەی چینایەتی! لە دووبەرەکی ئینسان وسروشتدا، بەری ئینسانی، خۆی، بووە بە دوو بەشە وە: دووچینی دژبەیەکی ئینسانی، لە بەرێکەوەو سروشت لە بەرێکی ترەوە، مە یدانی چالاکی زانستی، هونەری، کەلتوور، فەلسەفەو ئایدیولۆجیایان ئاڵۆزکردوە. مەبەست سەردەرهێنانە لەم ئاڵۆزییە؛ ئاڵۆزییەک کە لە مەیدانی هونەریشدا، هەمیشە، جێگای کێشەبووە.

**ئایا هونەر چینایەتییە؟**

هونەر، بەشێکە لە کەلتوور. کەلتوور، کە مانای ژینگەی دەستکردی ئینسانە، بەشێکی ماددی هەیە کە لەوانە: چلۆنایەتی کشتوکاڵ و بژێوی سەنعەتی و تەکنیکی و هەروەها ڕێگاوبان و شارستانیەتی، دەگرێتەوە؛ بەشێکی مەعنەویشی هەیە، کە تێگەیشتن و هەست و هەڵس وکەوتی ئینسانە لە پێوەندی خۆی و سروشت و لە چۆنیەتی ئەم ژینگە دەستکردەی خۆی. زانست و هونەرو فەلسەفەو ئایدۆلۆجیا، لە بەشی مەعنەوی کەلتووردا دەگونجێ. کەلتوور، بە گشتی لەژێر کاردانەوەی دوو-لایەنەی چینی دەسەڵاتدارو چینی ژێردەسەڵاتی کۆمەڵدایە. بەشی مەعنەوی کەلتوور

بە ئاشکراتریش هونەر، کە زیاتر مۆری هەست و هۆشی ئینسانی پێوەیە، تەنات بەشێوەیەکی روونتریش، دووبەرەکی چینایەتی کۆمەڵگە، دەنوێنێتەوە.

کەلتووری زاڵ لەکۆمەڵدا، کەلتووری چینی دەسەڵاتدارە. هەرچەند هەمیشەش هەستێکی ئینسانی بەرهەڵست، لە بەرهەم و لە چالاکی کۆمەڵانی خەڵکدا، رەنگی داوەتەوە. ئەمە، دایمە لەکێشەدا بووە لەگەڵ کەلتووری زاڵ و هونەری زاڵ. بۆ نموونە: هەڵپەڕکێی رەشبەڵەک، هەمیشە بەرانبەر تەوس و توانج و هەڕەشەی دەزگای ئایینی زاڵ، راوەستاوە. مۆسیقاو شیعرو هونەری خەڵکی کە بەفۆلکلۆر ناسراوە، گەلێک هەست نواندنی جوان و ئینسانی لێدەردەکەوێ کە دەشکەوێتە دژایەتی فەرهەنگی دەسەڵات.

لە هونەری کوردیدا، قانع، وەک شاعیرێکی ئاوارەو زۆر–لێکراو ناسراوە. لە نێو فارسی– بێژاندا، ناصر خسرو، روودەکی، زاکانی و گەلێکی تر؛ لە ئەدەبی عەرەبیشدا، ئەبولعەلای موعەرری و مظفر نواب و کەسانیتر... بەهەر زمانێکیتریش، ژمارەیەکی زۆر شاعیری بەرهەڵست و زۆرلێکراو ناسراون.

ئەو چینەش کە ئەمڕۆ دەسەڵاتدارە، لە سەدەکانی 16 و17و 18دا، پێشڕەو بووەو دژی چینی دەسەڵاتداری سەردەم، خەباتی کردووە. ئەم خەباتە، مەیدانی هونەریشی گرتوەتەوە. بۆ نموونە «بتهۆڤێن» کە شەیدای ئازادی بوو، بە مۆسیقا شۆڕشگێڕانەکەی، کومەڵگەی بەرەو ئازادی ئاژواندووە. سەمفۆنیای نۆهەمیشی ناوناوە «ئازادی» و پێشکەشی کردووە بە ناپۆلیون کە ئەوکات بە ئازادیخواز

و به ئاڵاهەڵگری شۆڕشی گەورەی فەرەنسا دەناسرا! شەکسپیر، کاتی خۆی، گەلێک شاکاری هونەری خوڵقاند کە هەست و بۆچوونی کۆمەڵانی خەڵکی پێشڕەو دەنوێنێتەوەو گەشەی پێدەدا. ئەمانە، گەلێک شوێنەواری بێهاوتای لە هونەرو کەلتووری ئینسانیدا، هێشتووەتەوە.

بە گوێرەی تێگەیشتنی من لە ماتریالیسمی مێژوویی،بەرهەم و چالاکی هونەری بەشەر، لە هەر شوێنێکی جیهاندا بووبێ، بە گوێرەی کەلتوورە ماددییەکەی، ئاڵوگۆڕی کردووە. ئەگەر هونەری دوو کۆمەڵگە، کە کەلتووری ماددییان وێکدەچێ، لەگەڵ یەک بەراوردکەین، گەلێک وێچوون وهاوبەشبوونی تیدا دەبینین کە نیشان دەدا، هونەر، هەروەها هەموو کەلتووری مەعنەوی، بەگوێرەی کەلتووری ماددی دادەڕژێ! هونەری پێش-سەرمایەداری بۆ نموونە، هەڵپەرکێی کوردی، گەلێک وێچوون و هاوبەشی هەیە لەگەل هەڵپەڕکێی، نەک هەر سریانی و ئەرمەنی و بەلووچی بەڵکو عەرەبی و رومانیاییش! بەیت وباو (داستان گێڕانەوە بە شیعری ریتم دار) لە نێو هەموو کۆمەڵگە پێش-سەرمایەدارییەکاندا وێک دەچن. هونەری سەردەمی سەرمایەداریش، لە هەموو جیهاندا لەشێوەی شیعر و نووسینەوە هەتا داستان و هەتا وێنەگەری و مۆسیقا و فیلم و پەیکەرتاشی، هەتا دانس و ئەو ژانرانەی هونەری پلاستیک دەگرێتەوە، گەلێک وێک دەچن. ئەوانە زیاتر وێک دەچن هەتا هونەری پێش سەرمایەداری و هونەری پاش سەرمایەداری هەمان کۆمەڵگە! بۆ نموونە لە کۆمەڵگەی کوردەواری بەیت و باوی کوردی زیاتر لە باڵادی ئینگلیزی پێش سەرمایەداری نزیکە تا لە شیعری قانع و

گۆران! گۆران، بە دیوانە ئینگلیزییەکەی «برۆنس»دا هەلدەڵێ و خۆی پێشڕەوی شیعری نوێی کوردی و نوێکەرەوەی گۆڕەپانی شیعری کوردیە با نەکەوینە داوی ماتریالیزمی میکانیکی چونکە دەزانین کە هونەرو مەعنەوییاتی کۆمەڵ، دەستبەجێ، بەشوێن ئاڵوگۆڕی کەلتووری ماددی کومەڵدا، وەرنەچەرخاوە و گەشەی کومەڵایەتی، گەلێک لەوە ئاڵۆزترە. لەولاشەوە، چینی دەسەڵاتداری کومەڵیش، بە یەکجاری نەیتوانیوە هەموو هونەرو زانست و کەلتووری مەعنەوی و ماددی کومەل کۆنترۆڵ بکاو ژەهری پاشکەوتووی بکاتە هەموو سیللولێکی لەشی کۆمەڵگاوە. بەبۆنەی بەرهەڵستبوونی هێزی پێشڕەوی سەربەچینی کرێکارو سەربە ئازادی و بەرابەری و بە هەزار بۆنەی دیکەشەوە، گەلێک چالاکی زانستی و هونەری وفەلسەفی و شتی وا، دێنە بەرهەم کە کۆنترۆلی بورژوازی کۆپەرست، دەپووچێنێتەوە. بۆیە، ئەم باسەی ئێمە، بە مەعنای «رەش و سپی کردنەوە»ی هەموو شتێک نیەو گەلێک سەرنجی وردتری پێویستە.

باسی فۆرم و ناوەرۆک و جوانیناسی، کاردانەوەی ئەوانە لەئاستی یەکتر کە بەگوێرەی روانگەی چینایەتی جۆراوجۆر، نوێ دەبێتەوە؛ خۆی هەورازێکی ترە کە بابەتەکە دەوڵەمەندتر دەکاتەوە بەڵام مەجالی گەورەتری پێویستە کە هەمووی داپوشێ. با وردبوونەوەی زیاتر، بهێڵینەوە بۆ مەجال و مەودای بەرینتر.

بەڵام لە بەرژەوەندی بورژوازیدا، حاشا دەکرێ لە چینایەتی بوونی هونەر! ئەو، کە هەتا بۆیکراوە، چینایەتی

بوونی کۆمەڵگایشی پشتگوێ خستوە، تیدەکۆشێ بێدەنگە بکا لەهەر راستییەک کە کێشەی چینایەتی بخاتە بەرچاو. دوازدە مانگەش، بە مێدیا، بەسینەما، بە ئایین، بە کەلتووری دەسەڵات-پارێزو دواکەوتوانە و چینایەتی خۆی، بڵاودەکاتەوە بەڵام کاتێک ئێمە دەنگی خۆمان هەڵدەبڕین و هەستی خۆمان دەنوێنین، هاواریان بەرزدەبێتەوە کە: «ئەوە هونەر نیە»؛ «ئەوە پروپاگاندای ئایدیولۆژیکە» و لەم قسانە! چما خۆیان، لە «هالیوود»ەوە هەتا «بالیوود»...، خەریکی پرۆپاگاندا نین و بۆ هێشتنەوەی دواکەوترین رەسم و یاسا و ئایین و قانون و شەریعەتی خۆیان، پرۆپاگاندا ناکەن!

بەڵێ؛ سەرەڕای هەر تێبینی و هەر وردبوونەوەیەک کە ئەم بابەتە چڕوپڕدەکاتەوە، هونەر و هەموو کەلتوور، بە ماددی و بە مەعنەوییەوە، چینایەتییە! روژی ئەمڕۆش کە کارگەر و سەرمایەدار، وەک دوو چینی سەرەکی کۆمەڵ، لە سەراسەری دنیادا، بەرانبەریەکتر راوەستاون، لەم مەیدانی کەلتووریشدا دژی یەکتر کار دەکەن و هونەر و کەلتووری بورژوایی و کارگەریش، سەرەرای هەر ئاڵۆزکاوییەک، زیاتر لە هەمیشە، چینایەتین و لە کێشەیەکی بەردەوامدان.

#### هونەری کارگەری؟

لەسەر ئەوەی ئەم هونەرە، نێوی چ بێ، کێشەم نیە. کەسێک پێی دەڵێ پێشڕەو کەسێک دەڵێ هونەری ئاڵترناتیڤ یا هونەری بەرهەڵست یا هەرچی... کێشەکە، لەسەر هونەرێکە و لەسەر کەلتوورێکە کە ڕێگا-خۆشکەری رزگاری ئینسانەو ژیانی گەش و ئازادو شاد بۆ هەموانی، لە ئاسۆیدایە! ئێمە لایەنگری

ئەمەین و بەرهەڵستی هونەرێکی رێگرو چەواشە-گەر دەبینەوە کە هەست وهۆش و چالاکی کومەڵانی خەڵک، ژار-خواردوو دەکات. ئێمە، بێ لایەن نین! خەم خۆری رێبازیکی تایبەتین و ئەمانەوێ هەست و چالاکیمان ئاوی هەرێز نەدیری! بۆیە، جێی خۆیەتی، ئەم ئامانجە روون بێتەوە تا هەر هەرزە-بێژیک یان هەر ئایین-پەرستێک، نەتوانێ «سینەزەنی» و نیوە-نووزەی عیرفانی، بکاتە بەرهەڵستی رزگاریمان...

بۆئەوەی باشتر بزانین ئەم هونەرە ئاڵترناتیڤە چییە، با لە پێشدا بزانین چی نیە!

هونەرو کەلتووری ئێمە هەر ئەوە نیە کە باسی کارگەر بکات! لەوانەیە بورژوازیش باسی کارگەر بێنێتە ئاراوە؛ بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی و بەکەلتووری پرتووکاوی خۆی، لەوانەیە بیهەوێ کارگەری گوێ-لە-مشت و ژنی کۆیلە، بکاتە ئیدۆلی کۆمەڵ. کەلتوورێک کە باسی دەرد و ژان و رێگای رزگاری بینیتە کایەوە، لەوانەیە، لەروانگەی بورژوازییەوە، رزگارییەکی نیوە و ناتەواو لەمەینەتێکی بچووک، بکاتە ئامانجمان یان هەر بە پێچەوانە، شەوارەمان بخا بۆ دنیایەکی پڕ لە کێشەو ناتەبایی ناسیۆنالیستی یان وەعدەی بە هەشتی پاشمەرگمان پێ بدات و بمانکاتە دەروێشی خۆی! بەشی زۆری گورانی و مۆسیقای میدیای بورژوازی، باسی کرووزانەوەی ژنە، بەدەست پیاو-سالارییەوە، ئەو هونەرە سەرکۆنەکراوە، رۆشناییەک بۆ رزگاری لە پیاوسالاری، نادا بەدەستەوەو کێشەکە لە مل ناکاتەوە.

کەلتووری ئێمە، بۆیە، بەرهەڵستی هەموو ئەفیونێکی هۆشبەر دەبێتەوە و ژیان، وەک تاقە مەودای خۆشی و

شادی دەبینی و خوشەویستییەکی بەرین دەخەملێنی. کەلتووری ئێمە، خۆی نابەستێتەوە بە ناموس-پەرستی و بەند و باری یاسای کۆنەوە. جوابی رەسم و ئایین و یاسای سەرمایەی کۆنەپەرست ناداتەوە و ئاواتی نزم و نەوی ناکاتە ئاسۆی جەماوەر...

هونەری ئێمە، هونەرو کەلتووری تا ئێستای ئینسان، وەک دەسکەوتێکی مێژوویی و چەند هەزار ساڵە، وەک دەسکەوتێکی بەنرخ، هەڵدەسەنگێنێ بەڵام کاتێک کە خۆی، شوێنەوارێکی نوێی هەیە؛ کاتێک ئاسۆی رزگاری یەکجاری ناسیوە، شوێنی کەلتووری کۆن ناکەوێ! گۆران و حافزی شیرازی و شەکسپێرو موزارت، بۆ کەلتووری ئیمە، گەنجینەی گەورە-گەورەن بەڵام ئێمە بەشێوەی خۆمان و بۆ ئامانجی خۆمان بەکاریان دێنێن! رەخنەگریشمان، هەمیشە بەردەوامە، نەک هەر لەوان، رەخنەی داهێنەرمان لەخۆشمان، بەردەوام دەبێ و هەوڵ دەدین کۆت و زنجیری کۆن و نوی، لە کەلتووری خۆمان و لە هونەری خۆمان داماڵین و رێگا بۆ گەشە-کردنی هونەر خۆشتربکەین.

کەلتووری ئێمە، بەهەردوو باڵی زانست و هونەر، دەفڕێ و بەرەو ئاسۆی رزگاری یەکجاری، بەرەو ئاسۆی ئازادی هەمووان، دەمان هەژێنێ. بویە، پێویستیمان بەروانگەیەکی زانستی و کۆمۆنیستی تیرو تەسەل هەیە! مەبەستم لەروانگەی کۆمۆنیستی، دینامیسمیکی پێشرەوە، هی کارگەری وشیار و ئینسانی داهێنەر کە بەهیچ شتێک کەمتر لەرزگاری یەکجاری لە هەرچی ستەم و چەوساندنەوەیە، رازی نابێ.

ئەم کەلتوورە، لەبارێکەوە، بەقەد مێژوو کۆنە، چونکە میراتگری ئینسانی تێکۆشەری پێشرەوە لە درێژایی مێژوودا؛

میراتگری شادی وهەڵپەڕکێ و هەست نواندنی ئینسانییە، لەسەرەتای ژینیەوە. هەر هونەرێکی پێشڕەو و بەرهەڵست، لە هەر وەرچەرخانێکی مێژووییدا، هەتا هەست-بزوێنترین سیمفۆنیاکان و تەنانەت شەپۆلی ئەم ئاخرانەی موزیک و هونەر، لە دژی کۆیلەتی و مەینەت و لە ستایشی شادیدا... هەموو، میراتی ئێمەن. گەرچی ئێمە، لەو چوارچێوانەشدا نامێنینەوەو بۆ ستایشی شادیش، هەموو سنوورێکی کۆمەڵگەی چینایەتی دەبەزێنین.

لەبارێکی دیکەوە، ئەم کەلتوورە، تازەیە! واتە چەند سەدەیەک زیاتر نیە کە شێواز و شکڵی دەرکەوتووە! ئەم تەعبیرە لە هونەر، بەعومرتر نیە لە خەباتی وشیارانەی چینی کرێکارو لە زانستی ماتریالیسمی مێژوویی و لە تێبینی ئێمە لەسەر هونەر؛ بۆیە، من لەگەڵ ئەوانەم کە بەم کەلتوورە دەڵێین کارگەری. کەلتوورێک کە بە دووباڵی هەستی بێ سنوورو زانستی کۆمۆنیستی ئەو چینە کۆمەڵایەتیە دەفرێت. واتە، ئەم کەلتوورە، لەباری راستەقینەوە، هەر لەسەرەتای مێژووی ئینسانییەوە، خەریکی بنج بەستن بووە بەڵام، لەم دووسەدەی دواییدا وشیارانەتر گەشەی کردووە!

کەسانی وەک «هاینریش هاینە»، «ماکسیم گۆرکی»، «برتولد برشت»، «ئاراگون»، «جەوهیل» و «ناظم حکمت»... چەند ئەستێرەیەکی ئەم ئاسمانەن؛ ئیتر با، شەکسپیەر وحافز و هەزاران دوندی فەرهەنگی بەشەریش، بەمیراتی ئینسانی، پێش هاتنەمەیدانی وشیارانەی چینی کرێکار، دابنین!

ئەم هونەرە، دیارە، رێگریشی هەیە. یەکەم بەرهەڵستمان چینی ستەمگەر بووە کە لەسەراسەری مێژوودا خەڵکی

بەشەوارە خستووە. ئەم چینە ستەمگەرە، لەم چەند سەدەی دواییدا، لە پەیکەری سەرمایەداریدا خۆی دەنوێنێ و دەیناسین کە دەمێکە، ئیتر، ڕێگری ئازادی ئینسانە و دەسەڵات و میدیا و سامانی کۆمەڵگەی بە دەستە و دەتوانێ هونەری چەواشە بڕازێنێتەوەو بەچەق و لووری دژبە ژن و دژ بە ئازادی و بەرابەری، کۆمەڵانی خەڵک بەشەوارە بخا. بۆیە، ڕێبازی ئێمە پێویستە میلیتانت بێ و بچیتەوە بەگژ نەریت و کەلتووری بورژواییدا؛ کەلتوورێک کە ئێستا خەریکی زیندووکردنەوەی پرتووکاوترین داب ونەریتی چینە کۆنترەکانیشە و هیچ نیشایەک لە ئازادی و ئازادیخوازی سەدەکانی پێشووی پێوە نەماوە، نابی بتوانێ چیدی ڕێگرو ڕێ-ون-کەر بێ!

کاتێک ئەڵێین کەلتووری کارگەری، مەبەستمان ئەم کەلتوورە ئالترناتیڤەیە کە بەشیکە لە خەباتی مێژوویی چینی کرێکار بۆ رزگاری هەموان. بۆیە، جێگای خۆیەتی کە هونەر لەم روانگەیەوە سەیربکرێ و بەم پێوانەیە، رەخنەی لێ بگیری.

دیارە، ئەوەی رەخنە دەگرێ، لەوانەیە، لەگەل ئەم بە رژەوەند و بوچوونە نەبێ و هەر بە شێوەی کۆن، تاوانبارمان بکا! ئازادی رادەربرین، دیارە، بۆ هەموانەو بۆ ئەوانەش هەیە. ئێمەش تێدەکۆشین، لە مەجالی خۆیدا، بەرهەڵستی ببینەوە. لێرەدا، بەڵام، رووی ووشە لە هاودەرد و هاوشادی و هاوبوچوونە، کە بەرەخنەی داهێنەر، ڕێگای بەرەوپیشی کەلتوورو هونەری کارگەری خۆشبکەین.

**مصلح ڕێبوار**

**هاوینی 2012**

# ڕێبواری شاعیر،
# «ئوژێن پۆتیە»ی کوردە

کاتێک وازم لە (یەکێتی نیشتمانی کودستان)هێنا، ئیتر، لە (1981/7/9) دا کە ڕۆژی شەهید بوونی (بورهان مستەفا) ناسراو بە (شەهید فەرهاد) بوو بۆ هەتا هەتایە دەسبەرداری (یەکێتی) بووم و وازم لە پێشمەرگایەتی کردن هێنا و هەر وەک (قیادە واحیدە)یەک تا ڕاپەڕینی (1991) مامەوە و دوای ئەوە گەڕامەوە وڵات.

سەرەتای وازهێنانم ڕووم کردە (بۆکان)ی بووکە نازدارەکەی موکریان و شاری (حەسەن زیرەک)ی ئەمرو (سوارەی ئێلخانی)و بۆ ماوەیەک بە ناوی میوانی (کۆمەڵەی زەحمەتکێشان)ەوە، لەوێ مامەوە. لەو کاتەدا (بۆکان) وەک شارێکی ئازاد و دوورە دەستی (کۆماری ئیسلامی) بوو هەرچی ئۆپۆزسیۆنی ئێران هەبوو بە چاک و خراپەوە لەوێدا مۆڵدڕابوون. (بۆکان) لەو کاتەدا وەک شاری (ئەسینای کۆنی یۆنانی)ئەهاتە بەرچاوم پڕ بوو لە قسە و باس و دواندنی جەماوەری بە کۆمەڵ، هەر دوانیوەڕوانی لێ ئەهات سەر جادەکان پڕ ئەبوون لە خەڵک و هەموو بۆ یەکتر ئەدوان، کەس دڵی کەسی ئەیەشان، کەس پۆزی بەسەر کەسدا لێ نەئەدا، هەموو بۆ یەکتر قسە و باسیان ئەکرد، من شتی وەهام هەر لە کتێبدا، لە بارەی (ئەسینای ڕۆژگاری سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ و شتی واوە) خوێندبووە وە بەڵام لە (بۆکان) دا، بە چاوی خۆم ئەوەم دی.

لە ڕووی دەسەڵاتەوە، کەس حوکمی (بۆکان)ی نەئەکرد بەڵکو شارێکی سەربەخۆ بوو بە بێ هیچ دەسەڵاتێک ئەڕۆیشت بەڕێوە ، تەنها شێوە دەسەڵاتێک کە تیایدا بێت ئەوە بوو نەخۆشخانەکەی (کۆمەڵە) بەڕێوەی ئەبرد و دایرەی (ئاوو کارەبا) کەشی (حیزبی دیموکرات) سەرپەرشتی ئەکرد، دیارە ئەو دوو شتەش بۆ خەڵکی بە خۆڕایی بوو. ئەوەی لە (بۆکان) دا باو بوو (هات هاتی ئەرتەشی ئێران) بوو بۆ گرتنەوەی ئەو شارە، هەموو شەوێک خەڵکی لە شیرین خەو ئەکرد بە بیانووی ئەوەی (ئەمشە و ئەرتەش) هێرش دێنێ ئاگادار بە.... لەو کاتەدا من زۆر خەڵکی جۆراو جۆری (چەپ) و خەڵکی ترم ناسی و ئاشناییم لەگەڵ بیرو بۆچوونی سەیر سەیردا پەیدا کرد، هەر بیرو بیرکردوەی (چەپا) نزیکەی (سەد) جۆر بیر و بۆچوونی تیا بوو، بەڕاستی لام دنیایەکی سەیر بوو، کە بیرم لە خەڵکانی لای خۆمان ئەکردەوە پێکەنینم بە ئەقڵ و ئەقڵیەتی لای خۆمان ئەهات لە بەرامبەر ئەوەدا چەند نەزان و بێ ئەگا و نەشارەزا بووین و خۆشمان بە شت ئەزانی و وامان ئەزانی لەوسەری شتەکان هاتووینەتەوە و کەس ئەوەندەی ئێمە خوێنەواری نییە، کەچی لەچاو ئەواندا ئێمە سفری پشتی فاریزە بووین وهێشتا لە زۆر شت نەگەیشتبووین و نەمانزانی بوو دنیا ئەوەندە قووڵ و بەرین و بێ بڕانەوەیە. بەهۆی میوانداریەکەم لە لای (کۆمەڵە) یەکێک لەو کەسانەی لای خودی (کۆمەڵە) ناسیاویم لەگەڵدا پەیدا کرد، برای شاعیر (موسڵیح شێخول ئیسلامی) ناسراو بە (ڕێبوار) بوو.

ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو ئەوە بوو برادەرانی (کۆمەڵە)ش بە گشتی وەک خەڵکانی لای ئێمە وابوون، ئەوانیش لە زانین و شارەزایی لە شتەکاندا ئەوەندە پڕ و تێر نەبوون لە چاو خەڵکانی دەور و پشتی خۆیان ، زۆرتر ئەیان ویست لە ڕێگەی دەسەڵاتێکەوە کە (خوا پێیدا بوون) سواری ملی شتەکان بن نەک لە ڕێی زانین و تێگەشتنەوە هەر ئەوەش وای لێکردن لە دواجاردا کەوتنە بن گۆمی (ئیتحادی موبارزین)ەوە و لێی نەهاتنە دەرەوە و تیایدا بخنکێن. (ڕێبوار)یش هەروا بوو دڵسۆزێک بوو بە (کۆمەڵە)، زۆر شارەزایی و ئاگایی لە شیعر و هونەری شیعری هونەری و ڕۆشنبیریی شیعرو نەبوو ... زۆر جار لایەنگر بوونی ئەو بەرامبەر بە سیاسەت و چالاکی پێشمەرگایەتی ڕۆژای (کۆمەڵە) وای لە من ئەکرد پێی ناکۆک بم و دەمەقاڵێ بکەوێتە نێوانماوە و بیکەینە هەرا. من ئێستا دانی پیا ئەنێم کە میوانێکی دڵڕەق و سەیر بووم، شتێکم کردووە و شتێکم وتووە کە جێی خۆی نەبووە و نەئەبووایە وا بوومایە و میوانی بەو جۆرەش شتێکی عەیبەیە. چونکە ئەو وەک شاعیرێکی سەر بە ڕێکخراوێکی سیاسی ناو گۆڕەپانی خەبات و پێشمەرگایەتی بوو، ئەو لەو ڕۆژ و ڕۆژگارەدا لەسەر هەق بوو بەو جۆرە بێت و بەو جۆرەش بیر بکاتەوە، لەبەر ئەوەی (کۆمەڵە) ڕێکخراوێکی سیاسی ساوا و کەم دەرامەت و کەم ئیمکانیات بوو، هەموو سەرچاوەی بژێوی و گوزەرانی ئەو ڕێکخراوەیە جەماوەرێکی ڕەش و رووتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، تەنات لە ڕووی توانای

ڕاگەیاندنیشەوە هیچ شتێکی نەبوو، تەنها (خەبەرنامە)یەکی قەوارە بچووکی چەند پەڕەیی هەبوو کەوا بزانم مانگانە بوو، کاتێک ئەو (خەبەرنامە)یە دەرئەچوو وەک نانی برسی دەستاو دەستی پێ ئەکرا. ئیتر وەک حیزبە بورژوازیەکان ( بۆ نمونە دیموکرات و یەکێتی و شتی وا)  ئیستگە و گۆڤار و ڕۆژنامە و دامودەزگای بڵاو کردنەوەیان شک نەئەبرد. ئەوان وەک حیزبێکی خاوەن جەماوەر و خاوەن ڕێکخستن و خاوەن پێشمەرگە هەر ئەو (خەبەرنامە)یە ئایە و مایەیان بوو. (ڕێبوار) لەو کاتەدا بۆ (کۆمەڵە) کەی و بۆ جەماوەرەکەی لە مینبەری شیعرەوە باسی لە شەهیدەکان و لە چالاکییە سیاسی و پێشمەرگایەتییەکان ئەکرد و نەمری ئەکردن.... بەو هۆیەوە (ڕێبوار) بووە خاوەنی کۆمەڵێک شیعری جوان و پڕ بە پێستی واقیعی ژیانی کوردەواری و ئەو شیعرانەش کرانە سروود و بوونە خۆراکی ڕۆحی ڕۆژانەی خەڵکی کورد، من خۆم هەتا ئێستاش زۆریانم بەلاوە جوان و ناسک و خەم ڕەوێنە و هەر کاتێک وەک سروود ئەدەن بە گوێما خۆشحاڵم ئەکەن و ڕۆحم پاراو ئەکەن  چەند جوانە کە ئەڵێ:

فوئاد، ڕۆڵەی ئاگر و خوێن
تۆوی شۆڕش لە هەموو شوێن
وەستا شێرانە بەرامبەر
بەلامارەدر چەشنی سەنگەر
گیڤارای کوردەواری بوو
لە هەموو شوێن دیاری بوو

دەمێ یەکیەتی جووتیاران
دەمێ کۆڕی زەحمەتکێشان
دەمێ سەنگەر دەمێ مەزرا
کۆڵ هەڵگرتن لەگەڵ فەلا

هەروەها لە شیعری (کاک شوانی قارەمان) دا ئەڵێ

شەو نەبوو تەقەی تفەنگ
نەسمێ جەرگی شەوە زەنگ
خەڵکی نەڕژێنە کۆڵان
بەرەو پیری کاك شوان
سروودێك لەسەر لێوان
«بەخەیر بیتەو بۆ لامان»
کاك شوانی قارەمان

بەڵام جوانترین شیعر بەلای منەوە شیعری (بڕیاری یەکی ئەیار)ە کە ئەڵێ

کرێکارم
هاتوومە مەیدان
ئەڵێم: هەر کارە ئینسانی خوڵقان
سەد ساڵە ئەڵێم
ئەمە بڕیارە
بڕیاری ڕۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەککگرن
چەرخی چارەنووس لە دەس خۆ گرن

بەو جۆرە، (ڕێبوار) ئەو ڕۆژگارە سەختانەی بەو شیعرە بەهاداڕانە پڕ ئەکردەوەو هانی جەماوەری زەحمەتکێش و پێشمەرگەی کوردستانی ئەدا بۆ بەرگری و کۆڵنەدان، لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەک ئەو دەنگی شیعری هەڵ ئەبڕی و جەماوەری دڵخۆش و پڕ ئومێد ئەکرد

لە ڕاستی دا شیعر خۆی، هەر لەسەرەتاوە، بۆ ئەوە لە دایک بووە کە شتێک بڵێ و خەمێک بڕەوێنێتەوە؛ بە بڕوای من ئەمە حەقیقەتی شیعر بووە کاتێک خەڵکی دەروون نەخۆش هاتوون بۆ ئەوەی پێچەوانەی بکەوە و بە نەخۆشیەکانی خۆیان ناخۆشی بکەن، ئەگینا حەقیقەتی شیعر لە سەرەتاوە بۆ ئەوە بووە شتێک دەربڕێت و خەمێک بەبا بدات و مرۆڤ بە ئاگا بێنێتەوە و گەشاوەیەک بە ڕۆحی بدات.

(ڕێبوار)یش لەو ڕۆژگارەدا کە سەنگەر شایەتی مانەوەی مرۆڤ بوو دژی داگیرکەران هەروەها کاری لەگەڵ شیعردا ئەکرد و بۆ ئەوەش شیعری ئەوت و ئەنووسی، کە بووشن بە سروود کوردستانیان پڕ کرد لە هەراو، گووڕیان بە تێکۆشانی خەڵکی کورد ئەدا ، ئەمە حەقیقەتی (ڕێبوار) بوو کە من دیم. سروودەکانی ((کاک فوئاد ، کاک شوانی قارەمان ، مام ڕەحمان ، ئاسۆی سۆسیالیزم ، سڵاو لە پێشمەرگە، پێشمەرگەی کۆمەڵە، زەحمەتکێشان چەکدار بن ، حیزبی خەباتکار ، بڕیاری یەکی ئەیار ، ژنانی تێکۆشەر.... هتد)) بوو بڕبڕەی پشتی شۆڕش و سەنگەری تێکۆشانیان پڕ ئەکرد لە خۆشی و ڕاپەڕین. کاتێک (ڕێبوار) لەو ڕۆژ و مەیدانەدا بوو ، کەسی تر سێبەریشی لەو ناوە نەبوو،

هەرچەند دواتر هەندێک (فس فس پاڵەوان) کە جادەکەی تەخت بوو، پەیدا بوون و کەوتنە تەپوتۆز کردن، وا باس لە خۆیان ئەکەن کە (ڕێبوار) لە چاو ئەواندا هەر هیچ نی یە، بەڵام من وەک شایەتحاڵێکی ئەو ڕۆژگارە سەختانە، ئەو خەڵکە سەیرێ بە ئاگا ئەهێنمەوە کە ئەیانەوێ لە بەرزیەتی (ڕێبوار) کەم کەنەوە ، بە دڵنیایی یەوە پێیان ئەڵێم (ڕێبوار) شاعیری بەرگری و شۆڕش و پێشمەرگایەتی بوو بۆ ئەوە نەهاتبووە ناو شۆڕشەوە تا (کۆمەڵە) بکاتە پرد و خۆی پێ بگەیەنێتە ئەوروپا بەڵکو ئەو لەسەرەتاوە زادەی ناو شۆڕش خۆی بوو، کاری بۆ سەرکەوتنی شۆڕش ئەکرد، سەرکەوتنی (کۆمەڵە)ی بەلاوە هەموو شت بوو، تا مرۆڤیش مابێت ناتوانێت لەوە جوانتر بنووسێت وە ک (ڕێبوار) نووسینی و کردنی بە دیاری بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی و مرۆڤی کورد بە تایبەتی. ئەو کاتانەش کە من بە ڕووی (ڕێبوار)ی شاعیردا هەڵشاخاومەتەوە بۆ ئەوە نەبوو بڵێم تۆ شاعیر نیت و شیعر مەنووسە بەڵکو بۆ ئەوە بووە هانی بدەم شیعری جوانتر و بەهادارتر بنووسێت و هەروەهاشی کرد کە من ویستم، بۆیە بەلای منەوە، ئەگەر (ڕێبوار) لە (ئۆژین پۆتیە) باڵا دەستی نەبوو بێت ئەوا بە دڵنیایی یەوە ئەڵێم ئەو زۆر بە ئاسانی ئەتوانێ (ئوژین پۆتیە)ی کورد بێت و تۆوی شۆڕش بێت بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و دژی چەوسانەوە و داگیرکەر دەنگ هەڵبڕێت. ئەمانەی وتوومن نەستایشە و نەپیا-هەڵدانە و نەبەقەبارە کردنی ئەوە بەڵکو ئەوە هەقێکی ئاسایی شیعر و شاعیری خودی (ڕێبوار)ە و من بە شانازیەوە باسی لێوە ئەکەم و





پەنجەی لەسەر دا ئەنێم، ئەوەی بەو ڕاستی یە ڕازی نی یە چۆن ئەیەوێ سەری خۆی لەبەرد بدا با غیرەت بە خۆی بدات و سەری بەردێک بشکێنێ. لە دواجاردا ئەڵێم ئەمە جوانترین پەیڤی شاعیرانەیە کە مرۆڤ توانیویەتی بیچڕێت و بڵێت

پونگی خوارد مونجی دەریای کرێکار
دژی سەرمایە ئەوەڵی ئەیار
سوور بوو بە خوێنمان شەقامی شاران
شەقی برد قەڵای سەرمایەداران
زنجیری کۆنی هەزاران ساڵە
دەپچڕێ و جادوو حوکمی بەتاڵە
کرێکارم هاتوومە مەیدان
ئەڵێم : هەر کارە ئینسانی خوڵقان

**حسێن بەفرین**

**2012**

# ڕێبوار: شیعری کوردی ئاوێنەیەکە لەکۆمەڵی کوردی

## ڕێبوار، شاعیری هەمووان

موسڵیح شێخ ئەلئیسلامی "ڕێبوار"، شاعیری خۆشناو و ناسراوی خۆرهەڵاتی کوردستان و چەوساوەکان، بۆ بەشێکی زۆر لە ڕووناکبیرانی کوردستانی ئێران و کوردستانی عیراقیش ناسراوە، سەردەمانێک لەشاخ، شیعری بۆ ژن و پێشمەرگەو خەباتی هەقخوازانەو هیومانیستی دەنووسی و بەشێکی زۆر لەشیعر و ئەدەبیاتی ئەو ڕەنج و ئازارو مەینەتی ئینسان و ژنی کوردی لەناو شیعرەکانیدا خستوەتەڕوو

ریبوار یەکێک بوو لەوانەی زوو دەستیدایە شیعرو توانی لەسەر ئاستی کوردستان ببێتە شاعیرێکی ناسراو و خاوەنی (5) دیوانی شیعریە بەناوەکانی "گەشتێ لە کوردستان" و "دەنگ هەڵبڕە" و "سرودی سلاوی ئازادی" چەند لاپەڕە لە دەفتەری رۆژام» «گۆرانیەکانی ترەیسی چاپمەن» لەسالانی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی رابردوودا چاپو بلاوکراونتەوە

ئەو خاوەنی شیعرەکانی "ئەنتەرناسیۆنال" یەکی ئەیار "لەسەر ئارێزەوە"، "کاک فوئاد" "کاک شوان"ە.

ڕێبوار ئەگەرچی ماوەی چەند ساڵە لەشیعر دورکەوتووەتەوە، بەڵام هەمیشە شیعرەکانی لەسەر زاری خەڵکی خۆرهەڵاتی کوردستان و بزوتنەوەی حەقخوازانەکانی خەڵکدا لە بەرچاوە

کەس نییە گوێی لەم شیعرە نەبووبێ کە بۆ پێشمەرگە نوسراوەو یەکێکە لە شیعرەکانی ڕێبوار:

سڵاوی گەرمی دڵی پڕ هومێدی مەت پێشکەش
پڵنگی هەردی وڵات ئەی هەڤاڵی پێشمەرگە

یان شیعری وەڵامی نامەکەی «روناک» کە باس لەڕەنج و ئازاری ژنێکی پێشمەرگە دەکات و دەڵێ:

خۆزگە شنەی بای بەیانی
بۆنێکی تۆی ئەهێنا بۆم

ئەو بەتەنها لەگەل پێشمەرگە و ژن نەوەستاوە، بگرە دەیان شیعری بۆ رەنجی ئینسان نوسیوەو رەنگە شیعری «لەم بازاڕە بێ رەحمەدا» بەناوبانگترین شیعرەکانی ئەو بێ، کە دەڵێ:

من ئەو کەسەم
هەموو رۆژێك
ژیانی ئەمرۆم دەفرۆشم
بۆ کڕینی نانی سبەی
لێم ناکڕێ خاوەنی نان
لێم ناکڕێ

لەم دیدارەدا ڕێبوار باس لە ڕابردووی ژیان و شیعرەکانی و هەڵوێستی مارکسیستانەی ئەو و ڕەنگدانەوەی لەسەر شیعرەکانی و پێناسی و تێگەیشتنی ئەو لەسەر شیعرو زۆر بابەتی تر دەکات

ڕێبوار چون ئینسانێکی عەدالەتخوازو یەکسانیخوازو داکۆکیکاری سەرسەرختی هەژارانە، هەر بەمشێوەیەش ڕەنگداوەی لەسەر شیعرەکانی هەیەو خوێنەر دەتوانێ بەئاسانی هەست بەو کارەبکات ئەم بۆچوونانەی یەکێکە لەو دیدارە تازانەی کە لەگەڵ شاعیردا سازکراوە کە دەمێکە هیچ بۆچوونێکی وەهای دەرنەبڕیوە بۆیە بە پێویستمان زانی لەگەڵ دیوانە ناوازەکەی کە یەکەم جارە لە ئەدەبیات و کتێبخای کوردیدا هەموو شیعرەکانی کۆدەکرێنەوە و دەخرێنەروو و بڵاوبکرێنەوە.

*** با لە زمانی خۆتەوە، ناوی خۆت و تەمەن و ژیانی هاوسەری و بارودۆخی خێزانی و خوێندن و شوێنی دانیشتنت بزانم؟**

- ساڵی (1947)، (1326ی ئێرانی) لە مەریوان، چاوم بەژین پشکووت؛ سەرەتای 1960ەکان (بە ئێرانی: 1340ەکان)، بۆ درێژەدان بە خوێندن چوومە تاران و 8 ساڵێک لەوێ بووم تا خوێندەواری باڵای ئابوریم لە زانکۆی تاران تەواوکرد: (1970)، (1349) لەسەردەمی منداڵی و لاویمەوە، هۆگری خوێندنەوەی کۆمەڵایەتی و هونەری، بەتایبەت شیعر و ئەدەب بووم و یەکەم ئەزموونی شیعریم، بەکوردی و بە فارسی، هی سەردەمی تازە-

لاویمە. هەر لەو کاتانەوە، ئۆگری شیعروئەدەبی کوردی و فارسی و هەندێکیش عەربی بووم. قانع، هاو-تەمەن و هاوڕێی سەردەمی لاوی بابم بوو. شیعری ئەوم، نەک هەر لەماڵەوە، لە بابم و لەدایکم و براو خوشکم ئەبیست، لە دەرەوەش لەسەر زاران بوو.

بەڵام لە تاران و لە نێو کۆڕ و کۆمەڵی خویندکاران و هاوکات، کۆڕی ئەدەب دۆست و ئێوارە-کۆڕی شیعرییەوە کە ئەوکات لە گەشە بوون و کەسانی وەکو «شاملوو» دەیانبرد بەڕێوە، زیاتر سەودای شیعر کەوتەسەرم؛ بەتایبەت کە برام، کاک چاوە، هەم خۆی شاعیر بوو هەم لەگەل کەسانی وەک «سوارە» و «هاوار»یش هاوڕێ بوون. ئەو سەردەمەبوو کە «گۆران»یش بە-پەیکەر، خامۆش بوو! بەوەش زیاتر هەستم بە «گۆران» کرد و شیعری نوێی کوردی، زیاتر، کەوتە پێش چاوم و شانم دایە ژێری و... بەدڵ دەستم دایە شیعر...

لەهەڵسوڕانی سیاسیشدا لەشانی چەپی بزووتنەوەی خوێندکاریدابووم. ئەو کات سەردەمی پێکهاتنی ڕێکخراوەکان و سەرنجی ڕەخنەگرانەبوو لەقوتابخانە سیاسییەکان. لەگەل کۆمەڵێک لەهاوڕێیان، ڕێکخراوێکمان پێکهێنا کە دوایی بە «کۆمەڵە» ناوی دەرکرد. مەبەستمان و ئاسۆمان، دامەرزاندنی حزبێکی کۆمۆنیستی سەرانسەری بوو لە ئێران. ئێمە، ئەوکات، خۆمان لەڕێکخراوەکانی ئەو سەردەمە (تودەو چریک و موجاهید و دیموکرات و...) بەجیاواز دەزانی و ڕێبازێکی کۆمۆنیستی ڕاستەقینەمان

لەبەر چاوبوو، هەرچەند ناسیۆنالیسم، هێشتا، دەستبەردارمان نەببوو...

شیعری «گەشتێ لەکوردستان» و هەندێک داستانی کورتم، لەوانە: «شیعری دارێنە» کە بەسەرهاتی «سمایلی شەریفزادەیە» لە ئاخرین ڕۆژەکانی ژیانیدا، ئەو کات بەدەستنووس بڵاودەبوونەوە. سمایل، دۆستی نزیکم بوو؛ هاو-ژوورم بوو لە تاران؛ پێش ئەوەی، نەورۆزی (1343)، 1964، بچیتەوە بۆ مهاباد و لەوێوە، لەبەر «ساواک» هەڵێ بەرەو کوردستانی ئەودیو و ئیتر نەیبینمەوە...

بەو بۆنانەوە چەند مانگێکیش، بەهار و هاوینی (1970)، ڕێگام کەوتە بەندیخانەی «قزل قەلعە» لەتاران.

لە 70کاندا، وەک کار-ناسی ئابووری، لە «بەرنامەو بودجە»ی شاری سنە ماوەیەک ئیشم کرد. هاوڕێ و هاوسەرم «فەوزیە» لە و کاتەوە بووە شەریکی خەبات و ژیانم؛ هاوکات درێژەمان بەهەڵسوڕانی هونەری و سیاسی نهێنی داو لەشۆڕشەکەی سالی (1979)دا، لە ئێران، چالاکیمان نواند. ڤیدیۆی دیکلەمەو وتاری ئاژیتاسیۆنیم، ئەوکات، کەوتە بی بی سی...

کەمیک دواترو کاتی شوڕشی کوردستان، ئێمە درێژەمان بە خەباتی کۆمۆنیستی خۆمان داو لەو سەردەمەدا یەکەمین سروودەکان هاتنە بەرهەم. لە (1980)کاندا، «سرودی سلاوی ئازادی» و «دەنگ هەڵبڕە» و «چەندە لاپەڕەیەک لەدەفتەری بەرباخەڵ» و کۆمەڵێک داستانی کورت، بە کوردی و بە فارسی و هەندێک وەرگێڕان بۆ کوردی و بۆ فارسی، لەوانە چەپکێک لە گۆرانییەکانی «ترەیسی

چاپمەن»، لەپاڵ خەباتی چڕوپڕ لەکۆمەڵەی شاخداو لەپال نووسینی شیعر و داستانی کورت (ئاسۆی شۆڕش) بۆ رادیۆ و رۆژنامەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵەدا، چەند مەیدانێکی بابەت و بەرهەمن کە شایانی باسن.

«کانوونی هونەری کرێکاری» ئەودەم دەستمان پێکرد و گۆڤاری «پیشەنگ» بەرهەمەکان و ڕاوبۆچوونەکانی بڵاو دەکردەوە. وەک باسم کرد، ناسیۆنالیسم و هونەری لەو چەشنە، هەر لە پاشکۆوە دژەی ئەکرد؛ بۆیە، من دەنگی ڕەخنەم بەرز کردەوەو و ڕێگای خۆم، لەو کانوونە، جیا کردەوە.

کۆتایی (1980)کان و بە هێرشی ئیمپریالیستی ئەمەریکا کە بووە هۆی بووژانەوەی زیاتری کۆنەپەرستی لەناوچەدا، ریگای خەبات، لەوێ، تەنگەبەر بووەوە لە ئێمە و سەرەنجام، ساڵی (1991) وەک پەنابەر، هاتمە سوید. ئێستاش لە سوید درێژە بەژیان و بە چالاکییەکانم دەدەم.

ئەوەی بۆ ئەدەب و هونەر دەگەڕێتەوە، درێژە–دانمە بە شیعر و ڕەخنە و بڵاوکردنەوەیان لە سایت و ماڵپەڕی خۆم: (www.rebwar.nu)، هەروەها بەشداریکردنم لە گفتوگۆ و دیکلەمەی شیعرەکان و هاوکاریم لەگەل گۆڤاری "هانا" و چاپێکی تازەی "دەفتەری رۆژانەم»؛ ساڵی (2013)ش چاپێکی سەرجەمی کۆکراوەی شیعرەکانم بەناوی «بۆ ئازادی»؛ هەرچەند هەندێک لە شیعرەکانم لەو کاروانەش بەجێمان و ئەوانەی پاش ئەوەش خولقاون، هێشتا، بڵاو نەبوونەتەوە! بەتەمام لەچاپی دووهەمی «بۆ ئازادی»دا

ئەوانەش بهێنم. هەندێک تەجرەبەشم هەن بە ئینگلیزی و بەسویدی کە هەر لەسەر ماڵپەڕەکەم داناون...

لەبارەی بەڕێوە-چوونی ژیان و ئیشکردن، وەک مامۆستای ماتماتیک و زانست لە قوتابخاکانی سوید، کارم کردوە و بۆ ئەو مەبەستەش، هەر لە 90ەکاندا، لەزانکۆکانی سوید، خوێندنی تەکمیلی پێویستم خوێند. لەو کاتانەوە، لەگەل هاوسەرم «فەوزیە»، کە ئەویش هەر خەریکی هەمان ئیشە، لەشاری یوتۆبۆری سوید ئەژیم. سێ منداڵمان هەیە کە هەریەکەیان لەماڵی خۆیاندان...

*** شیعر دەشێ چی بەتۆ بەخشیبێت؟**

– هەستی هەبوون لەگەڵ جەماوەر؛ لەگەڵ خوێنەرو گوێگر! هەستی هەبوون وەک بەشێک لە بەشەرییەتی وشیارو ئازادیخواز

*** شیعری کوردیی سەردەم، زیاتر، کاریگەریی لەشیعری جیهانیی وەرگرتووە شیعر چۆن دەتوانێ تەعبیر بێ لەعیشق و خۆشەویستی، لە ژانی مرۆڤ ، ژنان، منداڵان، تا هەموو کەس شیعر بەهی خۆی بزانێت؟**

– ئەمەش خۆی کۆمەڵە-پرسیارێکە. شیعر، وەک ژانرێکی هونەری، خۆی شێوەیەکە لە ناسینی جیهان بەهۆی هەستەوە. لەم جیهانەشدا، عیشق، خۆشەویستی بۆ مرۆڤ (کە دیارە منداڵانیش دەگرێتەوە) بەهۆی هەستی شاعیرانەوە، بە وشەو بە مۆسیقای وشە، وێنەیەکیان لێدەخولقێ کە پێیدەڵێین شیعر. هەڵوێستی کومەڵایەتی شاعیریش کاردەکاتە سەر ئەو وێنەیە.

شاعیرێکی مەزهەبی دەتوانێ، بە دوورو-درێژی، ئەم عیشقە، بەخۆشەویستی خوا و شێخ و ئەولیا بنوێنێ و ژن بەزەوی کشتوکاڵ و ئامرازێک بۆ زاوزێ و بۆ بەهرەمەندی سێکسی بۆ کۆمەڵی پیاو-سالار ببینێ، (نەک وەک مرۆڤێک) بەو جۆرەش، هەستی بۆ دەربڕێ؛ وەک ئەدەب و هونەری عیرفانی، کە بە کوردیش نموونەوی زۆرە. راستییەکەی؛ گەلێک لە گۆرانییە سیکولارەکانیش، لەم سەردەما، لەم جوانی-ناسییە مەزهەبییە نزیکن و کەم تا زۆر، وێنەیەکی کزو کەنەفت لەژن بەدەستەوەدەدەن!

بەڵام ئەو شاعیرەی خۆشی و زەوقی مرۆڤ، لەئازادبوونی تاکەکەس لەهەموو دەردو ژانێک دەزانێ و بەرابەری مرۆڤەکانی لەلا گرنگە (خۆی بەکۆمۆنیست بزانێ یا هەر رێبازێکی تری هەبێ، تەنانەت خۆی بەهەڵسوڕاوی سیاسیش نەزانێ) مرۆڤ بۆی دەبێتە ئامانج و جوانی ئەو مرۆڤە! تەنات، جوانی و زەوق، بۆ ئەم دوو جۆرە کەسە، جیاوازن! جوانیناسی جۆربەجۆر، جوابی زەوقی جۆربەجۆری مرۆڤەکان دەداتەوە.

شوێنەواری، لانیکەم، دوو جۆر جوانیناسی سەرەکی، چ لە شیعرو چ لە باقی مەیداکانی هونەردا بەگشتی، دەناسرێنەوە: ئەوانەی خۆشی ژیان لەرەنجی مرۆڤەکانیتردا دەبینن و ئەوانەی خۆشی و جوانی لەگەشاوەیی مرۆڤەکانیتردا!

ئەم وتووێژەمان، دیارە، مەجالێکی بەرتەسکە بۆ لێکدانەوەی جوانیناسی بەگشتی و رەنگداوەی ئەوە، لەشیعری کوردیدا! من کورتەیەک لەم باسەم، لە گۆڤاری ژمارەیەک و ژمارەدووی هانادا، سەرەتای 90ەکان،

بڵاوکردوەتەوە. پێم باشە لە فرسەتێکی تردا بێینەوە سەر ئەم باسە، چونکە پێموایە دروستبوونی ئەو بۆچوونانەی ئەوکات دەرم بڕیون، لەم بیست ساڵەدا، زیاتر رۆشن بووەتەوەو قسەی لەوانە تازەتریشم هەیە لە سەر بابەتەکە.

## گۆران، لوتکەی شیعری نوێی کوردییە

*** شیعری کوردی لەکوێی شیعری جیهانیدایە؟**

– شیعری کوردی ئاوێنەیەکە لە کۆمەڵی کوردی! کومەڵی کوردی لە کۆنەوە بەفۆلکلورو پاشان بەهونەری عیرفانی و لەم سەد ساڵەی دواییشدا، بەهونەر و بە شیعری مۆدێرن رەنگدانەوەیەکی بەجیهان داوە.

شیعری کوردی سەردەم، زیاتر، کاریگەری لەشیعری جیهانی وەرگرتووە، تا کاری تێکردبێ! «پیرەمێرد»، «بێکەس» و «قانیع»، هەر کامە بەشێوەی خۆی، پەیامی ئاڵوگۆڕ بەرەو کۆمەڵێکی شاری و مۆدێرن دەدەن بە دواکەوتوویی سەردەم و بە جووتیارو بە کرێکاری ئەو سەردەمە! ئەمانە، لەداهێنانی جوانی ناسیەکی تازەو جیاواز لەعیرفانی «مەحوی» و «مەولەوی» و ...، لە هەڵپێکانی هونەر و شیعری کوردی لەکومەڵی نێوتەوەییش، دەوریان هەبووە. لووتکەی بەرزی ئەم شەپۆلە «عەبدوللا گۆران»ە!

«گۆران» زیاترین کاریگەری لە شیعری جیهانی وەرگرتووە؛ ئەو فۆرمی شیعری کوردی گۆڕی بەفورمی نوێ و بێجگە لەوەش، بەبڕوای من، لەباری جوانیناسیشەوە، بەهرەیەکی زیاتری بردوە لەجوانی ناسیەکی مرۆڤی و شاری.

پاش «گۆران»، ئێمە شاهیدی پاشەکشەیەکین: «هەژار» و «شێرکۆ» دەکەونە نێو دواکەوتوویی ناسیۆنالیسمەوەو دەگەڕێنەوە بۆ جوانیناسییەکی «نویێ»ی جووتیاری و دوور لە شار! تەنانەت، کەم تا زۆر، نەفرەت لە شارو لە مۆدێرنیتە، سیمای دواکەوتوانەی شیعرەکانیان ئاشکراتر دەکا. هەژار، نەک هەر لەفۆرمدا، چەند هەنگاو بەرەو دواچووە، بەڵکو لەباری روانین بۆ مرۆڤەوە و بۆ جوانی مرۆڤەکانەوە، هیچی تێدا نەهێشتووەتەوە...

لەم بیست سی ساڵەی رابردوودا، شیعری کوردی، دیسان، ئاوڕێکی تازە لە ئەدەبی جیهانی دەداتەوەو شیعر لەزمانەکانی دیکەوە(بەتایبەت لە فارسی، تورکی، عەرەبی و ئینگلیزی) زیاتر دەکرێتە کوردی. شیعر، لەفۆرمدا زیاتر سیکۆلار دەبێ. بەڵام جوانی ناسیەکەی زامدارە بە دەست کۆنەپەرستی جیهانی و کوردییەوە. لەم چەرخەدا، ئەدەبی کرێکاری و کۆمۆنیستیش سیمایەکی تازەو تایبەت لە شیعرو هونەری کوردیدا دەنوێنێ. بەم جۆرە، بزووتنەوە کومەڵایەتییەکانی کوردەواری، پەیامی جۆربەجۆری خۆیان بە هاو زەوقەکانیان لە جیهاندا دەگەیەنن.

*** تۆ بۆ ماوەی چەند دەورە لە پێشەنگ بوویت، چۆن هەڵیدەسەنگێنیت، هەر لەیەکەم شیعرت کە لەپێشەنگی ژمارە(1) (1985) بەناوی (سپاس) هی (برتۆلد برێشت)ە وەرتگێڕاوە، چەمکی ئایدۆلۆژیای مرۆڤدۆستی و مارکسیستی پێوەدیارە؟ بۆچی هەمیشە ئایدیای چەپ و مارکسی رەنگدانەوەی لەسەر شیعرەکانت هەبوووە؟**

– ئەمە دوو پرسیارن؛ هەڵسەنگاندنەکانم لەسەر پێشەنگ، هەر لەوێدا بڵاوکراوتەوە؛ بەتایبەت لە پاشکۆی

ژماره 12؛ باشتره هەر لەوێ بیخوێننەوە. دووهەمیش؛ من شاعیرێکی بێ-لایەن نەبووم. من گوێم لەدەنگی هاوخەباتەکانم لەجیهاندا گرتووەو بەکوردی و فارسیش وەرمگێڕاونەتەوە و گەیاندوومن بە خوێنەرانی کوردی.

*** کۆ شیعری «گەشتێ لەکوردستان» تا ئێستاش جوانی خۆی هەیە شیعری «لەسەر ئارێزەوە»ت هەیە، چۆن لەدایکبوو؟**

– ئەم شیعرە بەشێکە لەبەرهەمی سەفەرێکم بەشوێنەوارەکانی بزووتنەوەی چەکدارانەی «سمایلی شەریفزادە»و هاوڕێیانیدا، کە ساڵی (1969) نووسراوە و بەناوی «گەشتێ لەکوردستان»؛ هەر ئەوکات بەنهێنی، بڵاوکرایەوە. ئەو کارەم بۆن و بەرامەی ئەو کاتەشی پێوە دیارە، گەرچی جوانی و بایەخی تایبەتی خۆی هەر هەیە.

*** شیعری ئەنتەرناسیۆنال و یەکی ئایار هەر زیندون چۆن دەڕوانیتە شیعری «ئەنتەرناسیۆنال» کە تۆ بەدەستکەوتی هونەری کۆمۆنەی پاریس ناوت بردوەو لە نوسینی «ئۆژین پۆتیە»ی شاعیری فەرەنساییە و یەکەم جار تۆ، بۆ کوردیت وەرگێڕاوە؟**

– یەکێک لەکارە گەشەکانی هونەری جیهانی ئێمە، ئەم سروودەیە؛ کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خەباتی کرێکاری کۆمۆنیستی بووە. پەیامی یەکسانی مرۆڤ و رزگاری یەکجاری لەستەم و لەچەوسانەوە و لەخورافەو نەزانی بەشێوەیەکی کورت، وەها گونجاندوە کە ئێستاش، پاش نزیکەی سەدەونیوێک، هەر جوانەو هەستی جیلە تازەکانیش ئەبزوێنێ.

*** شیعری (سەد ساڵە، سەد ئەیارا) کەبۆ ئایاری (1986)ت نوسیوە، یەکێکە لەشیعرە گەورەکانی تۆ و بەشیعرێکی کرێکاری کوردی ناسراوە، چۆن ئەم شیعرە لەدایکبوو؟**

– ئەم شیعرەش لە گەرماوگەرمی گەشەکردنی خەباتی کرێکاری لە ئێران و لە کوردستان، لە پیناوی ئەوەدا کە سەرەتای مانگی مەی، وەک ڕۆژی جیهانی کرێکار، ببێتە سوننەت، ببێتە ترادیشن، لەوڵاتدا. لەبیرمە، سروودەکانی ئێمە، بەتایبەت «کرێکارانی جیهان یەکگرن» کەوتە سەر زاری جەماوەر و بەڕێوەبردنی یەکی ئەیار کە لەشارەکان، ساڵ بەساڵ گەرم و گەشتر دەبوو، هەمیشە لەگەل بیرەوەری ئەم سروودە بووە.

***(م. خارای) شاعیر، چۆن شاعیرێك بوو؟**

– با قسەی کەسایەتییەکان دانێین بۆ دەرفەتێکی تر.

*** یەکێکی تر لەو شیعرانەی کە وەرتگێڕاوە شیعری (چیدی روت و ڕەجال نابین) لەشیعرەکانی «هاینە» زۆر لەسەر زاری خەڵکەو (بەکری لەگزی) کردوویەتە گۆرانی، ئایا لای خۆشت هەمان گەورەیی هەیە؟ پاشان دەپرسم بۆچی شیعرەکانی «هاینە»ت زۆر وەرگێڕاون لەبابەتی (گۆرانی پارچەچنانی سلیزی) و شیعرەکانی جەوهیل؟**

– ئەمە، یەکێکە لەجوانترین کارەکانی «هاینە» و لای منیش خۆشەویستە. «هاینریش هاینە»، یەکێک بووە لەهاوڕێیانی مارکس کە خەباتی کۆمۆنیستی و کرێکاری ئەڵمانیای ئەو سەردەمە، لەشیعرەکانیدا ڕەنگدانەوەی هەیە. «هاینە»ش هاوڕێیەکی شیعریمە، وەک «برشت» و وەک «لۆرکا»! بۆیە منیش دەنگ و هەستیم گەیاندوەتە بزوتنەوەی کرێکاری لەکوردستان. بەڵام من گۆرانییەکەم بەدەنگی «کاڵێ» بیستووە.

شیعرەکانی «جەوهیل» پرسیارێکی ترە. «جەوهیل» کرێکارێکی هەڵسوڕاوی بزووتنەوەی کرێکاری بووە لە ئەمەریکاو لەسەرەتای سەدەی بیستەم. دەنگخۆش و گورانیبێژی ئەو بزووتنەوەیەش بووە. بەپیلانی سەرمایەداری سەردەم، تۆمەتی ناڕەوای کوشتنیان لێدا و ساڵی (1915) تیربارانیان کرد

*** شیعری «هەی داد» تائێستا لەسەر زاری خەڵکانێکی زۆر واناسراوە کە شیعری زەحمەتکێشانە دەکرێت بڵێم ئەمە رەنگداوەی خەباتی چینایەتیەو باشترین شیعری تۆیە؟ ئایا ئەم شیعرە خۆی بەهێز و چاك بوو یان (نەجمەدینی غولامی) بەخەڵکی ناساند؟**

– مایەی شادیمە کە ئەم شیعرە، ئاوا ناوبانگی دەرکردوە

*** لۆرکا شاعیرێکی گەورە بوو تۆ شیعرێکی «فدریکۆ گارسیا لۆرکا»ت وەرگێڕاوە (لۆرکا) چیت بیر دەخاتەوە؟**

– لۆرکاش بەهاوڕێیەکی شیعریم دەزانم، کە هەستی خەباتکارانەی بزووتنەوەی جەماوەری لە ئیسپانیای پێش شەڕی دووەمی جیهانی، لەشیعرەکانیدا نواندوەتەوە.

## (هەژار) تاوانبارە بەرانبەر ژنان؟!

*** ساڵی (1370) لەژێر بابەتێکت بە ناوی (حزبی دیموکراتیش) (هەژار) ی گرتە باوەش بڵاوکردەوە رەخنەی توندت لەهەژار گرت و دیوانەکەیت بەکۆگایەك لەکۆپەرستانەترین بۆچوون پێناسەکرد ئایا ئەمە لەبەر ئەوەبوو، کە ئەو شاعیرێکی نەتەوەیی بوو، یان شیعرەکانی هەستی مرۆیی و بایەخدار نەبوو؟**

– هەردوو هۆیەکان بوون، پێکەوە! هەژار لەسەرانسەری دیوانەکەیدا، ئایدیۆلۆژیای ناسیونالیستی خۆی دەردەبڕێ. هەر بەو شێوەیەش بایەخ بۆ مرۆڤ و بۆ ژن دادەنێ (یان باشترە بڵێین دانانێ!). نەفرەت لەعەرەب و لە فارس و لە تورک، زۆر ئاشکراو بێ پەردەیە! لەعورفی ئەمڕۆی جیهاندا، ئەو قسانەی ئەو دەینێتە سەرشانی گەلانی دیکەو بەو جۆرەی ئەو باسی ژنان دەکات، بەتاوان دادەنرێ!

*** پێشەنگ و ناسیۆنالیزم شەریك بوون هەر زوو رەخنەت لەپێشەنگ گرت و وتت» ناسیۆنالیزم شەریکە ماڵی پێشەنگە» چۆن شەریك بوو؟**

– کاتی خۆی، ئەو رەخنەیەم لەپێشەنگی ژمارە(12) دا بڵاوکردەوە. پێم باشترە سەرنجتان راکێشمەوە بۆ ئەو نوسراوەیە، نەک جوابێکی کورت بدەمەوە.

*** رەخنەت لەشیعری «کوا وەختی بوو»ی شێرکۆ بێکەس گرتووە کە بۆ د. جەعفەری شەفیعی نوسیوە وتوتە بۆنی ناسیۆنالیستی لێدێ و وتوتە، ئەو وەسفەی شێرکۆ دەڵێی «بۆ شۆڕەسوارێکی کۆنی کورد نوسراوە»؟**

– کورتەی رەخنەی من لەو شیعرەی شێرکۆ، هەر ئەوەیە کە خۆت لەپرسیارەکەدا هێناوتە. لێکدانەوەی زیاتر لەنوسراوەکەی پێشەنگدا هاتووە.

*** ساڵی (1984) کە دیوانی شیعری (سرودی سلاوی ئازادی)ت بڵاوکردوە. وتت ئەم شیعرە کردەی ئەم شۆڕشەیە؛ مەبەست لە «شۆڕش»، ناڵێی شورشی کێ و بۆچی، نارۆشنە! ؟**

– ئەم پرسیارەش خوی کۆمەڵە پرسیارێکە. مەبەستم شۆڕشی کوردستانی ئێران و بزوتنەوەی چەپە من خۆم بەشاعیرێکی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی و کرێکاری دەزانم.

ئەم دیوانە، بەهەڵبژاردەیەک لەسرودەکان دەستپێدەکات و پاشان شیعرو هۆنراوەکانی ئەوکات کە لەڕادیۆکانی دەنگی شۆڕشی ئێرانەوە بڵاودەبوونەوە، لەم دیوانەدا بڵاوم کردوتەوە

## لەو شیعرانەی بۆ کۆمەڵەم نوسیوە پەشیماننیم و دەست لەو میراتەش هەڵناگرم

*** شیعری بۆ «پێشمەرگەی کۆمەڵە»ت لەساڵی (1981) بۆ کۆمەڵە نوسیوە، کەچی دواتر وازت لەکۆمەڵە هێنا، ئایا پەشیمان نیت لەو شیعرانەی کە بۆ کۆمەڵەت نوسیوە؟**

– لێرەدا، بەکورتی، بەشێک لەمێژووی کۆمەڵەت دێنمەوە بیر. لە دوای هێرشی ئیمپریالیستی (1991)دا، ناسیونالیسم لەناوچەدا بەهێزتر بوو. ئەو هێزە ناسیونالیستییەش کە ئەوسا لە کۆمەڵەدا و (لە کانوونی هونەری کرێکاریدا) لاواز بوو، ئەمجار، بەبێشەرمییەکی تازەوە، ڕووبەڕووی کۆمۆنیزمی کۆمەڵەبووەوە. ئیتر، کۆمەڵە، ئەو کۆمەڵە کۆمۆنیستە نەما کە ئێمە خەباتمان بۆ دەکرد. ئەو کات، زوربەی کادرەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵە، لەو حزبە هاتینەدەر و حزبی کۆمۆنیستی کرێکاریمان پێکهێنا. ئەمانە، لە نووسراوە ولە بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمەدا، بە دوورو درێژی، باسکراون.

سەبارەت بەو شیعرانەی بو کۆمەڵەم نووسیون، نەک هەر پەشیمان نیم؛ بەڵکو ئێستاش من خۆم بەخەمخۆری ئەو کۆمەڵە کۆمۆنیستە ئەزانم کە دروستمانکرد و ئاوای لێهات. گەلێک جاریش بەگژ ئەو کەسانەدا چوومەوە،

که بە لایەنگری سیاسەتی ئیمپریالیستی داگیرکەران و دەسەڵاتدارانی ناسیونالیستی ناوچە، ویستوویانە کۆمەڵە و میرات و مێژوی کۆمۆنیستی کۆمەڵە بە تالان بەرن. من نەک وازم لەکۆمەڵە نەهێناوە، بەڵکو وازم لە بەتالانبەرانی کۆمەڵەش نەهێناوە! ناهێڵین ئەم دەسکەوتە کۆمۆنیستییەمان لێ بدزن و بیخەنە توێشوبەرەی ناسیۆنالیسمەوە

## کۆمەڵگا لە گەڵ ئازادبونی ژن، ئازادە

*** ژن، لای تۆ و لەشیعرەکانت جێگەو پێگەی گرنگی هەیە؛ ژن لای تۆ چییە؟ ئایا ئەمە لەڕوانگەی هەستی چەپگەراییەوەیە، یان وەکو کائینێکی گەورە سەیریدەکەیت؟**

– ژن نیوەی کۆمەڵە، مرۆڤەکان نیوەیان ژنن! لەماف و بایەخ و ڕێز و حورمەتدا، ژنان بەرابەر و یەکسانن لەگەل پیاوان. ئەمە بۆچوونێکی تایبەت بە من نییە. ڕێبەرانی کۆمۆنیست، ئازادی و بەرابەری ژن، بەئاوێنەی ئازادی و بەرابەری کۆمەڵ دادەنێن. کۆمەڵێک، هەر ئەوەندە ئازادە کە ژنەکانی ئازادن. ئێمەی کۆمۆنیست، سەبارەت بەم پرسە، کۆمەڵێک کتێب و لێکۆڵینەوەمان هەیە. ئەو هەست و هەڵوێستانەی من لەشیعرەکانمدا دەرمبڕیون، پێداگرتنێکی تازەیە، لەسەر ئەو هەڵوێستانە و بەهیوام ڕێبوارانی ئەم ڕێبازە گەلێک لەوەش زیاتر بکەن.

*** سرودی (کاک شوان و کاک فوئاد و مام رەحمان) بۆ سێ تێکۆشەرت نوسیوە، ئەمانە، ناچنە قاڵبی دەربار (ستایشەوە)؟**

– مەبەستت لەدەربار چییە؟ شوان و فوئاد و مام ڕەحمان، ئایا شازادەی دەربار بوون؟ یان کارگەر و کۆمۆنیست و زەحمەتکێش؟ ئایا شایانی خۆیان نییە، ڕێزیان لێبگیرێ وەک من لێم گرتوون؟

*** زۆر شیعرت بۆ پێشمەرگە وتوە. پێشمەرگە، لای تۆ چ مانایەکی هەیە؟**

– وایە“ هەندێک لەشیعرەکانی من بۆ پێشمەرگەی کۆمەڵە بوون؛ بو پێشڕەوانی ڕێبازی خەباتی کۆمۆنیستی“ نەک هەرجۆرە پێشمەرگەیەک! پێشمەرگە، بەبۆنەی ڕێبازی خەباتییەوە لای من ڕێزو بایەخی هەبووە.

*** هاوسەرەکەت پێشتر کاری نهێنی دەکرد؛ ئایا ئێستاش واماوە؟**

– هەر وەک لەشیعری «نامەت نایە»ش دا دیارە، ئەو لەشار کاری نهێنی دەکرد و من لە شاخ بووم. ئێستاش ئەو هەر هەڵسوڕاوی ڕێبازەکەیە.

## نامەکەی روناك، شیعرێکی جوانی خۆمە»

*** وەڵامی نامەکەی رووناك « جوانترین شیعری تۆیە. ئەم شیعرە چۆن لەدایکبووە؟**

ئەمەش دوو پرسیارە: خۆیشم شیعری «رووناک»م زۆر پێ جوانە. ئەوەی کە دەڵێی جوانترین شیعرم، با بیسپێرین بەخوێنەر. ڕەنگە هەر کەسێک دەست بنێتە سەر شیعرێکی تایبەت و بەجوانترینی بزانێ. ئەم شیعرە، پاش هاتنی دایکی رووناک، بۆ پێشمەرگایەتی، دروستبوو.

بیرۆکەی شیعرەکەش، دەتوانم بڵێم، هی ئەوە! ئەوەی دایکی رووناک بۆیگێڕامەوە، کە چلۆن ماڵاوایی لەرووناک کردوە، بوو بەبیرۆکەی شیعرەکە!

*** لەدیوانی «دەنگ هەڵبڕە» نوسیوتە: ئەمە یەکێکە لەهەزار دەرد و ژانەکانم» ئەو هەموو دەردو ژانە چین؟ کە تۆ تەنها و تەنها، لەخەمی خەباتی چینایەتی و کرێکاریدا بوویت؟**

– هەموو دەرد و ژانی کۆمەڵایەتی، ریشەیان لەستەمی چینایەتی دایە؛ لە نەداری و نابەرابەری و ستەمێک دەوەشێتەوە کە ئەم سیستمی «کۆیلەداری کرێگرتە» سەپاندوویە بەسەر زۆربەی جەماوەردا. بۆ نموونە: ئەمڕۆ ئیتر لای گەلێک کەس ئاشکرایە، کە زوڵم و زۆرێک کە لە ژنان دەکرێ، لە بەرژەوەندی سەرمایەو لە چەوساندنەوەی خۆڕایی ژنان لەزیندانی خێزاندا، دەوەشێتەوە. تەنانەت ئێش و ئازارێک کە دێتە رێی دڵداری و ئەو هەموو گۆرانی و شیعرەی لێ دەبێتەوە، هەر لە نەداری و نابەرابەری و مەزهەب وسوننەتی کۆن دەوەشێتەوە کە لەخزمەتی ئەم سیستمەدایە. ستەمی نەتەوەیی لە کورد، لە فەلەستین، ئەمانەو هەزاران دەرد و ستەمی تر، بەسیستمی سەرمایەدارییەوە بەندە. من و هەڵسوڕاوانی ئەم رێبازە هونەرییە، بەرەنگدانەوەی ئەو دەرد و ژانانە، رێگای راماڵینی هەموو مەینەت و دەردەکان خۆشدەکەین. بەسەرکەوتنی خەباتی چینایەتی و بەئازادی مرۆڤ لە چەوساندنەوە، رێگا بۆ چارەسەری هەموو دەرد و ژانەکان خۆش دەبێ. بۆیە خەمخۆری بۆ ئەم خەباتە، خەمخۆریە بۆ رزگاری مرۆڤ لە

هەموو ئێش و ئازارێک. دیاریشە من، وەک تاکەکەسێک، فریا نەکەوتووم هەموو ئەو ئێش و ئازارەی دیومەو ناسیومە، وەک بەرهەمی هونەری پەروەردەبکەم.

## هەرسێ دیوانەکەی خۆم پێ جوانە

*** کام لەو سێ دیوانەی خۆتت زۆر پێ جوان و باشن؟ هەرکام بەشێوەیەك لای خۆم بایەخیان هەیە. لەمێژووی خەباتی چینایەتی ناوچەکەشدا، هەرکام جێگای خۆیان هەیە لەگەل ئەوەی تۆ خاوەنی چەندین شیعری گەورەو جوانی، بەڵام هێشتا زۆر لەنوسەران و شاعیران و خوێنەران، بەناوی تۆو بەشیعرەکانی تۆ ئاشنانین. دەبێ هۆکاری ئەمە چی بێت؟**

– کۆمەڵ، پێکهاتووە لەچینی ناتەبا. چێژی هونەریش جۆربەجۆرن و ناتەبا. لەوانەیە ئێستا، وەک سەردەمێکی بەهێزبوونەوەی ناسیونالیسم و ئایدۆلۆژیای سەرمایەداری، چێژی هونەری ئەوان دەستی باڵای هەبێ و بەو پێیەش، لەوانەیە، لایەنگرانی چێژی باوی سەردەم، خوازیاری ئەم بابەتە شیعرانە نەبن!

## شیعرەکانم لەریالیزم نزیکترن

*** بەشێکی شیعرەکانت هەرچەندە ساکارن، بەڵام مانا و وێنەی جوانیان تێدایە دەکرێت بڵێیت سەر بەچ قوتابخانەیەکی شیعرین؟**

– لەپرسیاری پێشوودا باس لەگەورەیی و جوانی شیعرەکانمەو لێرەدا باسی ساکاربوونیان! سەبارەت مەکتەبی شیعری، ئەگەر کارەکانم رەنگدانەوەی هەست و

هۆشی کۆمەڵانی کارگەر و چەوساوەبن لەخەباتی چینایەتیدا، لەوانەیە لەریالیسم نزیک بن!

*** پێموایە لەبەرئەوەی تۆ کەسێکی چەپ و مارکسی بویت و لەژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیایەکی مارکسی دابویت، بۆیە بەوشێوە پەیوەست بوون بەمافی کرێکار و رەنج و مەینەت و هەژارییەوە لەناو شیعرەکانت رەنگیداوەتەوە؟**

– ئێستا باسی تازەتر زۆرن. ئەوەی کە ئایدۆلۆژیای مارکسی چییە و چۆنە، با لێرەدا نەچینە سەری، بەڵام، بەڵێ؛ بێمافی کرێکاران و کۆمەڵانی خەڵک و دەرد و ژانیان، لەشیعرەکانمدا رەنگیداوەتەوە!

## شیعرەکانی من لەپێناو ئازادیدا بووە

*** دەکرێت بڵێم تۆ شاعیری چەوساوەکانی؟**

– شیعر و نووسراوی من، لەپێناوی ئازادی و بەرابەریدا بوون. لەسەرەتادا بەبۆنەی تیکەڵاوی خەباتمان لەگەڵ ناسیونالیسم، بەرهەمەکانی منیش ئەو شوێنەوارەیان پێوەدیارە. هەتا هاتووە، بەدوور کەوتنەوەی خۆم لەناسیونالیسم، بەرهەمەکانیش ئاشکراتر دەکەونە پێناوی ئازادی و بەرابەرییەوە. «هونەری کارگەری»، «هونەری چەوساوەکان» یان لەمانەش دێرینتر «ریالیسمی سوسیالیستی»، چەند نێو و چەند سەر–دێڕن بۆ پێناسەکردنی رەنگدانەوەیەکی تایبەتی هەست و هۆشی مرۆڤ، لەهونەردا! مرۆڤ، هەر بووەتابووە، هەستی خۆش و ناخۆشی خۆی بەرانبەر

بەدەوروبەر، لەهونەر دا دەربڕیوە. بەگوێرەی هەڵوێستی چینایەتیش، ئەم ڕەنگدانەوانە، جیاواز بوون. مانگرتنێکی سەرکەوتوو بۆ کرێکار جەژنەو بۆ سەرمایەدار شین و شەپۆڕ!

لەگەل وشیاری چینایەتی چینی کرێکاردا کە پێیدەڵێین کۆمۆنیسم، هەست و هۆشی مرۆڤەکان، بەتایبەت چینی کرێکار، زیاتر وشیارانەیەو زیاتر تێگەیشتووە کە ڕیشەی مەینەت و نەهامەتیەکانی، نەک هەر کرێکاران بەڵکو هەموو مرۆڤیش، لەم سیستمە چەوسێنەرەدایە؛ بۆیە هەرخۆشییەک و هەر هەستێکی جوان، یان هەر جەخارێک و هەست بەناکامی و مەینەتبارییەک، بەجۆرێک لەجۆرەکان، پەیوەستە بەهەڵس وکەوتەوە لەم مەیدانەدا. مەبەست لەم ڕێبازە، چ وەک ئەوکات، ناوی هونەری کارگەری بێ، چ لەژێر هەر ناوێکی تردا بێ، هونەرێکە ڕووبەڕووی هەر نابەرابەری و مەینەتێک دەبێتەوەو هەر خۆشییەکی مرۆڤی و ئینسانی، دەنوێنێتەوە.

ئەم ڕێبازە، ئازادی و بەرابەری پێکەوە، دەکاتە ئامانج! بۆ ئازادی، بەرابەری فیدا ناکات و بۆ بەرابەریش، ئازادی نانێتە لاوە! من سەرسامم کە بۆچی «ڕیالیسمی سوسیالیستی» بەو دەردەچوو؛ دەنا ئەو ناوە، ناوێکی ڕەسا و پەسا بوو بۆ ئەم ڕێبازە. «هونەری چەوساوەکان» لام زۆر ڕوون نییە. هونەری کارگەریش، لەگەلێک شوێنی دنیا، مەعنای ڕەنگدانەوەیەکی ساکاری ژیان و خەباتی کرێکارانە؛ ژیانێک کە هەمیشەش وشیارانەو پوخت و

پاراو نیە! دیارە مەکتەبە جۆراوجۆرەکان ئازادن، بەڵام من، خۆم بە لایەنگر و هەڵسوڕاوی هونەرێک دەزانم کە سەرچاوەی مەینەتەکان لەسیستمی چەوسانەوەدا دەبینێ و خۆشی و کامەرانی مرۆڤیش لەسۆسیالیزمێکدا دەبینی، کەهەر ئێستا زیندوەو دەستکەوتی گەشی بۆ بەرابەری و بۆ ئازادی و بۆ مرۆڤایەتی بەدەستهێناوە. ڕێبازێکە، سەرەڕای هەر گیروگرفتێک، ڕووی لەئاسۆی ژیانێکە گەش و پاراو، دوور لەئیش و ئازار، بە پانایی هەموو گۆی زەوی!

پرسیارەکە لای من ئاوای لێدێ کە کاری هونەری من چەندە ڕەنگدانەوەی هەست و هۆشی ئەم ڕێبازەیە. وەڵامەکەی دەسپێرمەوەبەخۆت و بەخوێنەران.

*** لە شیعرەوە بۆ خەباتی چەکداری شاخ و دواتر بۆ ناو مۆدێرنەی ئەوروپا، دووجیهانی جیاواز، بۆچی دوو جیهان؟ ئایا خەباتی پێشمەرگانەت کاریگەری لەسەر شیعرەکانت جێهێشت؟ لەبارەی سەردەمی شاخەوە چی دەڵێت؟**

– من، ئاڵوگۆڕەکە بە شێوەیەکی تر دەبینم. بەهێزبوونەوەی کۆپەرستی و ناسیۆنالیسم، پاڵی بەئێمەوە نا کە شوێنی، خەبات و ژیانمان بگۆڕین. لاوازبوونی خەباتی کۆمۆنیستیش، هەم لەوێ و هەم لەگۆڕەپانی جیهانیدا، کاریگەرییەکی وایکردوەتە سەر هونەر، کەجێگای لێکوڵینەوەیەکی تایبەتییە.

*** لەیەکەمین بەیاننامەی (کانونی هونەر و ئەدەبی کرێکاری کوردستان) لەجۆزەردانی (1364) (ژوئەی 1985)د١، هاتووە: ئامانج لەدامەزراندنی کانون، پەرەپێدانی هونەر و ئەدەبیاتی کرێکاری پەروەردەکردنی فەرهەنگی و کۆمەڵانی بەرینی کرێکاران و زەحمەتکێشانە بەخەباتی چینایەتی؟**

– ئەو بەیاننامەیە، هی سەردەمی خۆیەتی. ئێستا گەلێک شت گۆڕاوە؛ ئەوەندەیە، پەرەدان بەهونەرو ئەدەب و کەلتووری کرێکاری، هەمیشە کارێکی باشەو بەتایبەت روونکردنەوەی پەیوەندی هونەری جۆربەجۆر بەچین و توێژەکانی کۆمەڵ و روونکردوەی رۆڵی هونەر لەخەباتی کۆمەڵایەتیدا، بەچاک و خراپیەوە، باسێکی هەمیشە تازەیەو شایانی لێکۆڵینەوەیە. هونەری کرێکاری، لەگەلێک شوێنی جیهاندا، بەو مەعنایە نییە کە لەو بەیاننامەیەدا هاتووە. ئێستا ئەگەر بماونەوێ، هەر بەو مەبەستەوە، گەشە بەهونەر بدەین، دوور نییە نێوی گونجاوتری بۆ بدۆزیوە. وەک باسمکرد «ریالیزمی سوسیالیستی» رەنگە ئێستا، وەک سەردەمی ستالین واتاکەی خراپ لێکنەدرێتەوەو ناوێک بێ کە ئێمەش بتوانین بەکاری بێنین. کۆسپی گەورە، ئەوە نییە کە بزووتنەوەکە چ نێوێکی هەبێ، بەڵکو کۆسپی گەورە ئەوەیە کە سەرمایەداری توانیویەتی هونەری خۆی، لە «هالیوود»ەوە تا «بالیوود»، بکاتە پاڵپشتی پروپاگەندەی خۆی، بۆ ئابڕودان بەم سیستمە ستەمکارانەیە؛ بۆ بەچاک دانانی ململانێ و رقەبەری نێو مرۆڤەکان، رقەبەری ناسیونالیستی بەپیرۆز دابنێ، مەزهەب، (بەخەرجکردنی ملیار ملیار دۆلار لە دەسرِنجی

ئێمە) وەک حەقیقەتێکی پیرۆز بنوێنێ، خێزان، نەک وەک بەندیخانەی ژن و منداڵ، بەڵکو بە تەنها پەناگەی تاکەکەس بداتە قەڵەم؛ شەڕ و بۆمبای جۆراوجۆرو ئاوارەیی و نەداری، بکاتە بەشێکی جیا نەکراوەو هەمیشەیی ژیانی بەشەر! لەهەمانکاتدا، ئێمە ئەگەر هەوڵێکی هونەریمان دابێ، نێویان ناوە هونەری «ئایدۆلۆژیک»! چما هونەری خۆیان ئایدۆلۆژیک نییەو هونەری خۆیان قینی ناسیونالیستی و راسیستی و ناموسپەرستانەو دژ بەژن و دژ بە یەهوود و دژ بەهەڵخەڵەتاوانی مەزهەبەکانی تر، بڵاوناکاتەوە!

لەکاتێکی ئاوادا، زیاتر لەهەمیشە پێویستە ئێمە دەنگ و هەست و هۆشمان بەبارێکی تردا گۆشبکەین. زیاتر پێویستە دەنگی «جەوهیل» و «جان لنون» و ئەمانە، لەدژی ناسیونالیسم و لە دژی مەزهەب ببیستین و بڵاوی بکەینەوە؛ زیاتر لەهەمیشە پێویستە دەنگی «برتۆلد برشت» لەدژی شەر، بانگەواز بکەینەوە؛ زیاتر لە جاران مەزهەب و خێزان و ناموس-پەرستی و مالکییەت، بگرینە ژێر هێرش و تەوس و توانج. باوەر و تاسە و تامەرزۆیی بۆ ئاشتی جیهانی و خەبات بۆ نەهێشتنی شەڕ و ئاوارەیی، ئێستا، زیاتر لەهەمیشە پێویست دەکات...

باسەکە کورتکەینەوە:

«ریالیزمی سوسیالیستی»، «هونەری کارگەری»، «هونەری چەوساوەکان»، «هونەری ئاڤانگارد» یان هەر نێوێکی تری لێدەنێین، ئەمە ریبازێکە بۆ وەڵامدانەوە بە

پێویستییەکی کۆمەڵایەتی ئەم سەردەمە. کانوونەکەی ئەوسای ئێمەش، هەوڵدانیک بوو بۆ خۆشکردنی ئەم ڕێبازە. چەندە سەرکەوتوو بوو، یان چەندە تاڵاوی ناسیونالیسم بەو دەردەی برد، باسێکی ترە. ڕووبەڕوو بوونەوە و خەبات دژی هەڵوێستی هەڵەی ئەو کانوونەش لەم بوارەدا، بەشێکە لەم ئەرکە! بەڵام ڕێبازەکە پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە! کانوونیش نەبێ، کەسانی تر دەیکەن.

***بۆچی تائێستا دیوانێکی چاپکراوی تازەت نییە، دەکرێت پێمبڵێیت، یەکەم شیعرت چی بوو؟**

– «چەند لاپەڕە لەدەفتەری ڕۆژانەم» لە(90)ەکاندا بڵاوبووەتەوە.

بۆ بەشی دووهەمی پرسیارەکەش: یەکەم هەڵبەستی خۆم دەگەڕێتەوە بۆ دەیان ساڵ لەمەوپێش، سەرەتای لاویم و زەمانی پاشایەتی ئێران، کاتێک کە من بەنهێنی و بەدەستنووس کارەکانم بڵاودەکردەوە. هەر بەو بۆنەشەوە گەلێکیان تێداچوون و هەندێکیان لەبیریش چوونەوە! بۆیەش ئێستا بیرم ناکەوێتەوە کە یەکەم شیعرم کامەبووە!؟

***لەناوچەکانی مەریوان و سنە و مهاباد چەند شەوی شیعرت بەڕێوەبرد. دەکرێت بیرەوەری ئەو شەوانەمان بۆ باس بکەیت؟**

– شیعر خوێندنەوە بۆ کۆمەڵێک پێشمەرگەی ڕێبازی کۆمۆنیستی هەمیشە هاندەرم بووە. بەتایبەت کە گوێگران خۆیان شیعرەکانیان هەڵدەبژارد و داوایاندەکرد کە بیانخوێنمەوە

## هیچ شاعیر و هونەرمەندێك هی هەمووان نییە

*** پێتوایە شاملۆ، شاعیری چەوساوەکان بوو، یان هی هەمووان بوو؟**

- هیچ شاعیرێک (و هیچ هونەرمەندێک) هی هەمووان نییە. «هەمووان» چینی چەوسێنەریش دەگرێتەوە. زۆر کەس لەدەسەڵاتدارانی چینی چەوسێنەر، ئەوساش و ئێستاش، شاملۆیان خۆشدەویست. بەڵام شاملۆ شاعیری ئەوان نەبوو.

**چاوپێکەوتن: ئەنوەر حسێن (بازگر)**

2012

# گەشتێ لە کوردستان*

سەرەتا
وا بەهارە کەژ و کێو ڕەنگینە
دڵە خەمگینە؛ بە تاسەو تینە!
خاڵە ڕێبواری خەیاڵم، تا کەی؟
بەهەوای نەی، بە نەشەی مەی، سادەی؛
وەرە با سەیرێ لە کوردستان کەین
ئاوپڕژێنێکی کوڵی دڵمان کەین

با بڵێم باسی هەژاری خۆمان،
باسی ژێردەستی و دیلی بۆ نان.
با بچین، دێ بە دێ، ئەم شار ئەو شار
دەمێ ڕابوێرە لەگەڵ خەڵکی هەژار

بۆت بکەم باسی جوانی کوردی
ژینی سەربەستی و مەرگی مەردی
بۆی دەماخت بە وەوشە خۆشکەم
نانی خۆشیم لەگەڵت دابەشکەم

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (ناسری رەزای)یەوە کراوە بە گۆرانی.

# هەورامان

خاڵە ڕێبواری خەیاڵ بۆ ئاسمان
بفرە تا شاخی بەرزی هەورامان

تاجی زمروت و زیوی کوردستان
چاوگەی ڕوونی ئەوینی "گۆران»[1]

هەستی زوڵاڵی دەریای بەر-بەرین
شیعری سەر ئەسوێ لە عەرشی بەرین

«کۆمەڵە شاخێك سەخت و گەردنکەش"
ئاسمانی شینی گرتووەتە باوەش

سەرپۆشی لوتکەی بەفری زۆر سپی
بە دارستان ڕەش ناو دۆڵی کپی»[2]

لە عەتری پشووی شنەی شیو و دۆڵ
سا پڕکە جامێ بادەی ساردو سۆڵ

سا پێم دەر، پەی پەی، نە خۆشاو مەی
وە یاد "مەولەوی"، ئەو بەحر بێ پەی
ئێگەن هەورامان یاگەو ئەشق و ویش
هەڵای دڵ یاران مەحزوونەن پەرێش

---

1- کۆپلەیەکە لە شیعری گۆران.

2- کۆپلەیەکە لە شیعری گۆران.

جەوساوە شاباڵ عەشقش بەرشیەن
گەردوون یەرێمان هیچ لوتفش نیەن

دەخیلت وادەی هەزار و ئەنەن
جەلای عاشقان هیممەت نەمەنەن

یاگەی وێرانەی دڵان پڕ دەرد
هاڵیەن: هاوار: جوانی ویەرد!

داخۆم رۆژی بوو ئەی هەناسەی سەرد،
بجۆشۆ وەتین عەشقەکەی نەبەرد؟

ئەوجا وە نەشئەی بادەی شیعر تۆ
وێم کەرو وەکوڕ چواردەساڵەی نۆ

مەست بوو وە نەشئەی بادەی ئازادی
«سیروان» جە «شاهۆ» مەبارەك بادی

خەیاڵەکەی خاو لەغاو وەرگێڕە
ماوە نەماوە بمێنین لێرە

خاو و نەرم خۆیێ بەین بەدەم باوە
بڵێین «مەولەوی» ماڵەکەت ئاوا

# مەریوان

لەگەل شەماڵ بەرەو مەریوان
قۆناغی «دوانزەسوارە»ی قارەمان

شاخی هەورامان، دەشتی مەریوان
هێلانەی هەڵۆ جێی بێچووە شێران

رۆحی «قانع» شاد پیری دڵ-گەورە
هەڵۆی قەلە بەرد ئامڕازی هەورە

بادەی شیعری تاڵ وەك بیرەوەریم
بیرۆخەرەوەی گشت دەربەدەریم

هاواری گەرووی خەڵکی چارە ڕەش
بە کسپەو سۆزە، وەکو پشکۆی گەش

کڵپەو بڵێسەی شۆڕشی تیایە
ئاووری سووری لە بن-سەردایە

بەحری «زرێبار» ئاوێنەی شیعری
وەك دڵی «قانع» بۆ دەروێش ئەگری

ساڵێ بەو عەیام «زرێبار» شار بوو
سێسەد دەروازە و چوارسەد منار بوو»

ساڵێ بەو عەیام کەوا «فەیلەقووس»
زاڵم و خوێن مژ، پیس و بێنامووس

حاکم بوو لەسەر شاری «زرێبار»
زوڵم و زۆری بوو بۆ خەڵکی هەژار

هیمەتی «دەروێش» چەرخی وا سووڕاند
نوقمی بەحر بوو؛ پاشایی دۆڕاند!

دڵی دەروێشە بەحری «زرێبار»
پەروەردەی خەمی خەڵکی خەفەتبار

ئەوا هەم دیسان داگیرکراوە
ئاخر قۆناغەو لەدەست دراوە

دەروێشی فەلا لەبەر بەدبەختی
ئاسمانی دووری زەویەکی سەختی

نای پەرژێتە سەر دەردی گرانی
بێدەسەڵاتی و ڕووتی و بێنانی

سا دەروێش:دەخیل: هیمەت بنوێنە
ڕەگی فەیلەقووس لە ڕیشە بێنە!

ئەوکاتە لەگەڵ زەلی «زەلەبووار»
مەبارەك بادی کەم لە «زرێبار»

نەرم نەرم و خاو خاو خۆ بدەم بە ئاوا
ئاوەکە بمبا بە چەم (پژاوا)

خاڵە ڕێبواری خەیاڵم تاکەی
جێ بێڵە مەنزڵ ڕێگا دوورە دەی

با بچینە سەر «وەیس» بە تۆبەکاری
تۆبە لە گشتێ غەیرەز دڵداری

## سنه*

لەسەر ئارێزەوە با بروانم
بۆنەکەی خۆشە ئەگاتە گیانم

قیبلەکەم: شاری سنەی سەربەرزم!
خاوەنی شۆڕە جوانی تەرزم!

قیبلەکەم: شاری کزی مل بەکوێن!
گۆڕی پیرۆزی شەهیدان لەکوێن؟

بابچم دەستە گوڵی لێدانێم
دڵی داماوی لەبەرپێ دانێم

گوڵە بارانی گڵی «سمکۆ » کەم
گڵە بانانی دڵی پڕ سۆ کەم

چەپکە شیعرێکی بڵێم بۆ "سمکۆ»
تاوەکو دەردی گران بێتەوە سۆ

چاوی ڕاستی مە: «گیڤارا»ی کوردی
خۆزگەماڵن پێت کە بە مەردی مردی
قارەمان، تاجی سەری شێر-پیاوان،
ناوی تۆ بوەتە سروودی لاوان.

بێ تۆ، بێ-بابە هەتیوی سەنگەر
بێ وریشانەوەیە ئاگری شەڕ
ڕاستە وەك بووڵەمڕی دامردوو
کەوتووە شاری سنە کزکردوو[8]

ژیلەمۆی بێگڕە پڕ سەودایە
ئاگری سووری لەبن سەردایە

کوڕە کورسانی بە عەشقی مەیمان
هەموو گیانیان گڕو سۆزەو پەیمان

لەبن ئەو ئاگرە سکڵی سوورن
مەشعەلی نووری بەرەو ڕێی دوورن

سوێند بە خوێنی گەش و سووری دڵی تۆ
لە جیای دەست و چەکی ژێر گڵی تۆ

بە هەزاران و هەزار دەست و تفەنگ
هەڵ ئەگیرسێننەوە مەشعەلی جەنگ
تا ئەگەینە ئەوی ڕۆژی واڵا
شەنگە باڵا بشەکێنن ئاڵا

گردی سەیوانی سنە ”کوچکە ڕەش»ە
قیبلەگای هەردڵێ وا چارە ڕەشە

«حجرالاسود“ی قیبلەم بێنن
بیکەنە کێلی عەزیزانی من

ئازیەتی شارە ڕەشی کوچکە ڕەشی؟
یاوەکوو، ڕەمزە لەبۆ چارە ڕەشی!؟

تاسەیی دۆستی وەکو ئەم یارە
ناشکێ بەم زووە بەم دیدارە

خاڵە ڕێبواری خەیاڵم هەستە
بەعەشقی* ئەو، ئەورۆ دڵەی من مەستە

سواری شاباڵی خەیاڵ بین بفڕین
تا دەگەینە ئەوی ناوچەی گۆڕین

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (ناسری ڕەزای)یەوە کراوە بە گۆرانی.

# سەقز و بانە

ئاوی چۆمی سەقز ئەسرینی شار
لایە-لایەی خەمی لاوانی هەژار

ماتەمێ گەرمە لەسەر گۆڕی لاو
نامیقی“ شۆڕە کوڕی پار کوژراو

شۆڕە لاوانی سەقز ئازادەن
ئەو هەموو خوێنە بەفیڕۆ نادەن

سەقز و بانە قەڵای کوردانن
ڕۆژی خۆی دایکی گەلێ مەردانن

ڕۆڵەکەی «ئاربەبا» شاری بانە
مشتی گوڕ-مشتی حەنای بێگانە

سەرەخۆشی لەتۆ بۆ کۆستی پار
هەربینا هاتنەوە گۆ، خەڵکی هەژار

ڕوو لە «دارێنە» لە «ئارباباوە»
کە دوا-سەنگەری «سمکۆ»ی لاوە

پێشکەشی کەین بە سەڵای بەرزی چەك
چەپڵە ڕێزانی قەتارێك فیشەك
هەر لەوێوە بە کەژی سوورکێوا
ڕاسپێرن گلەیی بەو دیوا

قارەمانانی دوێ و ئەورۆ درۆ
هێشتا ناسۆرە برینی «سمكۆ»

شۆڕشی كۆرپە لەوێ خنكاوە
نۆكەری دوژمنی خەڵكی باوە

خەڵكی مە، چیدی فریوێ ناخۆن
دوژمنی نۆكەرن و فیكری كۆن

چاوەڕێین هێزی گەل و خرمەی چەك
تێك بڕوخێنێ قەڵاتی دەرەبەگ.

بجووین سا، بە دەراوی خۆشا
ئاوێ بڕژێ بە دڵەی پڕ جۆشا.

هەر ئەڕۆی مووچە بە مووچەو مەزرا
كانیە، ماندوو نەبینی ڕێگا

ئاوی وەك تەرزە بەخێرت دێنێ
چاوە بڕكێشی دڵت دەفڕێنێ

هەر دەڵێی ئاوی دەس و دەستنوێژە
زەمزەمەی ڕوونی چەوی سارێژە

وەكو دڵداری بە لێوی سووتاو
بیمژە تا دڵەكەت بێ پاراو

# لادێ

ئەورۆ دوو لادێی هاورێمانن
پیرو ئیفتادەن و دونیا زانن

وەکو دەشتن، پڕی سەوزی بژوێن
وەك درەخت، سەر لە حەوایێ دەسوێن

گیانە، سەوزە بە گەڵای سەوزی بەهار
پڕی ئەستێرەیەی پۆپی پڕ بار

لقی پڕ میوەیە بێ فیزو نەوی
دەونەێ و ماچی ئەکا، خێوی زەوی

هەروەها سەر قسە دامەزراوە
یەکێ پیرە، ئەوی دی، دڵ لاوە

دەست و لوولاقی ئەمن باریکە
چاوە بێنوورە دڵم تاریکە

چیمە لە کێشەو باسی دنیا
عومرە با بردی چ ما با بیبا
ئێمە چن پێ دەکرێ؟ ئەو بەحرە!
هەوڵ و هەڵدان کوتان، بێ بەهرە.

تا هەڵی گۆزی کەمی لێنایە
دەوڵەتەو تۆپ و تفەنگی لایە

شێخ ئەفەرمێ، هەموو ماڵی دنیا
جیفەیە شوێنی کەون، دینوو و دەبا

سەگە، شوێن جیفەی دونیا دەکەوێ
تاقمی سۆفی زەڕی نابێ بوێ

لاو دەڵێ: مامە قسەت زۆر کۆنە
سەیرە لام ئەو هەموو ترسەت چۆنە؟

شێخ" و "ژاندارمە" و "ئاغا" و "دەوڵەت
هاو مل و ئاخوڕن و گشت بێوڵەت

هەموو تۆپ و تفەنگی خەڵك ترسێن
لەسەر ئەرکی من و تۆ، پڕ دەکرێن

سا ئەگەر ئاوڕی خەباتی مسکێن
دەگەشاو خۆش دەکرا تا هەموو شوێن،
ئەو دەمە شۆڕە کۆڕی نێو سەنگەر
ڕادەسا دەست بە چەك و دەچووەوە شەڕ

نان و فیشەك لە هەموو ماڵێ ڕا
تا بەری سەنگەرەکانیان دەبرا...
دێ یەك دەرکەوت لە دەراوی پاراو
زەمزەمەی "چاکی چلۆنی" کانیاو

کانییەو شەنگە کچەو گۆزەڵە ئاو
منم و قرچەی گیانی سووتاو

بە قومێ ئاو و بە پرشنگێ چاو
دڵە فێنك دەبێ، گیان دەکوڵێ بەتاو

ماڵەکان دەست لە مل و مل-بە-کوین
هەر ئەڵێی بۆ خەمی گۆڕین ئەگرین

دەشت و دەر ئاووسی باسی پارن
لە تەقەی تۆپ و تفەنگ پڕ بارن

گەرچی بێدەنگ و تەقەن ساردو سڕ
وەکو زستانە دەڕەو دۆڵی کڕ
غایەتی، یادی بەهارە چکۆلە
تین و هومێدی دڵە لەو چۆڵە

هەر بینا هەڵدەبێ دیسان ئاگر
رۆژی نەورۆزی بەهاری پڕ گڕ

دوژمنان تێك دەشکێن بەو کڵپە
هێزی گەل؛ ئاوری بەسۆز و کسپە

# بۆکان

شاری بۆکان ئەوەتا خەمبارە
ئازیەت- باری کوڕانی پارە

لێرەیە جووتە-برا کوژراون
کوێربێ دوژمن؛ کە خەڵك هەر ماون

بەحری خەڵك مونجی ئەدا وەك لافاو
سنگیان پڕ لە شەپۆلی پەنگاو

چاوی گشت پڕ-هەڕەشەو دڵیان پڕ
لە حەنای دوژمنی وەك گورگی دڕ

لە هەموو قوژبنی گشت کوردستان
پڕکراوە لە خەڵك سەد زیندان

قارەمانانی خەباتکەر، یەخسیر
دیلی داون بە تەڵەی دوژمن گیر

قارەمانانی نەبەز شۆڕشگێڕ
وەکی بەوران لە دژی دوژمن شێر

قارەمانانی بەبێ ناو و نیشان

## ڕۆڵەکانی نەبەزی کوردستان

هاوەڵان چاولەبەری نەورۆزن
چاوەڕێی تینی بەکسپەو سۆزن

گەرچی ئێستا هەموو هەورەو باران
هەربینا هاتنەوە دیسان یاران

بە چەکی تازەوە، نەك وەك هی پار
بە چەکی شۆڕشی گەرمی دێ و شار

بە سەری بڕنەوەوە لیلووپەڕ
کە دەدا موژدە لە سەرکەوتنی شەڕ

# سابڵاغ

با بڕۆین ڕوو لە دەرەی شاروێران
تا دەگەینە ئەوی شاری وێران

دڵە هەڵقرچێ بە یادی جاران
ئێرە «سابڵاغە»و قیبلەی یاران

شاری «سابڵاغ»ی "سولەیمان" پەروەر
چۆن ئەتۆ ماوی بەبێ ڕۆڵەی شەڕ؟

کوانێ "عەوڵا"ت و "مراد شیرێژ"ت؟
کوانێ ڕۆڵەی نەبەزو خوێنڕێژت؟

کاکە "سمکۆ"ی لە سنە نێژراوت؟؟
چاکترین شۆڕە کوڕی کوژراوت؟

مینە شەم" چۆنە بەهەشتی جێیە؟
لە بەهەشتی دڵی خەڵك جێی کوێیە؟

ئەو هەموو تۆوە لەنێو جەرگی گەل
ئاوی خوێن دەدرێ هەتا ڕۆژی هەل

ڕیشەکەی ڕۆدەچێ، بەردی عەرزێ
دەکرۆژرێ و دەشکێ و دادەڕزێ
وردە-وردە لە هەرێمی بایەر
دێتە بوون باخی گوڵی سوور-پەروەر

سا دەخیل: شۆڕە کوڕانی سابلاغ
چاك بەلادا کەن و پێکبێنن باغ

شارەکەی دایکی «هەژار» و «هێمن»
پڕ لە شانازییە چەقڵەی دوژمن

ئەو «هەژار»ەی دڵی پڕ بەستەی جوان
من گوڵۆچن ئەوە خاوەن خەرمان

پێی دەڵێم بەسیەتی نووستن هەستە
تاکو کەی مەستی ئەوینی بەستە

یادی ئەو رۆژە بەخێر سەربەست بووین
بە هەوای ”جمهوریەت“ سەرمەست بووین

پەرچەمی ”جمهوری“ خەڵکی هەڵبوو
سەرەتای رۆژی ژیانی گەل بوو

داخەکەم ئەهرەمەنی زۆرداری
هەم دیسان رۆژی گەلی داشاری

غایەتی رەسمی خەبات هەروایە
شۆڕش هەستان و شکانی تیایە

هەر خەبات هەڵدەگرێ و هەم دەشکێ
ئاخری دوژمنە پشتی دەشکێ

# ویڵ ئەبم

خاڵە ڕێبواری خەیاڵم هەستە
بۆنی خوێنە دڵەکەم پێی پەستە

یادی پیرۆزی شەهیدانی تر
سینگ ئەکات کەیلی هەناسەو دڵ پڕ

کاکە داریوش“ و شەهیدانی لهۆن
گشت ڕەفیقانی خەباتی سمکۆن

هەرکەسێ مردووە دەرکێ پۆڵا
لە حەنای زوڵم و دزێوی بەسرا

بۆ ئەمانە هەموو شیعری خوێنین
بە گەرووی گەرمی تفەنگ ڕاسپێرین

هێزی خەڵکی لە گەرووی چەك ڕادێ
کە دەڵێ: وردبێ قەڵای «شەدداد»ێ

لە کەژی ”قەندیل“ەوە بۆ ئێران
هەورە گرمێکی سڵاوی کوردان
ڕاسپێرینەوە لەجیاتی سوپاس
لە هەڤاڵی عەرەب و تورك و فارس

خەڵکەکان دەس لەمل و یەکگرتوون
دژی ”ئیمپریالیزم“ تێهەڵچوون

وردە وردە هەموو کانیاوی وڵات
دەبنە چۆم، دەچنەوە دەشتی ئاوات

هەربینا یەکێتی خەڵکانی هەژار
هەم هەڵیساندووە لافاوی پار

ڕەوڕەوەی شۆڕشی گەل کەوتە پەلە
سەری زۆردار، لە خوێن کەوتە مەلە

ڕۆژی ڕووناکی بەهاری هەموو گەل
سەرکەوێ و دەرکەوێ لە ئاسۆی کەل

# خەونی سوور

لە مەزرایان،
لە بەر باران،
لە کوچەی تاریکی شاران،
لە لا کۆلانی دێهاتان
لە کێوان دەشتان، سەحراتان،
دەنگێکی بەرزم دێتە گوێ
خەونم دیوەوگوێم دەزرینگێ
لەوەی دەیبیستم، دەیبینم
خەونی کاکم دێتە بیرم...
لە سەرو دەستی لە گۆ چوو
یان لە خونچەی سەرما بردوو
چیم گوت؟ باسی خونچە؟ نا گیان
گیانی ڕەقبووی لەنێو بەفران
گریانی خوشکم بۆ بابێ
کە ئیدی نان دەری نابێ
مەیتی ڕەقبووی بابی نازدار
فرمێسکی «عەبۆلە»ی هەژار
بێ دەرەتانی و بێ نانی
تەنیایی و بێپشتیوانی
لە زەردی جلی ژاندرمە
کە دێن، پۆتین گرمە-گرمە
دەخۆن مریشك
نا! کەوشی کوڕ
یان سەڵتەی کچ
دەشکەن سمڕ

ئیجارەی مالیك؟! یا تاڵان؟!
دەبڕن مانگا و مەڕ لە ماڵان
لەوەی دەیبیستم، دەیبینم
خەونی کاکم دێتە بیرم...
لە گوڵ کە ناپشکوێ ورۆژ
لەچاوی من و گەل و هۆز
لە بەهارێ کە بارانی ژەنگە و
وشکیشی، بێ نانی
لە هاوینی بێخەرمانم
ئیجارە چۆن دەم؟ نازانم!؟
لە کرێکاری سەرجادە
کە موهەندیس کرێ نادا
قاچاخچیگەڕی؟! کردوومە؛
بە تاریکە شەو زۆر چوومە.
گرتمیان و زیندان و شەق؛
پارەم نەبوو زیندانی ڕەق.
دەسمایەم نییە بۆ دوکان؛
ئیتر چۆن بچم بۆ بۆکان!؟
کاکم کوژرا لە جەڵدیان
لەسەر وەی گوتبووی: ئاغا گیان
ئیجارەکەم دا بە فیشەك
ناردوومە بۆ «عەوڵا»ی بێچەك
دێتە خەونم هەموو شەوێ
دەقراسکێنی وەکو کەوێ
یا وەك هەوری دە بەهارێ

هەزاران قسەی لە زاری
لێی تێناگەم دەڵێ: ڕۆڵە
چەك بگووشە بە پەنجۆڵە
چەکم لێ کەوتووە بێناز
ئایساندوومە ئاگری ساز
ئاگرەکەم ئاگری سوورە
لە ئاغاو ئەمنیە تەندوورە
لەگەڵ بۆرە پیاوی شاری
هەموو فەقیرو هەژاری
لە هەموو دێیەك، مەزرایە،
لەسەر جادە، لە کارگایە،
لە مەکتەبی دە منداڵان،
لە گشت جێگای زوڵم و تاڵان،
یەك بن بشێلن ڕێگایە
کە ئاواتی هەموو لایە
یەك بن! بیشێلن؛ پتەو بێ!
دەبێ ڕێگاکە هەر هەو بێ!
ڕێگاکەم زۆر سەخت و دوورە.
دەست دە چەك؛ لێیان مەبوورە!
ئەمن گوللەی خۆمم تەقان
هانێ چەك؛ هانێ! برا گیان!
من ئاگری خۆمم کردەوە
تۆش بێ بە دەست و بردەوە
تەعبیری خەونان نازانم

ئاگر بەردەداتە گیانم
هەر دەڵێ و هەر من تێیناگەم
دەڵێ: «مەڵێ سەختە ناگەم
مەڵێ دەربەند بەرد و بەرزە
ئێمە بەبێ ترس و لەرزە
بە یەك هەنگاو چووینە سەرێ
چەندە جوانە دەشت و دەرێ
وەك شەپۆلی لە دەریایە
هەتاوی سوور لە چیایە»
بریا زانیبام تەعبیری
مەلایان ناکەن تەگبیری
هەرزە وێژانی سەر ڕووتیش
دەیخەنە ناو قافیەو کێش
تەعبیری ئەو ئاگرە سوورە،
ڕێگاکە کە سەخت و دوورە
بۆرە-پیاوانی رانگ شڕ
کە بە چەك و شەڕ و سمڕ،
سەردەکەوون لە چیایان،
دەبینن دەشت و دەریایان
یەکبوون، شێلان، پتەوکردن
ئەوجار بە چەك هەڵمەت بردن،
بریا زانیبام تەعبیرێ
داخوا تۆ دەکەی تەگبیرێ؟

# برارۆ

وەك مۆنجی دەریا شەپۆلی عەشام
دوو برا، بەستراوون لە داری ئیعدام
دڵی خەڵك پڕە؛ لێوان لە تاسە
چاو پڕ لە فرمێسك سنگ پڕ هەناسە
جەلاد بانگ ئەكا: چاویان ببەستن
یەك دەگوڕێنێ
چاوی من؟
بۆچی گوایە ئەترسم لە گوللەی دوژمن؟
یەك دەڵێ:
باشە؛
چاوم ببەستن.
کاکەی دەناڵێ
لالایم لاڵ کەن؛
ئابڕوو چوونە!
مەرگ ئەتترسێنێ؟

دەڵێ:
براکەت لە دەورت گەڕێ
بە منەوە دیوتە چوونە سەنگەرێ
ئەزانی مەرگیش من نابەزێنێ
بەلام، کوێرایم دایێ.
برارۆ:
جوانە مەرگی تۆ!
گرمەی موسەلسەل بێدەنگی کردن...
هاواری گەروو، ڕژایە خوێنیان
خوێنی خەس و گەش لە تەختی مەیدان
نووسی:بژی کورد: بەرز بێ کوردستان!

# سڵاوێک لە عاشقانی ئازادی

ئەم کۆمەڵە شیعرەم، لەو شیعرانەم هەڵبژاردووە کە کردەی ئەم شۆڕشەن. پێشیینەی شیعریم دەگەڕێتەوە بۆ کۆنتر؛ بۆ ساڵەکانی 1340 (1960ەکـان). کۆمەڵە شیعرێکم لە ساڵی 1359 بڵاوکردەوە بەناوی: "گەشتێ لە کوردستان" کە کردەی بزووتنەوەی ساڵی 1346-1347ی کوردستان بوو. شیعرەکانی تری ئەو ماوەیەم بڵاونەبوونەتەوە هەڵبەستەکانی ئەم چەپکەی دەیبینن دوو بەشن: سرودەکان و شیعرەکانی تر سرودەکانی ئەم چەپکە، لە کوردستان لەسەر زارانن و لەنێو جەماوەردا، بەرین بڵاوبوونەتەوە. وەکو سرودەکانی کۆمەڵەش ناسراون.

لە شیعرەکانی تریش هەندێکیان لە میهرەجان و کۆبوونەی جەماوەری و لە گۆڤارو لە بڵاوکراوەی شۆڕشدا و لە دەنگی شۆڕشی ئێرانەوە بڵاوکراونەتەوە هەڵبەستەکانی ئەم چەپکەیە، هەروەک دەبینن، لە نزیکەوە جێ مۆری شۆڕش و ئاڵوگۆڕی ئەو شۆڕشەی پێوە دیارە و بە دانستە تێکۆشاوم شیعرەکانم ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر لە ڕوانگەی ئێمەی کۆمۆنیستەوە بڕوانێ.

ڕەخنەگری و نامەو پێشنیاری ئێوە خوێنەرەوەی دڵسۆز و بە دەربەست، بۆمن یەکجار جێگای سوپاسە.

**ڕێبوار**

**گەلاوێژی 1363 - ئۆگەستی 1984**

# ئەنتەرناسیۆنال*

هەستن! ئەی هۆزی بەشمەینەتان
دیلانی برسیەتی دنیا
لە تەنوورەی بیروباوەڕمان،
قرمژنی تریشقە راسا
تەنوورەی ئاخرینە هەستن
با هەڵپێچین دەورەی کۆن
ڕابین و ژێرەوژوورکەین جیهان،
ئێمەی "هیچ" بین بە "گشت"، ئەی کۆیلان!

ئاخرین شەڕە، شەڕی سەر و ماڵ
با یەکگرتووبین هەڤاڵان
بە ئەنتەرناسیۆنال
ڕزگار دەبێ ئینسان

دەسەڵاتدار ڕزگارمان ناکەن
نە شا، نە شێخ، نە ئاسمان
با خۆمان بۆ ڕزگاری ڕابین
ئەی خێڵی بەرهەمهێنەران
ڕزگاری گشتی بێ و ڕەهاکەین
گیان لە بەند و ماڵ لە تالان
خۆمان ئاگر خۆشکەین و بوکتین
بە گەرماو گەرمی ئاسمان

ئاخرین شەڕە، شەڕی سەر و ماڵ
با یەکگرتووبین هەڤاڵان
بە ئەنتەرناسیۆناڵ
ڕزگار دەبێ ئینسان

ئێمەین کرێکاران و وەرزێران
کۆمەڵی مەزنی زەحمەتکێش
هەر بە ئێمە دەبڕێ جیهان
تاکەی بۆ تەوەزەلی خوێنڕێژ؟
بەڵام ئەمڕۆ و سبەی، ئەی هەڤاڵان،
هەر کە فەوتان قەل و داڵان،
هەتاوی گەش هەتا هەتایە
تیشك داوێژێ بۆ ئینسان!

ئاخرین شەڕە، شەڕی سەر و ماڵ
با یەکگرتووبین هەڤاڵان
بە ئەنتەرناسیۆناڵ
ڕزگار دەبێ ئینسان

**ڕێبەندانی 1359**

**شوباتی 1981**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەندان (ناسری ڕەزای، نەجمەدین غوڵامی، کاڵێ ئاتەشی، ڕەزا بچکول)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# بڕیاری یەکی ئەیار*

پۆنگی خوارد مۆنجی دەریای کرێکار
دژی سەرمایە، ئەوەڵی ئەیار!
سوور بوو بە خوێنمان شەقامی شاران
شەقی برد قەڵای سەرمایەداران
زنجیری کۆنی هەزاران ساڵە
دەپچڕێ و جادوو حوکمی بەتاڵە

کرێکارم
هاتوومە مەیدان
ئەڵێم، هەرکارە ئینسانی خوڵقان
سەد ساڵە ئەڵێم،
ئەمە بڕیارە
بڕیاری ڕۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەکگرن؛
چەرخی چارەنووس لەدەست خۆگرن!

بەرهەمهێنەری بژێوی ئینسان
پرۆلیتاریام چینی شۆڕش-وان
سەد ساڵە سەد جار، کەوتم و هەستام؛
دیسان قایمتر هەستام و وەستام.
شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبەری خوێنین
شۆڕشی من بوو ڕێبازی لێنین
کرێکارم؛
هاتوومە مەیدان
ئەڵێم، هەرکارە ئینسانی خوڵقان
سەد ساڵە ئەڵێم،

ئەمە بڕیارە
بڕیاری ڕۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەکگرن؛
چەرخی چارەنووس لەدەس خۆگرن!

تەنوورەی ئاخر هەستاوە هەستین
چی دوژمنانی کۆپەرستین
پشتم بەرمەدەن دەست دەنە دەستم
بەرەو سۆسیالیزم لووزەو ئەبەستم
سنوور نامگرێ لەسەر ئەم ئەرزە
سەرمایەداری دێنمە لەرزە

کرێکارم؛
هاتوومە مەیدان
ئەڵێم، هەرکارە ئینسانی خوڵقان
سەد ساڵە ئەڵێم،
ئەمە بڕیارە
بڕیاری ڕۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەکگرن؛
چەرخی چارەنووس لەدەس خۆگرن!
خەباتی شێلگیر کارخانەو مەزرا
لەژێر ڕابەری پێشەنگی خۆما
ڕێ دەخەم چەرخی دەوڵەت دەشکێنم
دەوڵەتی تازەی کرێکار دێنم
هەموو ساڵێکیش ئەوەڵی ئەیار
هەڵیدەبژێرم گشت دەسکەوتی پار
ساڵ بە ساڵ زەینم ڕۆشنتر ئەکەم
لە بۆ ڕابەری خۆم حازر ئەکەم

کرێکارم؛
هاتوومە مەیدان
ئەڵێم، هەرکارە ئینسانی خوڵقان
سەدساڵە ئەڵێم،

ئەمە بڕیارە
بڕیاری رۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەکگرن؛
چەرخی چارەنووس لەدەس خۆگرن!
ئەمپریالیست و فرسەت پەرستان
کە پێیانوایە مێژوویان وەستان
بلەرزن! گەشەو رووناکە ئاسۆ
یەکدەگرین لە دەور ئاڵای سووری خۆ
بەلافاوی سوور هەروەك بەهاران
جیهان دەکەینە جەژنی هەژاران
کرێکارم؛
هاتوومە مەیدان
ئەڵێم، هەرکارە ئینسانی خوڵقان
سەد ساڵە ئەڵێم،
ئەمە بڕیارە
بڕیاری رۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەکگرن؛
چەرخی چارەنووس لەدەس خۆگرن!

**یەکی ئەیاری 1981**

**11ی گوڵانی 1360**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# پێشمەرگەی کۆمەڵە*

ئاگری شۆڕشمان
دوژمنی ترسان
هێرشی هێنا
سەر کوردستان

لە قوڵایی دڵی
زەحمەتکێشان ڕا
هەڵیانکرد ئاڵا
هەستان ڕاسان

پێشمەرگەی کۆمەڵە وەك پۆڵان
لەشکرێکی ئەرتەشی سووری کرێکاران
ڕێبواری ڕێبازی
یەکگرتن تێکۆشان
بۆ ڕزگاری گشتی
کرێکاران

دژی ئەمپریالیزم
بۆ ئازادی ئێران
بۆ مافی چارەنووس
بۆ میللەتان

پێشمەرگەی کۆمەڵە وەك پۆڵان
لەشکرێکی ئەرتەشی سووری کرێکاران
هۆ زەحمەتکێشی کورد
کۆوەبن لە دەوری
پێشەنگی کرێکارانی
کوردستان

هەر چینی کرێکارە
نیزامێکی نوێ
دەتوانی پێکبێنی
بۆ گشت جیهان

پێشمەرگەی کۆمەڵە وەك پۆڵان
لەشکرێکی ئەرتەشی سووری کرێکاران
وەك ئاگر بەردەبن
لە گیانی دوژمنان
ئەرتەشی خوێنمژان
تێکدەشکێنن

تا رۆژی ڕاپەڕین
پێکبێ هێزی تەیار
حوکمی سەرمایەدار
بڕوخێنن
پێشمەرگەی کۆمەڵە وەك پۆڵان
لەشکرێکی ئەرتەشی سووری کرێکاران

تێکدەشکێنێ ستەم
شۆڕشی دیموکراتیك
ڕێگای بۆخۆش دەکا
بۆ سۆسیالیزم

بێ وەستان، یەکجاری
بۆ پێشەوە، بێباك
تا لووتکەی ڕزگاری
تا سۆسیالیزم

پێشمەرگەی کۆمەڵە وەك پۆڵان
لەشکرێکی ئەرتەشی سووری کرێکاران

**جۆزەردانی 1360**

**حوزەیرانی 1981**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# سروودی ژنانی تێکۆشەر*

شۆڕشە هەستن، راپەڕینە
ئەی ژنانی گشت وڵات
شان بە شانی پیاوان هەستن
بێنە ناو ڕیزی خەبات

ئێمەین کە نیوەی کۆمەڵین
وێنەی باڵێکی مەلین
لە کارو شۆڕش سڵ ناکەین
ژنانی تێکۆشەرین

لەڕێی سامدارو پڕ خەتەر
نەترسین و کۆڵنەدەر
لەچی مەیدانا حازرین
کارخانەو مەزراو سەنگەر

کۆیلەتی ژن، ژێردەستەیی،
چەوسانەوەو هەژاری،
بە یەك نیزامەوە بەندە
حوکمی سەرمایەداری

ئەو نیزامەی حوکمی ڕەشی
شەوەی ڕەشی وڵاتە
راپەڕین تێکی بشکێنین
شۆڕشەو هەلی خەباتە
کاروانی خەبات بۆ ژنان

هەرگیز ناگاتە مەنزڵ
هەڵمەتە! تاکەی دەستەوستان؟
تاکەی دیلی و ترس و سڵ؟!

ئاسۆی گەشمان ڕزگارییە
بۆ گشت نەتەوەی ئینسان
سۆسیالیزمە موژدە دەری
ڕووناکی و ژینی یەکسان

ئێران سەرانسەر پڕ دەکەین
لە خەباتی ڕێی مەبەست
لە کوردستان ژن و پیاومان
پێشمەرگەین و چەك بەدەست

سەنگەرو مەیدان لە شاخ و شار
پڕکەین لە هەزاران هاوار
با هەربژی کوردستانی
شۆڕشگێڕ و خودمختار

**ئۆکتۆبەری**

**1982**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی، ژنانی کۆمەڵە، تیپی بانگەواز)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# سروودی کاک فوئاد

فوئاد، ڕۆڵەی ئاگر و خوێن
تۆوی شۆڕش لە هەموو شوێن
وەستا شێرانە، بەرامبەر
پەلاماردەر چەشنی سەنگەر
گێڤارای کوردەواری بوو
لە هەموو شوێن دیاری بوو

دەمێ یەکیەتی جووتیاران
دەمێ کۆڕی زەحمەتکێشان
دەمێ سەنگەر دەمێ مەزرا
کوڵ هەڵگرتن لەگەڵ فەلا

کێ بێ وەك برووسکە وابێ
کوردستانی پێ ئاوا بێ
نەك هەر کوردستان، گشت ئێران
هەموو تووڕەو تازیە-باران
بۆ فوئادێ کە سەنگەرە
یادی لە دڵمان ڕابەرە

دەمی یەکیەتی جووتیاران
دەمێ کۆڕی زەحمەتکێشان
دەمێ سەنگەر دەمی مەزرا
کۆڵ هەڵگرتن لەگەڵ فەلا

***

شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان
چرای ڕێی دەروون پڕ ئێشان
وەرن یاران بە شینەوە
ئاوا بیلاوێنینەوە:
کاك فوئاد ئەی شەهیدی ژیر
شۆڕشگێڕی پاك و پەیگیر

***

دەمی یەکیەتی جووتیاران
دەمێ کۆڕی زەحمەتکێشان
دەمێ سەنگەر دەمی مەزرا
کوڵ هەڵگرتن لەگەل فەلا

***

شەرت بێ جێگات بگرینەوە
سەنگەرەکەت پڕکەینەوە
بەڵام سەنگەر پڕن یاران
ئەڵێی گوڵن لە بەهاران
شاخ و کێو پڕ لە پێشمەرگە
دوژمن نسیبی هەر مەرگە

**گەلاڕێزانی 1358**

**ئۆکتۆبەری 1979**

# سرودی کاک شوان*

شەو نەبوو تەقەی تفەنگ
نەسمێ جەرگی شەوەزەنگ
خەڵکی نەڕژێنە کۆڵان
بەرەوپیری کاک شوان
سرودێک لەسەر لێوان
بەخەیربێتەوە بۆلامان
کاک شوانی قارەمان
کاک شوانی قارەمان

***

بەڵێ شەوانی ئەشکان
نرکەی شێرانەی شوان
ئەیوت منم شوانم
پێشمەرگەی ڕەنجبەرانم
شەقڵی شەوان ئەشکێنم
دوژمنان ئەتارێنم
شەقڵی شەوان ئەشکێنم
دوژمنان ئەتارێنم

***

مەرگ لەبەرچاوتان سووک بوو
ئاسمان بۆتان بچووک بوو
بەڵام لاڵ بێ ئاسمان

بۆ شا باڵی تۆی شکان!؟
کاك شوانی قارەمان
پێشەنگی پێشمەرگەکان
کاڵ بووەوە چاوی ڕەشمان
بۆ مەرگی تۆ کاك شوان

***

زەحمەتکێشی شۆڕشگێڕ
ڕۆڵەی جەسوور و دلێر
پێشمەرگەی ناوت بەرزە
دوژمن ئەخاتە لەرزە
کورد لە گشت لایێ ڕووسوور
لە وڵاتی نزیك و دوور
ئێوەن هۆی سەربەرزیمان
لە سەرتاسەری ئێران

***

وەك هەڵۆ بە لارەباڵ
هەڵمەتاندا دا بۆداڵ
داڵی خوێنخۆری دوژمن
کە دەهات بۆ کورد کوشتن
تێکشکاو تێك چەماوە
هێزی دوژمن لەوناوە

***

مەرگ لەبەرچاوتان سووك بوو
ئاسمان بۆتان بچووك بوو
بەڵام لاڵ بێ ئاسمان
بۆ شا باڵی تۆی شکان!؟
کاك شوانی قارەمان
پێشەنگی پێشمەرگەکان
کاڵ بووەوە چاوی ڕەشمان
بۆ مەرگی تۆ کاك شوان

***

لە لوولەی تفەنگەوە
لە مەیدانی جەنگەوە
نرکەی شێرای شوان
دیسان لە دەشت و دۆڵان
یاخۆ لە کوچە و کۆڵان
کووچەی سنەی قارەمان
دەلەرزێنێ ئاسمان
دەلەرزێنێ ئاسمان

***

مەرگ لەبەرچاوتان سووك بوو
ئاسمان بۆتان بچووك بوو
بەڵام لاڵ بێ ئاسمان
بۆ شا باڵی تۆی شکان!؟
کاك شوانی قارەمان

پێشەنگی پێشمەرگەکان
کاڵ بووەوە چاوی ڕەشمان
بۆ مەرگی تۆ کاک شوان

***

چۆن فوئاد شەهیدی ژێر
سەرتۆپ بووەو ڕۆشنبیر
کاک شوانی خەباتکار
سەرتۆپێک بوو، کرێکار
کاک شوان شێری سەنگەر
ڕۆڵەی فەرەنجی لەبەر
کاتێ دەچیتە سەنگەر
تا سەرکەوتن نایەتەدەر

***

مەرگ لەبەرچاوتان سووک بوو
ئاسمان بۆتان بچووک بوو
بەڵام لاڵ بێ ئاسمان
بۆ شا باڵی تۆی شکان!؟
کاک شوانی قارەمان
پێشەنگی پێشمەرگەکان
کاڵ بووەوە چاوی ڕەشمان
بۆ مەرگی تۆ کاک شوان

**سێپتەمبەری**
**1980**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (جەمال موفتی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# سرودی مام رەحمان*

جەوانی ڕابوورد بە ڕەنج و بەکار
بەرزو پیاوانە، پەڵکی سپیدار
بە ڕەنجی خۆیی و ماڵ و خێزانی
ڕۆژ تا ئێوارەو شەو تا بەیانی
دنیای کردبوو بە خۆشی و سێبەر
بەڵام بۆ ئاغاو بەگی چەوسێنەر

مام رەحمان پیری پێشمەرگەی ئازا
پەیگیر پڕکینە، لە زاڵم راسا
سێبەری ئەخست بەسەر هەژارا
چرایە ڕووناك لەڕێی جووتیارا
ئازاو بەغیرەت بەرامبەر زۆردار
برای بڕپڕەی پشتی کرێکار

خۆی و منداڵ و هاوماڵەکانی
گشت بێبەری بوون لە ڕەنجی شانی
بۆیە وا هەستاو دەستی دایە داس
تا ژێرەوژوور بێ، دەوری حەق نەناس
هێندەی دادڕێ پەردەی فێڵی شا
دەوڵەت لێی ترسا و لەدێ دەرکرا

مام رەحمان پیری پێشمەرگەی ئازا
پەی گیر پڕکینە لە زاڵم ڕاسا
سێبەری ئەخست بەسەر هەژارا
چرایە ڕووناك لەڕێی جووتیارا
ئازاو بەغیرەت بەرامبەر زۆردار
برای بڕپڕەی پشتی کرێکار

دەورە گۆڕاوە، شۆڕشە ئێستا
دەستی دایە چەك پێشەنگی فەلا
ئاگری خەبات لە نزیك و دوور
هەڵگیرسا و ڕاسان پێشمەرگەی جەسوور
کە ڕەفتووسارال هەتا مەریوان
زاڵم زەلیل بوو بەدەس جووتیاران

مام ڕەحمان پیری پێشمەرگەی ئازا
پەی گیر پڕکینە لە زاڵم ڕاسا
سێبەری ئەخست بەسەر هەژارا
چرایە ڕووناك لەڕێی جووتیارا
ئازاو بەغیرەت بەرامبەر زۆردار
برای بڕبڕەی پشتی کرێکار

سەرتاپای لەشیان کینەی زۆرداران
بە تووندی تیرێك دەرچێت لە کەوان
لەوپەڕی مەیدان بەگژیاندا چوون
خۆی و ڕۆڵەکەی وەك شێر شەهید بوون
حەماسەیەك بوو مەرگی باب و کوڕ
خەڵکی ئەو دەورە خۆیان نایە قوڕ

مام ڕەحمان پیری پێشمەرگەی ئازا
پەی گیر پڕکینە لە زاڵم ڕاسا
سێبەری ئەخست بەسەر هەژارا
چرایە ڕووناك لەڕێی جووتیارا
ئازاو بەغیرەت بەرامبەر زۆردار
برای بڕبڕەی پشتی کرێکار

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (جەمال موفتی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# ئاسۆی سۆسیالیزم*

لە شیعری «دوو پەیکەرە» هەڵبژێردراوە

ڕۆڵەی شیرینم، گەنجەکەم
بەرامەی تاڵی ڕەنجەکەم
پەیکەرت بەرزە نابەزێ
وەك سوارێك كە دانابەزێ
بەڵام سەربەرزم بە بەرزیت
دڵ قایمم کە نەبەزیت

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکا
لە مەیدانا لە زیندانا
بە شکۆی پەیکەرە تانا،
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

لە ژینی بەشمەینەتمانا
لەژێردەستی زاڵمانا
لە کۆت و زنجیر بەولاوە
چیت هەبوو؟ چیت لە دەستداوە؟
منیش ڕەنجم، کوێرەوەریم
تاڵیم، دەردم، دەربەدەریم،

زیاتر نابێ بە مەرگی تۆ
بۆیە وتم ئەرێ، بڕۆ!
بڕۆ، بۆ ئاوڕدانەوە،
بیرە-بیرە و بادانەوە!
هەرچەند داخە لە دڵمانا
نیت لە کۆڕی هاوڕێکانا

بەڵام تینی لە لەشیانا
ورشەیت لە چاوی گەشیانا
وزەیت لە پەلاماریانا
سروودیت لەسەر زاریانا

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکانا
لە مەیدانا لە زیندانا
بە شکۆی پەیکەرە تانا،
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

**هاوینی**

**1983_1362**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# سڵاو لە پێشمەرگە*

سڵاوی گەرمی دڵی پڕ
هومێدی مەت پێشکەش
پڵنگی هەردی وڵات، ئەی
هەڤاڵی پێشمەرگە[1]
لە دەوری دەست و تفەنگت
گەڕێم کە ڕۆژی خەبات،
لە ئاستی هەڵمەتی
تیژت، چ ناگرێ بەرگە

ئەو ئێستە تۆی لە شەوی
تار مۆمی هەڵگیرساو؛
لەنێو دڵی شەوەزەنگا،
وەکو گرێك ڕاساو!
کە ڕاتشەکاندووە ئاڵا،
بە دەستی خاراوت
دەگەی لە کۆسپ و
بواران، بە هەستی پاراوت

ئەتۆی کە پێشڕەوی
چینی مەزن کرێکاری
ئەتۆی دەکەی خەوی
چەوساوەکان بە بێداری
ئەتۆی کە دەنگی بڵاوی
فغانی زەحمەتکێش
دەکەیتە لاووك و ئاهەنگی
پێشڕەوی بۆ پێش

* ئەم شیعرە لە لایەن هەریەکە لە هونەرمەندان (ناسر ڕەزازی، مەرزییە فەریقی، صدیقەی محەمەدی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

---

1. هەشت دێڕی سەرەتای سەربەندی ئەم سروودە، هی چاوەیە، فاتح شێخ بە ناوی شیعری «پشکۆ»

# زەحمەتکێشان چەکداربن*

شارو لادێی کوردستان
سۆما هەتا کرماشان
پۆل پۆل هەزاران زەحمەتکێش
تاومان دایە چەك بێ ئەندێش
پێشەنگی جەنگاوەرین
ئاڵا هەڵگر، کارگەرین
شیعارێك لەسەر زارمان:
بۆ ڕزگاری کوردستان

زەحمەتکێشان چەکدار بن
ڕووبەڕووی ستەمکار بن
بە دەستی خۆتان ڕزگار بن
دەبا هەر خۆتان سەردار بن
ئەرتەش، پۆلیس و پاسدار
گۆپاڵن بۆ سەرمایەدار،
سەرکوتگەری ڕەنجدەرانن
داگیرکەری کوردستانن

دەبا داگیرکەر تووناکەین
خود موختاری بەرپاکەین
خۆی سەرەتای ئازادییە
بۆ گەیشتن بەو شادییە
زەحمەتکێشان چەکدار بن
ڕووبەڕووی ستەمکار بن
بە دەستی خۆتان ڕزگار بن
دەبا هەر خۆتان سەردار بن
هۆ، هەموو چەوساوەی ئێران
ئاڵای ڕێگاتانە ئاڵامان

با ئەرتەشی گەل پێکبێنین
تا ستەمگەر تێک بشکێنین
لە دژی سەرمایەداری،
سەرچاوەی گشت ستەمکاری،
وەرن با ڕابین یەکجاری
بەرزکەینەوە شیعاری:
زەحمەتکێشان چەکدار بن
ڕووبەڕووی ستەمکار بن
بە دەستی خۆتان ڕزگار بن
دەبا هەر خۆتان سەردار بن
ئاسۆمان گەشە ڕوونە
لە تاریکی دەرچوونە
هەر کرێکار دەتوانێ
نیزامێکی نوێ دانێ،

ئەرتەشی سووری کارگەربین
فەوتێنەری چەوسێنەربین
تا سۆسیالیزم بەرپاکەین
ئینسان یەکجاری ڕەها کەین
زەحمەتکێشان چەکدار بن
ڕووبەڕووی ستەمکار بن
بە دەستی خۆتان ڕزگار بن
دەبا هەر خۆتان سەردار بن

**گەلاوێژی 1362**

**ئابی 1983**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# حیزبی خەباتکار*

لە جەرگەی شۆڕشی ئێرانەوە
لەم گرو کڵپەی کوردستانەوە
لەبۆ یەکگرتن خۆ تەیاردەکەین
بانگەوازی گشت کرێکار دەکەین

دارێژین حیزبی خەباتکار
لە پێشڕەوانی کرێکار

سەرمایەداری دێوەزمەی شەوە
سەرچاوەی هەموو مەینەتێك ئەوە
بۆ ڕووخاندنی سەرمایەداری
دونیای بێ ستەم ڕۆژی ڕزگاری

دارێژین حیزبی خەباتکار
لە پێشڕەوانی کرێکار

لەم کوردستانەی مەڵبەندی شۆڕش
قەڵاین وەستاوین بەرامبەر هێرش
پەیگیر بێوچان بێ حەسانەوە
بێ باك لە مەرگ؛ بێ گەڕانەوە
دارێژین حیزبی خەباتکار
لە پێشڕەوانی کرێکار

ڕوو لە ئەستێرەی سووری سۆسیالیزم
بەرەو تێکشکانی ئەمپریالیزم

لەسەر ڕێبازی ئۆکتۆبەری مەزن
بۆڵشویکانی هەرگیز نابەزن

دارێژین حیزبی خەباتکار
لە پێشڕەوانی کرێکار

با ملیۆن-ملیۆن ڕۆڵەی کرێکار
یەکگرتوو لەگەڵ ڕەنجدەری دێ و شار
ئامادەبین بۆ شەڕی سەرو ماڵ
لەسەر ڕێبازی ئەنترناسیۆنال

دارێژین حیزبی خەباتکار
لە پێشڕەوانی کرێکار

**1362**

**ئەیلولی 1983**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# سروودی پێشڕەو

برۆ، بپرسە لە شاخی بڵندی کوردستان
کە هەر بووەو هەتا بووە سەنگەر بووە و مەتەرێز،
بپرسە؛ کامە نەزیلەی لەبیرە ئاوابێ!؟
سرودی شۆڕشی نوێ،
سرودی عەشق،
گەڕابێتە گیانی سەنگەرەکان؟
چونکە کێوی کۆنی کورد
لەبیری نایە سرووودێکی وا پاراو
وەکو سرودی گەرووی پڕ-گڕی هەزاران لاو
لە هیچ هەورە برووسکێکی خوڕترین باران:
*

سرودی کۆمەڵەیە
ڕاشەکێنەری ئاڵا
کە ناخی دڵی پڕ جەخاری چەوساوان
گیانی گەرمی سەنگەرەکان
پڕە لە عەشقی بەرینی بەتینی ژینی نوێ
وە دەستی چەوساوان،
بە چەپڵەڕێزی سەدان سەد هەزاران فیشەك.
بە پیری جەژنی شۆڕشی گەرمی گەلانەوە دێ
وە زاری چەوساوان،
کراوەیە لە حەنای زوڵم و زۆری دێرینە
وە زاری شاعیری عاشق پڕە لە گۆرانی
گەرووی پڕە لە سرودی سلاوی ئازادی

دڵی پڕە لە هەزاران بروسکەی شادی
بڵێ بە چینی کرێکار
بەسەرچوو کاس و کەساسی
وەرە
وەرە پڕی مەیدان
وەرە بە چەشنی کاوە هەڵێنە بەیاخی ئازادی
وەرە چەکوش بوەشێنە
بە کوتك بیپژێنە
مێشکی ئەژدەهاکی سەرمایە
کە حوکمی مێژووە، تۆ
چینی پێشڕەوی
وایە
*
بەیاخی مارکسە "پێشڕەو" کەوا هەڵیدێنین
بەڕێی ڕوونی خەباتا بە مەشعەلی لێنین
سروودی ئاگری نەورۆزە وا بەهار دێنین
وە گرد و کۆکەری لەشکر
بۆ سازدانی
هوروژم و هەڵمەتی ئاخر
کە پێشمەرگە
ئەوا بووە بە هەڵگرێکی مەشعەلی نوور
بە ڕێی ڕوونی خەباتا
بە شوێنی "پێشڕەو"دا
لەشکرێکی ئەرتەشی سوور!

**بەهاری**

**1981_1360**

# دوو پەیکەرە

تێکستی سروودی «ئاسۆی سۆسیالیسم»
لەم شیعرە هەڵبژێردراوە.

دڵەی فێری خورپەو خەتەر
دڵەی گەنجی ئامانج پەروەر
بووەتە پەیکەر-تا شێك و دێ
دوو پەیکەرەم بۆ داتاشێ

پەیکەرێك لە دەروازەی شار
شەهیدێکی ڕاوەستاوە
پێشمەرگەیەکی کرێکار
دوژمن هێندە لێی ترساوە

بۆ چاو-ترسانی خەڵکی شار
تەرمی لەسەر ڕێ داناوە
کەچی، بووەتە شمڵی هەستان؛
دژ بە زوڵم و زۆر ڕاوەستان!

بەرامبەر بەو، بەژنێکی بەرز
پەیکەرەی ڕەنج، کێوی سەر ئەرز
پەیکەرەی دایکی پێشمەرگە
ڕەنج-کێشاو و دڵ بە بەرگە

قەسەی شیعراوی لە زارە
ئەسرینی لەسەر رووخسارە

نیگای شەوقی بروسکەیە
دەنگی نرکەی تریشقەیە

وەك پەیکەرەی رەنجی ئینسان
دەگرمێنێ لەگەل باران:

رۆڵەی شیرینم، گەنجەکەم
بەرامەی تاڵی ڕەنجەکەم
پەیکەرت بەرزە نابەزێ
وەك سوارێك کە دانابەزێ

ئەگەر بەسەر پەیکەرتا
ئاسمان بگری هەتا هەتا
کێو بنالێ و هەور شیوەن کا و
من سەر-شین بم، کەمە هێشتا؛

بەڵام سەربەرزم بە بەرزیت
دڵ قایمم کە نەبەزیت
لە ژینی بەش-مەینەتمانا
لەژێردەستی زاڵمانا

لە کۆت و زنجیر بەولاوە
چیت هەبوو؟ چیت لەدەستداوە؟؟
منیش رەنجم کوێرەوەریم،
تاڵیم، دەردم، دەربەدەریم،

زیاتر نابێ بە مەرگی تۆ
بۆیە وتم ئەرێ، بڕۆ
لەگەل کاروانی خۆش-ئاژۆ
لەگەل هاو-زنجیرانی خۆ

بڕۆ... بێ ئاوڕ-دانەوە،
بیرە-بیرەوبادانەوە

هەرچەند، داخێك لە دڵمایە؛
تەرمی شیرینت تەنیایە

نیت لە کۆڕی هاوڕێکانا...
بەڵام، تینی لە لەشیانا
ورشەیت لە چاوی گەشیانا
وزەیت لە پەلاماریانا
سروودیت لەسەر زاریانا

دڵەی شاگەشکەی سەرڕەۆم
دڵەی نەسرەوت و بێخەوم
دڵەی فێری خوریەو خەتەر
دڵەی گەنجی ئامانج پەروەر

لەبەر پێی پەیکەرەکانا
چەپکێك شیعری گەشی دانا

وتی پێیان: ئازیزەکان،
زاڵمان، تۆقیون لێمان

ستەمکاری جەلادەکان
شەوگاری رەشی خەفەقان
گەر بە قورسی کێوەکان بێ،
پڕ بەینی ئەرزو ئاسمان بێ

دەریای ورەی خەباتکاران
دەرەتانیان لێ دەتەنێ
لە جەسووری شۆڕە-لاوان
دوژمن ماتەو تەنگە زیندان

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکانا،
لە مەیدانا، لە زیندانا،
بە شکۆی پەیکەرەتانا

شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

## نامە
## بۆ دایکانی زیندانیەکان

خوشکی خۆشەویستی برات
سڵاوێکی گەرم و گەشی پێشمەرگانە
لە ڕێگای دووری سەنگەری شۆڕشی کوردستانەوە
پێشکەش ئەکەم؛

سڵاو ئەکەم
لەو دڵە میهرەبانانە
شەو تا بەیان
ڕۆژ هەتاوەکو ئێوارە
ئۆقرەو ئارامیان نەماوە
تەیری دڵیان
لەگەل دڵی پێشمەرگەکان
لەسەر هەموو زیندانەکان
پەرواز ئەکا
ڕۆڵەکانیان
ڕۆڵە قارەمانەکانیان
لە زیندانا
ئەدوێنن...
سڵاوێکی گەرم و گەش و پێشمەرگانە
هی من و گشت پێشمەرگەکان
لەو ڕۆڵە قارەمانانە

کە لە گەرووی دڕندەدان
لەوێش دیسان
دلێرانە، بەردەوامن
چنگاوشی دوژمنانن
دەروونی پڕ بڵێسەیان
ئاگر بەردەداتە زیندان.
خوشکی خۆشەویستی برات
ڕەنگە بڵێیت
هەر من هەژار
هەر من خەمبار
هەر من ئاوا و هەر من ئاوا

نە، دادە گیان؛
لەبیرت دێ؟ زەمانی زوو؟
کاتێ برات زیندانی بوو
کەم کەس بوایە
بیوێرایە
بە ئاشکرا بیپرسیایە؟!
کەم کەس بوایە
وەکو ئەمڕۆ
هاودەردتان بێ و
هاودەنگتان بێ؟!
بەڵام ئێستا
سەدان هەزار
دایکی ڕۆڵەو ڕۆڵەی دایك و

خوشكی براو برای خوشك و
هاوڕێی هاوڕێ و باوكی پیره
كه هاودەردەو هاودەنگتانەو
هاوزنجیره!

تەماشاكەن
وڵات هەمووی
دەریایەكی خرۆشاوە
تەماشاكەن
وڵات هەمووی
زیندانێكی پان و بەرینە جۆشاوە
تەماشاكەن
زنجیرەكان ئەوەندە توندكراونەوە
كەوتوونەتە قرچە-قرچی چڕانەوە
بۆیە ئەڵێم هاكا چڕان
بۆچی فرمێسك چاوی ڕەشتان كاڵ كاتەوە؟
سەرهەڵبڕن
دڵی پڕ لە ئومێدەواری بە دوارۆژ
دڵی پڕ لە خۆشەویستی ژینی سەربەرز
دڵخۆشی خۆش بدەنەوە
هەروەك كردووتانە، واكەن
چاكی هیمەت بەلاداكەن
چاوی دڵتان لەو رۆژە بێ
كاسەی سەبر لێوان ئەبێ
دەریا دیسان دێتەوە جۆش
لە بیرتانە؟

لەبیرتانە هاوارمان کرد:
«زنجیری زاڵم چڕا
بەخێربێیتەوە، برا»؟؟
لەبیرتانە زیندانیەکان ئازادکران؟؟
لەبیرتانە چ جەژنێك بوو؟؟
بۆچی دەستی دەستەوەستان
لە چۆکی خەفەت هەڵپێکان؟؟
سادەی هەستن
سەرهەڵبڕن
بۆچی فرمێسك چاوی رەشتان کاڵکاتەوە؟؟
هەروەك کردووتانە واکەن
چالاکتر لە جاری جاران
چاکی هیمەت بەلاداکەن

# ماڵاوایی

(بۆ هاوسەرم، هاوسەنگەرم
کاتێک، بۆکاری نهێنی، بۆ شاران دەچوو)

میهرەبانم
تەمی خەمت
خەمی ڕۆیشتن و دووریت
نیشتوەتە سەر
لووتکەکانی کوێستانی دڵ
دڵەی سەربەرزو بە سەبرم
گۆرانییەکت بۆ دەڵێ:

ئەگەر بازوو-بەندێکیش بی
هەڵیشت بەستم لە باڵم
هێشتا بە دوورت دەزانم
چی بکەم؟ هەی هاوار بەماڵم
سا، بەخێرچی چاوەکانم:
خۆشەویستم! قارەمانم!
بڕۆ
بەهارمان بۆ بێنە
هەرچەند بڕۆی،
هەرچەند دووربی،
تەنانەت تا
گەرووی خەتەری ئەژدیها.
***

هەرچەند دڵم
هەر ئێستاکەش تاسەی دیداری کردووی
هەرچەند دڵم
لەگەل هەموو هات و چوویەکت
بە توندی
دێتە خورپە،
بەڵام،
هەموو نامەیەکیش کە دەینێری
گوڵێکی ئەو بەهارەیە
سا بەخێرچی! چاوەکانم
پێش چوونەکەش تێرپڕوانە.
با لە پەردەی بیرەوەریم
نیگارە میهرەبانەکەت
ئەوەندەی تر جێگا خۆش کا
با یادەکەت
گزنگی خۆری بەیان بێ
لە کوێستانی
سەربەرزو تەمگرتووی دڵم
تینی تاوی بەهاران بێ
شینایی زەنگی ئاسمان بێ

# وەڵامی نامەکەی ڕووناک*

کۆرپە شۆڕش-پەروەردەکەم؛
ڕۆڵە شیرینەکەم؛
ڕووناک!
خۆزگە، شنەی بای بەیانی،
بۆنێکی تۆی ئەهێنا بۆم؛
خۆزگە ئەتزانی، یەکجاری،
چەند بە-تاسەی بینینی تۆم؛
دڵ بە خورپەی بیستنی پێکەنینی تۆم؛
تامەزرۆی بۆنی هەناسەی بەربینی تۆم!

چەند خۆش دەنگت لەگوێمدایە،
کۆرپە شیرینەکەی دایە،
کە بە زەنگی دەنگی نەرمین
ئەت وت: دایە؛ دایەی شیرین؛
کوانێ؟
بابم کوا؟
لەکوێیە؟
خاڵم، لەکام شار؛ کام دێیە؟
نامەیان، بۆ هەرگیز نایە؟
منیش ئەموت: گیانی دایە
بابت لەوێ
لە چیایە...
تۆش بەو دەستە بچکۆلانە،
کاغەزێکت کرد بە نامە؛
کە زانیت من بۆ ئێرە دێم،
ئامانەتی نامەت داپێم؛
جوابی نامەت داواکرد لێم.
* * *

ئازیزه دڵ-خەمینەکەم؛
رووناك!
رۆڵە شیرینەکەم؛
ئەوا منیش لە سەنگەری ئەوانەوە؛
لە سەنگەری شۆڕشی کوردستانەوە؛
یادگارە شیرینەکەی یادی بابت،
لەجیاتی وان،
وا خۆم دەنووسمەوە جوابت
نەکا دڵە بچکۆلەکەت
بە دووری دایەش خەمین بێ؛
نەکا نەرگسی چاوانت
لێڵی شەونمی ئەسرین بێ!
خاڵۆ و بابە، پێشمەرگە بوون
بەشوێن خۆری بەهارا چوون؛
خۆری گەشی ئاسمانی روون؛
بەهارێك کە هەموو منداڵ،
دەوریان پڕ بێ لە باب و خاڵ؛
نە تۆ، نە "ئازاد"، نە "خەیال»،
نە "گەلاوێژ"، نە هیچ منداڵ،
چاوتان نەشێوێ بە ئەسرین،
لێوتان پڕ بێ لە پێکەنین،
دەنگی سروود و کایەتان
یان نەغمەی "دایە-دایە" تان،
بچێ هەتا ئاسمانی پاك؛
چاوە راستەکەمی رووناك!

**بەفرانباری 1361**
**ژانویەی 1983**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

## سەد بەهار بەشوێن «ماركس»دا

بە بۆنەی سەدەمین بیرەوەری
مەرگی ماركس
14ی مارسی 1983

هاوڕێ!
هۆزان!
مەزن!
رابەر!
هاوڕێ ماركس!
سەد بەهارە بەجێتهێشتووین!
سەد بەهارە؛
سەد بەهاری
پڕ لە هەڵس وكەوت و خەبات،
كەوا سیمای دلێرانەت
پیری پسپۆڕ
گەشترین و روونترین ئەستێرەمانە
بەرەو ئاسۆی
گەش و روونی سۆسیالیزم،
بەرەو ئاوات؛

زۆر لەمێژە
ئاڵای پیرۆزی بیروڕات
كەوتوەتە سەرشان و باهووی
پرۆلیتاریای جیهانی
كەوتوەتە دەستی لێزانی
پاڵەوانی بیروباوەڕ

هاوڕێی پێشڕەوی جەنگاوەر،
هاورێ لێنین؛

هەرچەند ئەوا ماوەیەکە
گەردی زەردی
نەشەکاوەیی لەمێژین
نیشتوەتە سەر
ئەو ئاڵا سوورەی تۆو لێنین
بەڵام ئەمڕۆ
کەوا دیسان
سەراسەر کۆمەڵی جیهان
وەك خاکە-لێوە، لێواوە؛
بە تەوژمی شۆڕشی پرۆلیتاری
گەردی زەردی هەل پەرستی
لە ئاڵاکەت دەتەکێنین؛
چەنای چەند ساڵ
پاش تۆو لێنین،
ئاڵای سووری بیروباوەڕی پیرۆزتان
دەشەکێنین؛
بەهاری ساڵ
بە گوڵی ئاڵ
بە گوڵی ئاڵی ئاڵای سوور
دەنەخشێنین؛
هاوڕێی هۆزان!
ئێمە هەمان،
هاوڕێیانی مانیفێستی کۆمۆنیستین!
ئێمە هەمان،
هاوڕێیانی مانیفێستی کۆمۆنیستین!

# گۆرانی زاره بچکۆلەکان

لە بێدەنگی
تاریك و بەسامی شەودا،
كێشك-دەری حەسانەوەی هاوڕێكانم
گوێی وشیارم
ئاگاداری خشەی مارو خشپەی مێروو
چاوی وریام
ئامادەیە
بە بینینی هەر نامۆیەك
بڵێ: مەبزوو!
گوێی وشیارم
لەگەڵ هەموو هەناسەیەك
لەنێو هەموو گرمەی تۆپێك
ئاگاداری نركەی دڵی
شاخی سەربەرز و تووڕەیە
كە بە سكاڵاوە دەڵێ:
هەر نەبووە؛ نەبووە؛
نەمدیوە؛

بە عومراتی عومری هەزار ساڵەم
قەت نەمدیوە،
هیچ درندەی هیچ ئەشكەوتێك
ئاوا

چۆلەکەو باڵندەو کەروێشك و سمۆرەکانم
پەل پەل بکا!
شنۆم پێدا،
هۆیناڵەی چاکتر بزانم
وتی:
ئەمرۆش
لە گەڕەکی "بەر-کەرێزی" شاری سەردەشت
چەپکێك گوڵی
دڵی پازدە منداڵی ساوای،
بەتەمای کایە لەگەڵ گوللەتۆپی
نەتەقیوی
رازاوەی بەداونراوە
بە تەقینەوەی ئەو گەرای مەرگپژێنە
دوژمنکردە
هەڵپرووکان!
دڵم داخورپا بە جەخار
شاخی سەربەرز، بە سەرکاسی
وتی: منیش
شەپۆرو شینم بۆ گێڕان
ناڵەم گەیشتبوە ئاسمان
کەچی کۆمەڵی منالان
لەسەر گڵکۆی سووری یاران
دەنگی سروودیان لێك ئالان

گەرم و گەش و بەسۆز وتیان:
فیدابوونی کۆمەڵ-کۆمەڵ
رۆڵەی وشیار و پێشمەرگەی شۆڕش پەروەر
ئاڵای بڕوا راشەکێنەر
زیاتر خەمەو داچڵەکێنەر،
لە مەرگی ساوای بەستەزمان!
دڕندەیی ئەم دەعبایەش
سەیرنییەو
دەرسی هەمان
مەدرەسەکانی هیتلەرو
باقی سەگە دڕەکانی دنیاخۆران،
لەم پەڕ تا ئەوپەڕی جیهان،
دووبارە دەوردەکاتەوە
هەر بۆ هەمان زبڵدانیش
دەڕواتەوە
ئێمەی نەوەی دوارۆژی نوێ
زارمان لە هاوار ناکەوێ
ئازادیمان زۆر خۆشدەوێ
ئازادیمان زۆر خۆشدەوێ

بە نرکەوە شاخی خارا
هەناسەیەکی هەڵکێشا

وتی: "زارە بچکۆلەکان
ئاگرێکیان لە دڵ بەردا

دەرسێکی وایان فێرکردم
بە عومراتی عومری هەزار ساڵەم
قەت بیرم نایە شتی وا!
ئێستا، منیش هێندە تووڕەم
هێندە کەیلی کینەو تۆڵەم
هاکا دڵم، گەورەو گران
لەژێرپێی لەرزۆکی دوژمن
دای لە شریخژنی بورکان.

**هاوینی**

**1983 ـ 1362**

# نامەت نایەت
# نازانم بۆ؟

بۆ هاوسەرم؛
کاتێک لەشار، خەریکی تێکۆشانی نهێنی بوو

چاوەکانم؛
ماوەیەکە
خولیایەك لە سینەمدایە
خولیای خەم و خەتەرەی تۆ
نامەت نایە؛
نازانم بۆ؟؟
ڕەنگە هەرهی ئەو خولیایە
مەلی شیعرم نایەتە گۆ؛
دەفی شیعرم دەنگی نایە!

مەلی شیعرم،
لەگەل دارودرەخت و ئاو
کانی؛ سەوزەڵانی؛ دەراو
لەگەڵ نەسیمی خۆش ئاژۆ
ماوەیەکە نایەتە گۆ!

تەنات بۆ هاوڕێی هاودەنگ
یا شینایی ئاسمانی زەنگ
مەلی شیعرم ناجریوێنێ
ماتەو بێدەنگ
ناپرسی بۆ؟
چونکە نامەی پڕ لە وڕەو بێباکی تۆ
پاراون
هەست هارووژێنن
بۆ نەترسی و قارەمانی
ئاوێنەی باڵا-نوێنن؛
کاتێك کە سوور-سوور دەزانی،
ئەژدیهای ڕەشی سەرمایە
بۆ قوتدانت
هەمیشە لە کەمیندایە
دیسان نیزەت پێیەو
بەرەو گەرووی خەتەر-خێزی دوژمن
ئاخێز ئەکەی!

کاتێك وایە؛
پەرۆشم کە نامەت نایە!
نامەت کە دێ،
وەها هەستم پێدەبەخشێ
کە هەرگیز هیچ
نەشەی شنەی نەسیمی تۆ
شەوقی بەربەیانی ئاسۆ

یان کـیژی مانگ
بە سـەرمای گـەلاوێژ تەزیو
دەم و چاوی لـە کـانیاوی پیـرۆزەیـی
ئاسـمانـی بـەیانییا، خـاوێن شـۆریو
یان هـەزاران
دیمـەنـی جـوانـی کـوردسـتان
ئاوا هـەسـتم نابزوێنن
خـەیاڵـم ناهارووژێنن!
ئێستا، بەڵام، نازانم بۆ
نامـەی تـۆ، دەمێکـە نایە!؟

جاری جاران
قـەت پێنـج رۆژی پێنـەچـووە
پـەیکـی شـاران
بە خـەتە لار و خـوارەکـەت
نامـەیەکـی بۆ ئەهێنام
گـوڵـی پشـکـوتووی تینـووبووم
پاراو ئەکـریام
ئەشـنیام...
ئێستا بەڵام؛
پێنـج حـەوتووە؛
گـیرۆدەی ئەم خـەم و خـولیام،
گـیرۆدەی خـولـیای خـەمـی تـۆ،
نامـەت نایـەت، نازانـم بۆ؟!

سا، بە نەسیمی بەیانا
هەورێکی نامەت بنێرە!
با، نەرمە-بارانی وشە
پاراوم کا
با، وەك نەسیم
وەك گوڵ،
گەڵا
ببمەشنە؛
با مەلی دڵ بێتەوە گۆ
پەری شیعرم بێتە گۆرانی و گفتوگۆ
لەگەڵ نامە جواکەی تۆ!

**ئۆگەستی 1982**

# دەنگی سرود

لە شاری سنە روویداوە

کلاس پڕە
لە ویتە-ویتی شۆخ و شەنگ
ویتە ویتی منداڵێکە
نامەی موعەللیمێکی پار
ئەخوێنێتەوە بۆ یاران

پاسدار موعەللیمی نەزان
قین لەبەری دەروون هەرزان
بە قیژە-قیژو جنێودان
نامەیان لێ دەفڕێنێ و دەیدڕێنێ و دەقیژێنێ:
«تاکەی؟ تاکەی؟
دەستیان ئەبێ لێهەڵگرن
لە من پرسن،
سەراسەر هەموو ئەم خاکە
بە دارو بەردو خەڵکیەوە
بە منالی بەر لانکیەوە.
بۆ سووتان و بۆمبا چاکە!»
چاوی "ئاوات" و"ئارەزوو»
پڕبوو لە فرمێسك و

بوغز، گرتی گەروو
تاکو لەپڕ
دەنگی زوڵاڵی منداڵان
بێدەنگی کلاسی شکان
دەنگی سروودی "کاك شوان»
سەرتاپای پاسداری لەرزان!

**بەهاری 1365 – 1981**

# ئەم دڵەی من

دڵم،
ئەوسا، کە منداڵ بوو
بە مردنی هاوڕێیەك، هاوسەنگەرێکم کۆست کەوتەبوو
دوێنێکانێ
بە گێرانەوەی شارەکان،
دادەخورپا
بەڵام ئێستا
دڵەی قەڵەندەری خاراو
هێندەی دەردی گەورە و گران
بە ئارەقەی ڕەنجی نێوشان
بە بارانی شیعری پاراوی خەمڕەوێن
تواندوەتەوە
ئێستا، نەك هەر بۆ تاقە یار
یان ژێرپەل بوونی گوندو شار
بەڵکو بۆ ئەو دنیا تازە
ئەم دڵەی من دێتە خورپە!

**پایزی 1361 –1982**

# بۆ هاوڕێ جەمال

هونەرمەندی سرووودبێژ
جەمال موفتی

ئەتوانم بەچاوم بڵێم:
مەگری؛ مەگری!
یان بە سابڵاغی قارەمان
بڵێم: مەگری!
یان بە ئێوە گەلی کوردی رۆڵە کوژراو
بڵێم: مەگری!
ئەتوانم تەنات بڵێم:
دایکی شەهید، دە بەس بگری!
بەڵام، چی بکەم لە دڵە دەربەدەرەکەم؟
مناڵە ژیرنابێتەوە،
گوێم ناداتێ و
بەکوڵ ئەگری!!

خەڵکی وەرن
ئەم شەهیدە نازبوردوە
تەرمی تفەنگێکی پڕی لەسەر پێیە
لە تابووتا
تەرمی دڵی دەربەدەری هەمووما
لە تابووتا وەرن! وەرن،
خوێن بگرین بۆ کاك جەمال
نە؛ نە؛

هیچکەس نابێ بگری!
سوور پۆش کەن و
لەسەر گڵکۆ
دەستی هەڵپەرکێی بۆ بگرن

ئاخر، ئەم قەرەباڵغە
زەماوەندی کاک جەماله
ئاخر جەمال
هەر لەمێژە داگیرسابوو
بە قەلبی خۆی چەشنی لاله،
دەوروپشتی ڕوونکردبوو
دوێنێ شەویش
بڵێسەی سەندو وەك ئاگر
بەربووە گیانی دوژمنان
بە سروودی
ڕێژنەی گوللەی کلاشینکۆف
هێرشی کرد؛
خوێنی خۆی کردە تەوژم و تین بۆ فیشەك
بوو بە "ئارەش" بۆ گەلی کورد
گیانی خۆی نایە ناو گولله
با دوور بڕوا
با سنووری ئازادیمان
بەرین تر کا...

وەرن، منداڵ؛

هاوڕێ بچکۆلەکانی کاک جەمال؛
ئێوەش وەکو دڵی کۆست کەوتووم، مناڵن!
بێن و ماڵاوایی لێکەن؛
کاک جەمال ئەچی بۆ سەفەر
ناش یەتەوە!

ئاخۆ ئێوە،
لەگەل کێدا
سروودی "ئەنتەرناسیونال»
یا "بڕیاری یەکی ئەیار»
یا "مام ڕەحمان» و "کاک شوان»
ئەخوێننەوە،
پاش کاک جەمال؟؟
مناڵەکان
ئەو سینگەی وا سروودی گەرمی ئەهەژاران
بەرامبەر بە گوللەی گەرمی ئەرتەش و پاسدار ڕاوەستا
نەکا بێن و
سروودەکان لەناو گەرووتان، برفێنن!
زانیوتانە؟
ئاخر سروودی کاک جەمال
کام سروود بوو؟
پاش وەی سەد جار
وتی، وا سەدەی بیستەمە
ئەی گەلی کوردی قارەمان

ده ڕاپەڕن بۆ کوردستان،
پاش وەی سەد جار
وتی شەهید تۆ نامری
پاش هەموویان
ئاخر-سرودەکەی وابوو:
بە خوێنی خۆ
گۆشەیەکم لە ئاڵای سوور
نەخشاندووە
دەسا مەگرین
تەرمم بخە سەرشانی پان و بەرزی کرێکاران
کفنم لە هەور بۆ دروست کەن
با ببارێم
لەگەل دوا دڵۆپی باران
لەسەر ئێران
تۆویی ئازادی پێ شین کەم
گزنگی خۆر
ئەخەم لە پەلکەزێڕینە
با کفنەکەمی پێ سوور کەم
ئەمجار ئێوەش
کفنم بکەن بە دەسرەی سووری داوەتان
نەك بە دەسرەی ئەسرین سڕین
چونکە ئەمن بۆیە مردم
هەتا ئێوە
ئازادو سەربەخۆ بژین
هەتا ئێوە

هەموو رۆژێك
دەنگی زوڵاڵی سرودتان
بێتە ئاسمان
بهاڵێتە دەوروپشتم
لێم بێتە شادی و گۆڤەند
بێمە سەما

چونکە ئەمن
بۆیە مردم
هەتا ئێوە
ئازادو سەربەخۆ بژین؛
بژین؛ بژین!

**پووشپەری 1360**،
**تەموزی 1981**

# دۆشكا

پێشکەشە بە گوردانی کاک فوئاد

گەشن، گەشن، دانە-دانە و پۆل-پۆل ئەستێرە
بە ئاسمانی زوڵاڵەوە، بیانژمێرە
وێنەی یادی شەهیدەکان دەدرەوشێنەوە
وەرەی بەرزی پێشمەرگەی پێ دەگەشێنەوە
تاسە-بارە، مانگە شەوی بە پایز تەزیو
بۆ دیداری مەریوانی هەرگیز نەبەزیو
تاسە-بارەو نازانێ بۆ هەوری حەریری
نایەڵێ ئەو دەشتە شین بێ بە تیشکی شیری
تا دەبینێ، باسك و شان و شاخی «بیسەران»
ڕازاوەیە، لێی دامەرزاون پێشمەرگەکان
بێ ئەسپایی، بەبێ تەقە، بن بەرد-بە بن بەرد
تاریکایی هەور حەشارەو شەوە قەڵای مەرد
ئەمجارە مانگ، گەرچی سەرما تیشکی تەزێنێ
بەو هیوایە کە پێشمەرگە دوژمن بەزێنێ،
تیشکی لەژێر هەوری ڕەشا دەشارێتەوە
تا دۆشکەچی دوژمن، کوێرایی دابێتەوە
دوشکا" وێنەی باڵندەیەکی باڵبەست کراو
زەلیلی دەستی دوژمنە، سەر شۆڕو داماو.

چـــاوی تـــرســـی بـــرپـــوەتـــە ئـــاســـۆگـــەی خـــەتـــەر
پێشـمـەرگـە وریـــا دێتـەپێش، دوژمـــن بێخـەبەر!
بست بە بـسـت و هـەنگـاو هـەنگاو، گـەمارۆیان دا؛
قـــەڵای دوژمـــن کـــەوتـــە ژێـــر چنگ لاوانـــی وریـــا
بروسـکـە بـــوو، نـــاکـــاو، نـــرکـــەی دەنـــگـــی دلـــێـــران،
چـەقـەڵـی دز هـــەڵـــدەلـــەرزیـــن لـــە ترسـی شـێران
وەك چـــۆن بێچوە دەعبایەك لە هێلان دەردێنن،
دەریـــــان هـــێـــنـــان، بـــۆ ئـــەوەی حـەتتا بجروینن
دوشـکـا کـەو بوو، کـەوتە چـنگـی هـەڵۆی پێشـمـەرگـە
پێشـمـەرگـە کـێو بوو هـەرەس بوو چـی دەیگـرت بەرگـە
دایان تـەکاند هـەرچـی تیا بوو؛ چـەك و جل و بـەرگ!
شـێری ژیـــان، چنگـی خسـتـە دڵ و جـەرگـی مـەرگ
سـا بـــڕوانـــە، شـەوقـی شـــادی چـــۆن دەشـتـی پڕکـرد
شـەپۆلـی وەك سـێڵاو هـەسـتـاو هـەموو خـەمـی برد
زریـــــوەی گـــەشـــی ئەسـتێرە پـــڕبـــوون لـــە شـــادی
سـەمای هـــەورو تریفـەی مـانگ، جـەژنـی ئـــازادی!
دوشـکـا ئێسـتا چـووەتە سـەر شـانی شـاخێـکـی بەرز
نـــایـــەڵـــێ دوژمـــن بـــبـــزوێ لـــە ئـــاســـمـــان و ئـــەرز
کـــەوێـکـــی گـــــــەروو-پـــــاراوە، کـــاتـــێ دەخـــوێـــنـــێ
تـــیـــری تـــــەرزەی مـــــەرگ، بـــۆ دوژمـــن دەبـــارێـــنـــێ!

**زستانی 1981 ـ 1359**

## بۆ: ڤیکتۆر خارا

ئێمەش لێرا،
ڤیکتۆر خارا،
گۆرانیمان ئاگراوین؛
ئاسایی نین!
خەونی خاوی بەیانی نین!

من بەو شیعرەت هەستم سازە
لەسەر تەلی گیتارەکەت
لەسەر تەلی گیتاری دڵ
عەشقی دونیایەکی تازە
ئارەزووی بۆنخۆشترین گوڵ
ئەکات بەو چەشنە ئاوازە
وێنەی مەلێکی باڵ وەشێن
داوتە لە شەقەی شا باڵان
وێنەی شنەی بەری بەیان
رووی ئاسۆم، سوور ئەتەزێنی؛
عەتری یادی گیانفیدایی
هاورێیانی کۆڵنەدەری جەنگاوەرم
لە ناخە میهرەبانەکەی سنگی پڕ هیواو باوەڕم
ئەبزوێنی!

ئێمەش لێرا

ڤیکتۆر خارا

گۆرانیمان ئاگراوین

وەکو "لۆرکا» ی شاعیر وتی:

پێش ئەوەی باسی کوێستان بێ

ئەبێ هاواری ئینسان بێ

تەلی شیعری گیتاری دڵ

هاودەرد، هاوخۆشی چەوساوان

لە بینینی بەهارو گوڵ

لە هاژەی خوڕی شەتاوان

موژدەی مەرگی سەرماو سۆڵەو

سەختی زستان

بەدی ئەکا؛

تەلی شیعری گیتاری دڵ

لە بینینی دەوڵەمەندی

پۆشتەی پەرداخ

دیمەنێکی جینایەتکار

دیمەنێکی گرژی تووڕەی هەڵلووشی کار

کاری گرانی تاسێنەر

دیمەنێکی قەمچی و قانوونی سەرکوتکەر؛

یان ساتوورە خوێناویەکە

کە پەنجە هونەر مەندەکەت پێی پەی کرا،

دیمەنی وا

بەدی ئەکا!

بەڵام هەستی نوێی ئێمە
هەر بەڕاستی
وێنەی باڵندەی باڵ وەشێن
هیچ سنوورو سەر زەمینێك
دیلی ناكا!
با لەم شاخە بەرزانەوە
لەناو شنەی شۆڕشی كوردستانەوە
لە بەربینی توند گوشراوی
كارگەرانی ئێرانەوە
تا ژێر چەكمەی «پینۆشە»ی سەركوتكەری تۆ
تا هەندەران؛
گوڵی سوورو سەوزەڵانی
بەهاری بەرینی جیهان
وا لێك گرێدەین، هیچ بایەك
گوڵاڵەكان نەپڕووكێنێ!
لە خوێنی گیانفیدایانی
عاشقی دوارۆژی ئینسان
ئاڵایەكی سووری بەرین
لە ئەرز هەڵبكەین تا ئاسمان
تا كرێكاری گشت زەمین
یەك بگرین
تا كرێكاری گشت زەمین، یەك بگرین.

**خەرمانانی 1362؛ سیتامبەری 1983**

# دەریای جەماوەر

وەرگێڕاوی شیعرێکی «شاندور پتۆفی»
شاعیری شۆڕشگێڕی مەجار

یاخی بووە
دەریای بەرین
دەریای بەرینی جەماوەر
یاخی بووە
هێزی سامدار
وەك شەپۆلێکی پڕ خرۆش
رادەچەنێ
ئاسمان و ئەرز ئەلەرزێنێ
تەماشای ئەم سەما بکەن
ئەم مۆسیقا توندە ببیەن
ئەی ئێوەی هێشتا بێ-خەبەر
ئێستا ئەبێ چاك تێبگەن
کە جەماوەر
خەریکی چی خوڵقاندنە!؟
دەریا،
بە گرمەو گاڵەیە
کەشتیەکانیش شەپۆل ئەدەن
شەپۆل ئەدەن و نوقم ئەبن

بەرەو قوڵایی دۆزەخی...
ئەستووندەك و با-وەر-گێڕپیان
تێکشکاون
دڕاون و داشۆڕاون

هیچ بناوان و بەر-پۆنگێك مەپارێزە!
یاخی ببە!
قووڵایی لێڵت بنوێنە؛ کەف چەرێنە!
کەفی غەزەب و تووڕەیت
حەوادە، تا هەوری ئاسمان،
پێی بنووسە بە ئاسمانا
بنووسە بۆ ئەبەدییەت:
هەرچەند کەشتی، بەسەرشانی شەپۆلەوە
دەشنێ و دەڕوا و
شەپۆلەکان لە ژێرەوەن
بەڵام، چارەنووسی کەشتی ئەم دنیایە
بە دەست و باسکی بەهێزی
شەپۆلەکانی دەریایە!

**بەهاری 1365**

# دەرزی قژ

شیعرێک لە تاسەی ئاسۆی کچمدا

هیلالی مانگ
بە لاجانگی ئاسماوە
لەنێو کۆمەڵی ئەستێران
هێندە جوانە
ئەڵێی
دەرزی قژێکی زەردی ئاسۆیە
داویە لە زولفی شەبەقی؛
لەنێو وریشەی ئەستێرەی
قژی تازە شۆراویدا
گەمارۆیە!

نەبوو جارێك
هیلالی مانگ ببینم و
نەڵێم ئەی بۆ؟
کوانێ ئاسۆ؟؟

**جۆزەردانی 1362؛ ژوئیەی 1983**

## سەرەتایەکی کورت بۆ چاپی 1988 (1367)ی کۆ-بەرهەمی «دەنگ هەڵبڕە»

سڵاوێکی گەرم و گەش
ئەمە، سێهەم هەڵبژاردەی شیعرەکانمە.
یەکەمین، «گەشتێ لە کوردستان» بوو، هی ساڵی 48 (1969) کە ساڵی 58 (1979) بڵاو بووەوە؛
دووهەمین، «سڵاوی ئازادی» بوو کە ساڵی 63 (1984) بڵاو بووەوە؛
ئەمەش سێهەم هاوار و بانگەوازمە بۆ کۆمەڵانی بەشمەینەت کە دەنگمان هەڵبڕین و دەرد و ژان و هیوا و ئاواتمان دەربڕین.
گەرچی ساڵ و زەمانێکی هێندە بێ-ڕەزایە کە خۆم پێم وایە، یەک لە هەزاری دەرد و ژانەکانم دەرنەبڕیون...

**ڕێبوار**
**پاییزی** 1367 (1988)

# دەنگ هەڵبڕە*

دەنگ هەڵبڕە!
دەنگت بە سەرما نەلەرزێ
«گەلاوێژ»ە چاو-گەشەکەی ڕووتەڵەکە
دەی
بە سرودی «کاك شوان»
دەنگ-هەڵێنە؛
با بەرخۆلە رووتەڵەکانت نەلەرزن
بە تەزووی بای ئەو سەرمایە!
بڵێ؛ بڵێ؛
لەم دنیایە،
هاوماڵە هەژارەکانی بابەودایە
هێندەیان چاکەتی پەشمین
بەدەست و پەنجەی ماندوویان، بۆ چنیوین
کە نەك هەرمن
هیچ منالێك سەرمای نەبێ!
بڵێ؛ بڵێ:
ئەم دنیایە، هێندەی پەشم و خوری تیایە
کەنەك هەر بەرخۆلەکانم
هیچ بەرخێك نەبڕێتەوە و سەرمای نەبێ!
بڵێ: سرودووم ئەخوێنم
دەنگی زوڵاڵم هەڵدێنم
کاك شوانەکەم ئەدوێنم
تا زگ-زلە چاو-چنۆکەکان

کەچاکەتە پەشمینەکانیان رفاندم
کە بەرخۆلە نەشمیلەکانیان رووتاندم
پەت ئەکەم؛
ئەیانفەوتێنم!

دەنگ هەڵبڕە

دەنگت بەسەرما نەلەرزێ
گەلاوێژە چاوگەشەکەی رووتەڵەکە

دەی

بە سروودی کاك شوان
دەنگ هەڵێنە؛
بابەرخۆلە رووتەڵەکانت، نەلەرزن؛
بەتەزووی بای ئەو سەرمایە!

**بەهاری 1364**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی و بەکری لەگزی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# بانگەواز

بە شوێن وشەی جەنگاوەرا
مەچۆ،
دیوانی شاعیران مەپشکنە!
دەستت ناکەوێ وشەی وا
پڕ-بەپڕبێ و
بانگەوازت هاوار بکا
نابینیەوە پۆشینی وا
بە باڵای خەیاڵت بکا
وەرە لێرە
لەزۆراوا و مەجبووراوا و جەوراوا و
مەینەتاوادا
وشەی جەنگاوەر رژاون
گوللەن، نارنجەکان بۆمبن
بەسەرهاتی پێشێل کراوانی ئێستا
ئێوارەیەك
پیاوێك، دەسرەیەك تەماتەی شلەقاوی بەدەستەوە
خۆی بەدەرگای ئوتوبوسا هەڵواسیوە.
ئەچێتەوە بۆ زۆراوا
نزیك سێ-ڕای «پیپسی کۆلا»
سەیرکردنی حەسرەتاوی کارخانەکەو
قفڵی دەرگا
یادی رۆژانی رابردووی
کار و ئیعتساب و غەوغا

بریسکەی قین دێنێتەوە بەچاوی دا!

نیوە شەوێك
ژووری زیندان
تەنیا هەردووکەسی تێدا:
دیل و دیلکەر
زیندانی،
لەتاس-بردنەوەی شەللاقی حەفتا و هەشتادا
تەماشایکرد
لە پەنجەرەی تەلبەندەوە
نیگای دڵسۆزی ئەو پیاوە و
هەزار جووت چاو
سەیری ئەکا

هەتاو جەهەنماوی یە و
لەسەر ئیسفاڵتی رەشی رەق
فەرماندەکان
هەشسەد سەرباز
بۆ ئیتاعەت ئەگەوجێنن:
قۆناغە تفەنگ، سینەخیز، بدەو بئیست،
شەق و جنێو، پەیتا پەیتا؛
شەرای مەرگ و
ڕشانەوەی خوێن،
چل، پەنجا...
پاش مانگێکیش

سەدان جەنازە دێننەوە
لە جەبهەوە، بەجادەدا!
***
سەعات چواری ئێوارە بوو،
زستانی پار،
لەنێوچەڕە دووکەڵەکەی بۆمبارانا
بەتاکسییەکەی
چەند برینداری گەیاندە بیمارستان
هاوسێ و بەراوسێ پێ یان وت:
ماندوونەبی؛ بچۆرەوە خانەت ئاوا!
کەهاتەوە،
لەجیاتی «حەبیبە» و «فوئاد»
«فەرامەرز»، «فەرشاد» و «زیبا
دووکەڵێکی شین دەبینرا
لە کەلاوەیماڵەکەوە
بەرەو ئاسمان خۆی لوول ئەدا!
پیرۆزبایی یەکی ئەیاری هەشتاوحەوت
چوومە ماڵێك،
بردمیە ژووری نێوئەشکەوت!!
وتم: سەدەی بیست و یەك هات،
ماڵ و ئەشکەوت؟!
وتی: هاوسێکان بەغیلیمان پێئەبەن؛
ئاخر،
تۆپ-بارانی پێشوو
پریشکێکیشی تێنەکەوت!

شوانێك لە خومپارەیەك هەڵەنگوت
تەقیەوە؛ هەردو لاقی برد!
یەكێك وتی: بەستە زمانە نانی بڕا!!
یەكێك وتی: چۆن بەكەس و كاری بڵێن؟!
ئەمن لەگەل دایكی گریام
بەلام ،
بۆ وشە دا نەمام:
جێگە پەنجەی
چنگی ئاسنی سەرمایەم پێ نیشاندا!
***
بەشوێن وشەی جەنگاوەرا
دا مەمێنە!
وەرە لێرە
گوێ لە دڵی دەرداژنی هەژارگرە
لەگەل هەر لێدانێكی دڵ، كارەساتێك:
پیاوێك، لەبێدەرەتانی خۆی هەڵواسی
ژنێك خۆی كوشت
ژنێك هەنەزاكانی كوشت
پیاوێك كوڕی خۆی هەڕاجكرد
ژنێك،
بۆ تێركردنی منداڵەكانی
خۆی هەڕاجكرد!!
لەو كاتەوە تۆ ئەم شیعرە ئەخوێنیتەوە
هەر لەم چەند دەقیقەیەدا
سەدان كەس مردوون لە برسا

کەچی ئەوان،
لەبەرهەمی رەنج و کارمان،
وڵاخەکان بە پەتاتە پەروار ئەکەن
شیر و قاوەش بۆ ماسییەکان
هەڵئەرژێننە دەریا!

بە شوێن وشەی جەنگاوەرا
دامەمێنە
دەنگت لەگەل ئەم سرودە لێك ئاڵێنە:
وانابێ؛ نا!
تاکەی چی کردەی ئێمەیە
بەگەرووی هەرگیز تێرنەبووی
سەرمایە و تالانا بڕوا؟؟
کاتێك ستەم،
ئاوا، ڕاشکاو ئاشکرا
شمشێری رووتی کێشاوە و
بەڵێن ئەدا:
چۆن وابووە، هەرواش دەبێ هەتاهەتا؛
وەرە تێکرا
چنگ لە چاوی گەردوون گرین
لێرە ، لە کۆریا، ئەفریقا
لە هەرشوێنێك دەستمان ئەگا
شمشێری شەقکەرت توندکە لە لا-لەغاوەی ئەژدیها!
بڵێ: مردووی گۆڕ-نەکراو؛
عومری ستەم
عومری چەوسانەوە،

تەواو!

لە کۆمۆنەوە تا ئێستا

بەبرسیەتی

بەشەڕ

بە کوشتاری جەمعی

بە بۆمبەکەی «هێرۆشیما»

ژماردوومە

چەندت جینایەت لە لە پێدا!

چاری کارم ناسیوە: نا؛

نازیم لە ژێر بۆمبارانا؛

کوێر نابم بە بۆمبی شیمیا؛

چارم یەکگرتنە و گۆڕێن

سەرهەڵێنان

دەست هەڵێنان

بۆ گۆڕێن

بۆ

گۆر-کردنی مەینەتاوا

تاکەی کۆڕ کۆڕ، تەنیا تەنیا

بمتلێنیەوە لە خوێنا؟

چەکدارم ، چەکم یەکگرتن

یەك بوون، تێکڕا هەڵمەت بردن

یەك بوون ، یەخەی ستەم گرتن

تا گۆڕی نابوودی بردن!

**خەرمانانی 1366**

## سواریماندوو

سواری ماندوو،
دابەزیبوو؛
لە غاوی خستبووە سەر مل ئەسپەکەی و
هێی کردبوو...
ئەسپ حیلاندی و
بەرەو ئاسۆ
سواری بەزیوی بەجێهێشت...

سواری ماندوو
دەستی بە حاڵ، لە دەرکەدا
دایکی بە پیریەوە هات
روومەتی دایك
خەریك بوو دەگەشایەوە
بە پێکەنەنین
ناکاو تێکچوو!!
خۆڵ و بووڵیان بەسەرداکرد!
پێکەنین و شایی دامرد!
سوارەکەی چەکی پێنەبوو!!
وتی: دایە،
کرێوەیە
سەرما و تۆفی خۆڵینەیی
ناهێڵێ چاو بتروکێنی...
وتی: دایە،

کـرێوەیە

هـەور ڕەنـدوویەکـی قـورسـە

ئاسـمانێکـە نـەوی بـووە

نـەوی، چـەسـپـی زەوی، بـووە...

دایك

لـە چـەقـی دەرگـادا

هـەردوو پـێـی لـە عـەرز چـەقیـبـوو!!

نـەیدەزانـی

بـدا لـە پرمـەی گـریان یا...

یا تووڕەبێ و دەرگـا داخا!؟

وتـی: دایە،

کـرێوەیە...

رێگـا-ون-کـردن ئاسـانە،

رێگـا-دەر-کـردن گـرانە

وتـی: دایە

دوێنـێ شـەوێ،

لـە خـەونـم دا،

دیـم هـەڵـۆیەك

باڵـی شـکـاوی کـێش ئـەکـرد

لـەو کـرێوە و تـۆفادا

خـۆی کـرد بـەدرزی دوو بـەردا...

وتـی: رۆڵـە

دڵـم نایە بڵـێم

بـەخـێر نـەیـیـەتـەوە؛

کـوا ئـەسـپ و چـەك و جـل و بـەرگ؟؟

کـوا سـەری نـەترسـاو لـە مـەرگ؟؟

***

سبەی، دایك،
بەدەم ئێشەوە هەستا بوو
دنیای بەسەردا رووخابوو:
هەتا سوار بووی،
دڵنیا بووم
باری گران هەتا هەتا
شانم هەلا-هەلا ناکا
هەتا سوار بووی
خەونی تێری
خەونی حەسانەوەم ئەدی
هەتا سوار بووی
ئەگەر ئەو کێوە کار بوایە
لە خۆم ڕادەدی دای گرم
هەتا سوار بووی
هەموو رۆژێك چاوەڕوان بووم
جێ هیوای دەر و جیران بووم
بەڵام ئێستا،
چۆن سەر بێنمە ناو سەران؟
چۆن بچمە ناو دەر و جیران؟
پێت وایە چی؟
دوێنێ شەوێ
لە خەونم دا
چەقەڵی چۆم
هەڵۆی بێ باڵی دەخنکاند!!

پێت وایە چی؟
ژین هەر تاڵەو
مەینەت هەر میوانی ماڵە
کرێوە و تۆف
چی بوو لە چاو
دەستی بەتاڵ
باری گران
زگی لە برسان هەڵگوشراو؟
چی بوو لە چاو
شەق و شەلاخ و شکەنجە و
پەتی ملی ئیعدام-کراو؟
بۆ کوێ ئەڕۆی؟
کوا دەرووی روون؟
کوانێ رێبازی دەرباز بوون؟
بەتەمای چیت؟
حەسانەوە؟
لای ئەوکەسەی بە رەنجی تۆ حەساوەیە؟؟
رۆڵەی دایکی
چار ناچارە
چار ناچارە
هەر زۆرە کوژەی زۆردارە
خۆ هەر تۆ نیت
دەست هەزارە
لێرە، لەوێ
خەریکی چارانی کارە...

سـواری بـەزیو

ئەژنـۆی تـەزی تـێ هاتـەوە
حیلـەی ئەسـپـە تـەریوەکـەی
دیسـان وەبـن گـوێ هاتـەوە...

- رۆڵـەی دایکـی

چار ناچارە
بار ئەبـێ بگـاتـە مـەنزڵ
چ کـەس نییـە غـەیری خـۆمان
دەریایەك دەسـتـی تا مـەرزۆیـن
زۆریـن وەکـو خـیـزی چـۆمان...

سـواری ماندوو

چاوی لـە چاو دەدزیـەوە
چاوی گـەڕاند
هـەزاران چاوی سـەرزەنشـت
هـەزاران چاوی بـەپرسـیار
هـەزاران چاوی پڕ ئـومـێد
لـە دەور و پشـت...

چاوی گـەڕاند

لـە ئاسـۆوە
ئەسـپـەکـەی، بـەرەو لای، بـەغـار
یاڵـی بـەدەم باوە داوە...

رۆڵـەی دایکـی

لـێرە شـەپـۆل،
لـێرە دەریا؛
کـرێـوە و تـۆف

دێت و دەڕوا...
ئەم ئاسمانە،
سەری بەهەور نەگیراوە
هەور کە ڕۆیی
ئاسمانی شین
ئاسمانی زەنگ
هەتاوی گەش هەتاهەتا...
سوار هەستا بوو؛
دەستی لە یاڵی ئەسپەکەی توند ئاڵا بوو؛
لنگی لە ئاوزەنگی، قایم، شەتەك دابوو؛
بە نێو کڕێوە و تۆفانا،
لە چاوی گەشاوەی دایکی،
بەرەو ئاسۆی ڕوون
ئاوا بوو...

**زستانی 1364 ـ 1986**

# بیهێنە پێش چاو

وەرگێڕانی ئازاد، لە گۆرانی
«ئیماجین»ی «جان لینۆن»
بە دەنگ و میلۆدی، زیندوو-یاد: «کاروان عوسمان»
لەسەر یووتیووب هەیە.

بیهێنە پێش چاو؛ رۆژێك بێ
هەمووان هەمووشتێکیان بێ!
ئاسانە ئەگەر تێیفکری؛
هیچ شتێك موڵکی کەس نەبێ!
بیهێنە پێش چاو کە هەمووان
هەر بۆ ئەمڕۆ بژین،
یەکسەر

ئەم وڵات و ئەو وڵات و
سنوور نەبێ!
کوێی دژوارە؟
ناکرێ وابێ؟
پێناوێك نەبێ بۆ کوژران
نە بۆ کوشتن؛ نە خوێن رشتن!
تاوێك تێفکرە، چەن خۆشە
جەهەنمی پاش مەرگ نەبێ؛
بەهەشت نەبێ!
ئایین نەبێ!
سەر سەریشمان، هەتا بڕۆی،
غەیری ئاسمان چیتر نەبێ

بیهێنە پێش چاو
کە هەمووان
لە ئاشتیدا بژین، یەکسەر؛
ڕەنگە بڵێی،
من، خەیاڵ هەڵیگرتووم
بەڵام هەر من نیم وا دەڵێم
بە هیوام تۆش
ڕۆژێکی بێیە کۆڕمان
دنیاش گەش

بیهێنە پێش چاو
موڵك نەبێ
سەد بریا تۆش دەتسەلماند
نەتەماع بێ، نەبرسیەتی،
بەشەر هەموو برابان!
بیهێنە پێش چاو
کە هەمووان
پۆشتە و خاوێن بێنە دەر؛
گشت یەکسەر!
ڕەنگە بڵێی
من خەیاڵ هەڵیگرتووم
بەڵام هەر من نیم وادەڵێم
بە هیوام تۆش
ڕۆژێکی بێیە کۆڕمان
ئەم جیهانەش
وەك یەك بژین هەموومان

# دڵی شکاو

کـردی بـه ژووراو پێـی وتـم:
هـاتـووم دڵـت بێـنـمـەوە جـێ!
وتـم:
کـچـێ؛
خـۆ دڵـم لـه جـێ نـەچـووە،
قـرپ شـکـاوە!
دڵ کـه شـکـا،
ئـەبـێ بـەناز بـیـگـریـتـەوە
مـاوەیـەکـیـش،
وەك کـۆرپـه بـیـگـریـتـه بـاوەش؛
بـەو پـەڕی داشـتـیـارییـەوە
ئـەبـێ هـەڵـی بـەسـتـیـتـه مـل...
هـەتـا پـیـرتـریـش بـم، کـچـێ،
گـرسـانـەوەی
ئـەم دڵـه ئـاسـان شـکـاوەم،
مـاوەی زیـاتـری پـێـئـەچـێ...

**هاوینی1367**

## لەم بازاڕە بێڕەحمەدا*

من ئەوکەسەم
هەموو ڕۆژێك
ژیانی ئەمڕۆم دەفرۆشم
بۆ کڕینی نانی سبەی...
ئەمڕۆش دیسان
هاتوومە دەر
«هەی ژین»، «هەی ژین»،
ژیانی ئەمڕۆم بفرۆشم
لێم ناکڕێ؛
خاوەنی نان لێم ناکڕێ!

*

هانایەکم پەنگاوەتە بین و گەروو
هەی داد، هەی داد
لەم بازاڕە بێڕەحمەدا،
ژیان هەرزانترە لە نان!

**بەهاری1367**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# بەرەژان

بەرەژانمە،
بۆ شیعرێکی تازە و پاراو
بۆ شیعرێک بۆ
شا بووکی رازاوەی دڵم

جەژنی پێناس،
یەکی ئەیار
بەرەژانمە و
لە ژوور، لە دەر،
گیرۆدەی خولیای شیعراویم
کام وێنەی هەرە پاراوم؟
هەرە جوانم؟
کام ئاواتم؟
کام خەون، کام ئەفسانە، کام راز؟
کامە موفرەدات و تەعبیر؟
کامە کێش و کام قافیە؟
کام توێشوو؟ کام چێژ، کام رەوشت؟
کام گوڵی کام دیوانی کام
شاعیری بەرز؟
کۆن بێ؟ هاوچەرخ بێ؟

هاوزمان؟
کێ بدوێنم؟
کام کرێکاری جەنگاوەر؟
کام مانگرتن؟
کام سەرکەوتن؟
کام رابەر، کام
بونیادی چی-ستەم تێکدەر؟
کام مرواری
لە بن دەریای قووڵی هونەر
بێنمە دەر؟
کام بیر؟ کام را؟
کام رۆمانسی ئاگراوی؟
کام هەست و سۆزی باڵداری خەیاڵاوی؟
بگرمەوە
بۆ هەوێنی شا شیعرێکم
شیعری ئەیار:
هەنگی پرسیار
هەنگی پرسیار
هەنگی پرسیار؟؟؟؟
وروژاوتە ناو شانەی مێشکم
شانەی دڵی شەیدام
هەنگی پرسیار...
لە ژوور لە دەر

کاتی نان خواردن، کاتی کار
کاتی نووستن...
هاوڕێکانم ڕەنگە بڵێن
چی قەوماوە لە ئاست ڕێبوار
وا شێواوە؟
پێم خۆشە پڕ-بەدڵ بە زار
هاوار بکەم:
هاوڕێکانم
وەڵامێك
سەد وەڵام
هەزار
بۆ پرسیار
بۆهەنگی پرسیار...

**خاکە لێوەی 1365**

# سەد ساڵە، سەد ئەیار

سـەد سـاڵـە
ژینـی سـەوز
بە ئاڵای ئەیارم خـشـاوە
هەشـسـەد و هەشـتـا و شـەش
لـە یەکـی ئەیارا
پڕگـەرووی «شـیـکـاگـۆ»
خـرۆشـام
بەسـیـەتـی برسـیـەتـی و کـۆیلـەیەتـی
خـرۆشـام
ئازادی
خـرۆشـام
خـاك سـەوزبـێ و ئاسـۆ سـوور
ئاسـمـان با پڕبـێ لـە ئاوازی شـادی
خـرۆشـام،
رۆسـتـەم بووم
کـاوە بووم
«ئاشـیـل» و «پرۆمـتـە» و «فـەرهـاد» بووم،
«ئیسـپارتـەکـووس» مـن بووم

رۆسـتـەمـم
رۆسـتـەمێك وەك ئەسـفـەندیار،

پۆلاپۆش
بە پۆلای یەکیەتی ئەیار
ئاشیلم،
ئاشیلێك پاژنەشم پۆلا
کە پاژنە بۆشەکەی تەفرەقەم دانا
کاوەم من،
کاوەیەك ئالا-هەڵکردوو،
نەك هەر تۆڵەی رۆڵە،
تۆڵەی گشت کردوو
پرۆمتەم
ئاگرم هێنا بۆ بەشەر
هیچ خوایەك ناتواتێ ببێ بە لەمپەر
ئیسپارتەکووسێکم لە خاچ دابەزیوو،
ئاگرم،
بەربوومە دنیای دارزیو

سەد ساڵ بوو
کە «باستیل
پێشێلی هێرشی من ببوو
ئەستێرەی «کۆمۆن»م
دەمێك بوو هەڵببوو
هەشسەد و هەشتاو شەش
یەکی مانگی ئەیار
بێترس لە کوشتار

بێخورپە لە ئیعدام
خرۆشام: ئازادی!
لە نووری کازیوەی ئەیارا،
لە زەردەی بەیانی ژێردارا،
خرۆشام: یەکیەتیم؛ ئازادیم، بۆ هەژار
ئابڵۆقەی ئاگرم؛ برووسکەم؛ بۆ ستەم، بۆ نەیار
لە زەردەی کازیوەی ژێردارا
پێنج کەس بوون؛
پێنج چاوی خۆرەتاو،
با لەبیرنەچنەوە:
«شپیس»، «لینگ»، «ئەنگل»و
«فیشەر» و
«پارسونز»
پێنج کەس بوون،
پێنج ئاڵا
پێنج سروود،
پێنج دەنگی بانگەواز
بانگەواز
بانگەواز
بانگەواز
بە هەنگاوی بڵیند
سنووری دەهاڕی
ئۆقیانووس، شاخی بەرز.

نەبوونە دیواری
بانگێشتی رزگاری.
پریشکی شیکاگۆ
بوو بەگڕ
گڕێکی دنیا-گر
سەد ساڵە
سەد ئەیار
ژینی سەوز
بە ئاڵای ئەیارم خشاوە
مکزیکۆ
تا «لەندەن»
تا «تۆکیۆ»
«ئیسکاتلەند»، تا «گدانسگ»، «سۆ ڤە تۆ»
تا «تاران،
تا ئێرە
کوردستان
لە کوردستان
پۆل-پۆل پوورەم
پۆنگ خواردووە
لە کارخانە و کوورە و کارگاو
لە مەیدان و بازاڕی شار
لەم رۆژی یەکی ئەیارا
شەپۆلێکم
لە دەریای بەرینی کارا

دەستم لە دەست
هاو-زنجیرانی هاو-مەبەست
سەرم لە ڕێز
هاو-چارانی بێ-ئەژمارا
لەم ڕۆژی یەکی ئەیارا،
ئەی ئەو کەسەی وا نامناسی!
ئەی ئەوکەسەی وا نامناسی
یا دەمناسی و خۆت گێلدەکەی،
بەڵام ، کاتێك بیری گیرفان،
گیرفانی پڕ
ئەکەیتەوە،
خێرا
بیری بازووی منی بەرگ-شڕ
ئەکەویتەوە!
تۆ نامناسی و
من دەتناسم!
لە قرچەی گەرمای هاوینا،
باری قورسی سەر شانم تۆی؛
لە سەرما و سۆڵەی زستانا
کوا نووی کوژاوەی ماڵم تۆی؛
کە دەست-بەتاڵم و بێکار
هیچم نییە لە گیرفانا
ژان و برك و نەخۆشینی مناڵم تۆی؛
لە مەشخەڵانی شۆڕشی کوردستانا

سەر-دانەوێن بۆ زاڵم تۆی؛
ئاڵای سوور من،
ئاڵای شۆڕ تۆی؛
ئازادی ئازادی، منم
زنجیری پێی ئازادی تۆی؛
دڵداری مەم و زین منم
دڵپیسی «بەکرە شۆفاری مەرگەوەر» تۆی؛
عەشقی نەمری فەرهاد منم،
دەمەتەشوێی فەرهاد-کوژ تۆی؛

***

لێرەوە
تا «گدانسك»
هەتا «سۆ وە تۆ»
پێکدەگەن
لێك دەگەن
دەنگی من بە کۆ
ئەجۆشێ؛
ئەخرۆشێ؛
کۆمەڵ ڕێك ئەخا
هەر هەستاو
دەیبینی
کۆیلەتی رووخا!
لە یەکی ئەیارا
دەنگم دەنگێکە،
بۆ هەزاری بێجەژن،

جەژنم جەژنێکە
مالّ بە مالّ، ئەگەڕێم
چی مالّی هەژار
پیرۆزبێ
یەکێتی و
جەژنەکەی ئەیار!

**1386/ 1987**

- ئاشیل: وەک ئەسفەندیار، لە ئەفسانەی ئێرانیدا، ئاشیلیش، لە ئەفسانەی یۆنانی کۆندا، پالّەوانێکی پۆلاپۆش بوو، تەنیا پاژنەی نەبێ!
- باستیل : زیندانی کۆنی فەرانسا کەلە شۆڕشی 1789دا، روخێندرا
- کۆمۆن: یەکەمین حکوومەتی کارگەری کە بە شۆڕشی کرێکارانی پاریس بەرپابوو – 1871
- ئیسپەرتاکووس: کۆیلەی ڕێبەری شۆڕشی کۆیلەکانی ڕۆم

## با هیچ خەمێ ڕێی پێنەگرێ

با هیچ خەمێ
ڕێی پێنەگرێ
نە ڕۆمەڵخەزای شاران و
نە بۆمبارانی هەڵەبجەو
نەجەهەننەمی جەبهەکان
با هیچ خەمێ ڕێی پێنەگرێ؛
جەژنی شادی «ئەیار»ە دێ!
نەبێکاری
نەبرسیەتی
ڕەنگ-زەردی منداڵی پەتی

نە؛ هیچ خەمێ
با
ڕێ بەم شادییە نەگرێ!
بخرۆشێ!
سروود بڵێ!
با ئاڵای سوور بەلرفە بێ؛
با ورشەی چاو، بروسکە بێ
شریخەت هەورە-گرمە بێ
با دنیایەك شادی و سەوزی و بەهرەمەندی
لە ناخی زەوی هەڵقوڵێ

با هیچ خەمێ ڕێی پێنەگرێ
وەك چریكەی هەزاران باڵندەی بەهار
تێ-چریكێنە سروودی
یەكی ئەیار!

ئاخر ئەمساڵ
دەیان و سەدان
هەزاران
ئیعتسابمان بەدەستەوە
سەدان جار دێینە خیابان
تێ-چریكێنە سروودی یەكی ئەیار
ئاخر ئەمساڵ
دەیان هەزار هێرش و هەڵمەت
دەبەینە سەر كۆیلەیەتی!
لە «كۆریا»، «ئەفریقا»، «ئەلمان»
«ئینگلیز»، «ئەمریكا» «لەهستان»
لە هەر شوێنێك دەستمان بڕوا
ئاڵقە-ئاڵقەی ئەم زنجیرە
ئەپچڕێنین؛
وەك مارشی پتەوی ئەمڕۆ
هەنگاو بەرەوپێش هەڵدێنین
نیزامی كۆیلەیەتی كرێ
دائەڕزێنێن؛ ئەیفەوتێنین!

با هیچ خەمێ رێی پێنەگرێ!
زۆرمان دژواری کێشاوە
زۆریان دژواری پێچەشتین؛
لە کوردستان،
هەزار-یەکێك لەو تاڵاوەم
کرد بە گەرووی چەقۆیەکدا؛
چەقۆ، سەرتاخوار، دوو-لەت بوو؛
دەم تا مشتوو!
با هیچ خەمێ رێی پێ نەرگرێ؛
ساڵمان لە ساڵ خۆشتر ئەبێ؛
وەك چریکەی هەزار مناڵی کرێکار
تێ-چریکێنە سروودی
یەکی ئەیار!

# جەژنی ئەیارم خۆش ئەویَ

لە زمان منالێکەوە

باوکم وتی:
رۆڵە، نەورۆز سەری ساڵە؛ ژیانەوەی کشت وکاڵە؛
جەژنی گوڵ و گیای سەر زەوی...
دایکم وتی:
رۆڵە، قوربان و رەمەزان
جەژنن ، بەڵام،
ئێستاش نەمزانیوە بۆچی!؟
گوێشم لێبوو،
پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە
وتی: رۆژی یەکی ئەیار
رۆژێکە وا
کۆمەڵ-کۆمەڵی کرێکار،
گشت بە یەك زار
لەو جەژنەدا دەنگ هەڵدێنن:
بەسیەتی، بەسیەتی
ستەم و کۆیلەتی، بەسیەتی؛
وەختیەتی، وەختەیەتی
وشیاری و یەکێتی؛
وەختیەتی!
پرسیم: ئەمانە یانی چی؟
وتی:

یانیٚ؛ دایکت، باوکت، ماندوونەبن؛
ئێوارانە، گەلێك زووتر
دەستیان هەڵگرتبیٚ لە کار؛
بە دەستی پڕ، بێنەوە ماڵ؛
هەر خۆیان، گەورەی خۆیان بن
هیچ لە دەسڕەنجیان نەڕفێنن؛
تۆیش لە مەدرەسە بخوێنی
نەك شەکەت بیٚ لەشت
بە کار!
وتی:
یانی؛ ژیان بیٚ ئەزیەت و ئازار
بیٚ لێدان وبیٚ تووڕەیی
پڕ لە مۆسیقا و گۆرانی و
ئاوازی شاد
ژیانی سەربەست و ئازاد
وتی:
ئەیار، جەژنێکە وا
مژدە ئەدا
بۆ بەهارێك
نەك هەرسیٚ مانگ
هەتا هەتایە بەهارە!
چەند ئەم قسانەم پێخۆشە!
شادمانی و جەژنی ئەیارم خۆشئەویٚ؛
جەژنی ئەیارم خۆشئەویٚ!

**بەهاری1364**

## ماسی

ئێمەی ماسی ڕۆخانەی خوڕ
فێرین چلۆن
لە ناو تاشەبەردی تیژا
مەلە بکەین
بێین و بچین
بژین
هەڵدەین و
بخەملێین
بەبێ ئەوەی
ملمان بشکێ!

## لێم دەپرسی

لێم دەپرسی
«کەی بوو چاوت بە ژین پشکووت؟»
ژین بوو چاوی بە من پشکووت!
دایك و باوکی ژین هەر خۆمم
نە ژین دەناسم و نەمەرگ
رۆژێك گوڵم
رۆژێك میوەم
رۆژێك دانم
هەمیشەش وەك ئاسمانی شین
بەسەر
بە رۆژ و نزاری
ئەم جیهانەدا دەڕوانم
لە خوداوەند قەدیم ترم
نەمر خۆمم
هەمیشەم من؛
نە پرسیاری»کەی پشکووتم» جوابی هەیە
نە بەتەمای شین و گڵکۆم!
چاوەڕوان بە!

## کاتێك شەش دەرت گیراوە

کاتێك شەش-دەرت گیراوە،
پەڕی شیعر دێتە فریات
پەڕی شیعر بە وەفایە
گوێ نادا، تۆ،
چەندە بێ وەفا بووی بۆ ئەو؛
پاش ئەوەش رزگاری کردی
ئەگەر ساردیت لێ ببینێ
ئەدا لە شەقەی شاباڵ و
ئەڕوا
تا
سەفەرێکی ترا!

## جێ پێ

بروسکە و تاریکی
شەڕیانە؛
بە ڕێژنەی خوڕەمی باراناو،
گەڵاکان، خۆئەشۆن؛
دارەکان،
دەستە سەوزەکانی دۆڵ و شاخ
بە پەنجەی گەڵایان
سڵاو لە بارانی خوڕەم و با ئەکەن؛
هەرجارەش
برووسکە ئەدوێنن...
تاریکی قیرسیچمە و
ناهێڵی
کاژەلەی چاوانی بەتاسەم،
تاسەیان بشکێ، لە
شیری نوور،
دیمەنی سەوز و جوان؛
برووسکە
نێزەیە و تاریکی-تارێنە؛
برووسکە
شیعرێکە چریکەی دڵ-بزوێن
برووسکە

رۆشنایی...
بەڵام ئاخ:
جێگە پێی بچکۆلەی «گەلاوێژ»
لەسەر قوڕ نەخشابوو؛
نیوەڕۆ
خەڵکەکە،
لە ترسی بۆمباران،
پەریوەی دەربووبوون؛
هاتن بۆ پەناگا.
گەلاوێژ،
سرك و جوان،
کەوتبوە پێش دایکی
پێی پەتی تەزیوی
پێکەنینی لێوی؛
بزەی دوو چاوانی...
کاژەلە سرکەکەی پێ پەتی!
ئێستاکە،
لە ژێر ئەم بارانە ساردەدا
ئاخۆ تۆ
لە کام کەپری شڕا
باخەڵی دایکی خۆت
کردوەتە پەناگا؟

پاییزی 1365

# بەختە-باران

لە شکرێك شەونم سەرو ژێر...
لەشکرێك ماچی فێنك بوو،
گەڵاکانی
ئەم-شان و ئەو-شان ئەکرد و
رایان دەمووسین، بۆ درێغ؛
لەشکرێك عەتر و گوڵاو بوو
بۆنی خاکی ئاو-لێپژاو
لە شکرێك سپووری کار-پوخت
دەم و چاوی خیابانیان
وەك روخساری قولە-رەشێك
گەش، بە مژدەی بەرابەری،
رەش و پڕشەوق
ئەشۆردەوە.
منیش هاتبوومە سەما؛
رووت و پەتی،
چوومە بەری.
بەڵام کەی بووە بەهرەی من
لە شادی وا،
لە سەرچاوەی هەرەپوختی
جوانی ئاوا،
هەتا سەربێ؟!

هاتە پێش چاوم سێڵاوی جنووبی شار
چەند روخساری
مناڵی لە قوڕ-گەوازوی
ماڵی هەژار؛
ژەنگی مەزرا؛
دۆوکی بێستان؛
هاتە پێش چاوم هەزاران
ماڵی ئاوارەی بێ دەوار؛
بێ دەوارانی ئاوارە
نەحەساوە
لە تیر و تۆپ و خومپارە؛
مناڵەکان،
دێن و دەچن
هیچ سەرپەنایەك شك نابەن؛
جنێو بە ئەرز، ئاسمان، ئەدەن؛
ئەمانەم هاتە پێش چاوان...
شادیم لێبوو بە ژەقنەمووت!!

# هاوڕەنج

هاوڕەنجەکەم؛
نامەت کە هات
سەرت بوو
نات بە سینگمەوە؛
پەرێشانی و پەژارەت بوو،
ناسیمەوە؛
گۆرانییەکی خەماوی بوو
لە تۆی دڵ و دەروونتەوە
لە گەل ئەم دڵەی ئاشنا،
تێر-تێر دوا؛
منیش خێرا
چەپکێ گوڵی زەردەخەندەم
بە پیراییتەوە هێنا؛
ئەی ژنە نازەنیکە!
دەستی خۆشەویستم ئاڵاند،
بەدەوری شان و باڵاتا؛
قژە جوانەکانتم، تێر-تێر،
بۆن پێوەنا؛ پەژارەکەم لێ وەرگرتی؛
رووتم بەرەو
ئاسۆی گەشی
بەری بەیانی وەرگەڕاند
تا فرمێسکت بوو بە شەونم
لەسەر گوڵی
روومەتی سووری گەشاوەت.
گوڵ خەندەران!

**بەهاری 1364**

# خۆشەویستیت

چاوەکانم
هەر کوێ ئەچی،
وەك نەسیم بی،
بۆنی خۆشی میهرەبانی،
بە شوێنتا ئەشنێتەوە؛
وەك چرا بی،
تەمی ڕەشی چی-تاریکی،
لە پێشی پێت ئەکشێتەوە؛
هەر بەو جۆرەش،
خۆشەویستیت
لە دڵمدا،
بەو نەسیمە ئەشنێتەوە؛
بەو چرا، ئەگەشێتەوە؛

**بەهاری 1362**

# وەڵام

چاوەکانم
سڵاوێکی پێشمەرگانە،
سڵاوێکی گەش و بۆن خۆش
سڵاوێکی شاعیرانەت
پێشکەش ئەکەم؛
خاتر-نامە شیعراویەکەتم پێگەیشت
چەندە خۆشە
چەندە پڕە
لە عەتری بۆن-خۆشترین گوڵ
عەتری تاسە و چاوە-نوارِی
هی تەلیسمی
دڵ-داخورپێنی دڵداری
وتم: شەرت بێ
لە وەڵامی نامەکەتا
شیعرێکی جوانت بۆ بێژم!
زۆر هەوڵم دا؛
پەریچەی شیعری بێ پەیمان

(هەرچەند بەحاڵ هاتە زمان)
بەڵام چاك نەهاتە سەما...
نەكەوتە سەربەستە و بەندان؛
سەر شەپۆلی
هەست هارووژێنی

مۆسیقا؛
لە ئەنجاما
بوو بە شەڕمان!
ئێستا تۆراوم لە پەری!
مەگەر خۆت بێی
لە گوڵزاری دڵی میهرەبانەكەتا
دیسان پەری
بێتە شیرینترین سەما

**پایزی 1362**

## وەرە

چاوەکەمی؛
شیرینەکەم!
ئەگەر مەبەستت ئەوە بوو
گڕی تاسەم تۆ بەربدەی
ئەگەر ویستت
نوقمی دەریای تاسەم بکەی
ئەگەر ویستت
هاوارم بەرزببێتەوە
کە پێت بڵێم:
وەرە؛ تو گیانی خۆت، وەرە؛
ئارەقی گەرمی ماندوویيم و ماندوويت،
بەشنەی نەسیمی هاتن،
لەدەست و لە هەست، لابەرە؛
ئەگەر ویستت
کوردی و کورتی
بڵێم: وەرە؛
بەچاوان، گوێ بەفەرمانم
پڕ تاسەتر لە هەرجارێك
ئەڵێم: وەرە!

**بەهاری 1362**

# سەرنجی مانگ

مانگ،
لە خاڵیایی هەورەوە
وێنەی کچێکی لێهاتوو
چۆن پەنجەرە دەکاتەوە
بەدەم هاتوچۆی کارەوە
سەرنجێکیش رادەدێرێ
بۆ دنیای دەر،
سەرنجمی دا؛
دڵەی سەر-شێتی دەربەدەر
تاهات جوابی سەرنجەکەی بداتەوە
پەنجەرەی خاڵیایی هەوری
لێ داخرا!

**هاوینی 1361**

# دوو گەلاوێژ

ئاسمانێك بەو بەرینییەو
یەك گەلاوێژ!
بەڵام چاوە گەشەگانت
جووتێك گەلاوێژی گەشن؛
جووتێك باڵندەی تیژپەڕن،
لە ئاسمانی چاوەكانما
بە گەرووی گەشی بیلبیلە
پڕ بە هەزار
باخی بەهار
ئەجریوێنن
خۆزگە ئەمزانی ئەڵێن چی!؟

# ئاو

ئەڵبەت ئەڵێی
ئەمن کێوم
نەوی نابم؛
منیش ئاوم
ماندوو نابم
داتدێنم و دەتشۆرمەوە!
بەردی لووتکەت
دەهێنمە پێدەشتی نەوی؛
دەچمە نێوان
چی درزی بەردی بەندەنت
دەبمە سەهۆڵ،
دەتتەقێنم؛
دەتروخێنم!

**زستانی 1363**

# درەخت

درەختێکم
لە تیرەی بەرزە-درەختان
بە ئارەقی ڕەنج و خەبات پەروەردە بووم
بنجم هەزار پۆیە و
لە نێو زاخە و
کۆڵێت و زنجی شار و دێ
ڕۆچووم
ڕۆچووم
لق و پۆم باڵای کردەوە و
پەل لە ئەستێرە دەکوتم و
بێباك لە چی تەور و تەوراس
بەرەو هەتاو
بە گژ هەوری چڵکن دا چووم
***
تۆف و کرێوە و با بابێ
باکی نییە
ئەو درەختەی
بنجی هەزار پۆی لە دڵی
کۆمەڵانی ڕق-ئەستووری وریادا بێ
تەوژمێکم
لە بای سەرسەر
مەینەتاوی ستەم تێکدەر

هەزار نەسیمی خۆش پەیام
ئەشنێ لە هانای هەناسەم
بۆ گشت بەشەر؛
گزنگێکم
لەبەربەیان
تیشکاوێژی چی دەلاقەیماڵی تاریك
گەنم، گەرما، رووناکی، تین
دیاریمە
دیاریمە بۆ ژین

لەم جیهانا من کێوێکم
هەر دۆڵێك، هەر داوێنێکم
خەرمان-خەرمان
گوڵی سووری ئاڵای ئاڵە

بەرهەمێکی
رقی پیرۆزی کارخانەم؛
من سەمەرەی
بێ سەمەری
رەنجی گەرمی کوورەخانەم؛
هیوای دەستی بێ حەقدەستی
بێ بەشی بێ خانە و لانەم؛
راست کەروەری جیهانی کۆنی ئاوە ژووم
میعمارێکی نوێکردنەوەی ئەم جیهانەم

من مستێکم لە هەزار مست
گرێکراو
راساوم لە ژێر چەناگەی
دێوی دزێوی سەرمایە
ئەمن دەستێکی تامەزرۆم
تامەزرۆی یەکبوون، یارمەتی
دەستانی کار
بۆ تێکدانی
ئەم ستەم-مەینەتاوایە
بۆ خولقانی
ئەو دنیایە
ستەم تێیدا ئەفسایە و
شەتی خرۆشانی شادی و بەهرەمەندی
دەریایەکە
دوایی نایە!

**زستانی1986**

## نەرگسی بەر باران

تازە حەمام؛
چاوی شەهلات
پیاڵەیەك هەنگوین و شیرە
پڕ-پڕە لە
خۆشەویستی و
شیرینی ژین
پڕە لە زەردەی شەرمێون
بیرەوەری
شەرمی شیرینی ئەوکاتەی
بێ خەبەر
دەرگام کردەوە
لە ژێر هەڵمی ئاوی گەرما
چەمای خەمای
تا نەتبینم
باخی سێوانت شاردەوە
ویستت دەرگات لێ پێوەدەم
تا بۆنت نەگاتە بینم
...
وێنەی مەرمەڕێکی بێگەرد
بەدوندی لووتکەی جوانییەوە
لەناو هەوری حەریریدا،
غرووری رووت و پەتی بووی
بەچاو

وتم بە پەیکەرت،
وتم:
پەیکەرەی مەڕمەڕی
وتم: ڤێنووسی تاشراوی
وتم: لەشت مەشارەوە،
با بتبینم؛
ئەی پەری ئاسمانی جوانی...
خەندەی چاوت،
چاوی شەهلات
لە ژێر ڕێژنەی ئاوەکەوە
وێنەی نەرگسی بەر باران،
چۆن دەشەمزێ،
شپرزاو
دواندی نیگام؛
دواندنی سەرگەردانی!
تازەحەمام!
دیمەنی وا نیگا-لاوێن،
وەك شیعرێکی تەڕی حافز،
هەر بۆ دەور کردنەوە چاکە
کۆتوپر،دەرگام کردەوە
دەریای جوانی وشیرینی ژین
لە پەنجەرەی تەمی بەهاراوییەوە
خۆی نیشاندام
کەچی نەتهێشت
مەلی نیگام

ئازاد و تێر مەلە بکا
لە دەریای بلووری جوانی
بەسەمایەکی ئاسمانی
پێچتدا لە
ئەندامی وەك پەیکەرەی رووتی یۆنانی؛
بەڵام نیگای چاوی شەهلا
کانیاوێکی
شەتاوی گەشی بەهاری
بەردایە ناو
مەزرای نیگای چاوەکانم
چاوەکانم روون بوونەوە
مانای نیگاکەتی زانی
ئێستاش منم و چاوەڕوانی
تا نەرگسی چاوەکانت
بە سەرنجێکی گەرم و گەش
تاسەی سەرنجم بشکێنێ
گیانی ماندووم پاراو بکا
وەك زنوێر
بە ئاوی کانی!

**زستانی 1360**

# ئاخێزێك

کوردستان
دەمێکە گڕکانی بە-کڵپەی شۆڕشی
گەلێك جار
لە سووتووی خۆتەوە
هەمدیسان
ئاگرت گرتەوە
بۆ فەوتانی ستەم
بڵێسەت سەندەوە
کەچی هەر
نامراد
تامەزرۆی ئازادی
مایتەوە!
ئەزانم کە چەندجار
بە گورگان-خواردی دای
ڕێوی شوان؛
کوردستان!
کوردستان؛
مەڵبەندی کۆڵنەدان
بە ستەم خوو-نەگر
ئەی دایکی چەنای چەند شۆڕشی جوانەمەرگ،
لە ستەم یاخی بوو،
ئەی ئاگر؛
ئەی لە پاش چەنای چەند هەڵس و کەوت

هەمدیسان تێهەڵچوو
بە تینتر؛
چلۆن بوو
گشت جارێك
ئاواتی ئازادیت
پەرپووت بوو؟
کۆرپەکەی شۆڕشت
پیرێك بوو
پێش ئەوەی پێ بگرێ
سەری لە گوێی قەبری هەرەسا
ئەلەرزی؟
سەرچۆپی شایی-گێڕ
زەروو بوو؟
کە دەمی ناوەتە خوێنی تۆ؟
دڕووبوو؟
ریشەکەی تێراوی ئارەقی رەنجی تۆ؟
ستەم بوو؟
دەس-کیسی دوژمنی ستەمگەر؟
بۆ ملی ئازادی
چۆن نابێ بە چەقۆ؟
زەروو بوو
دڕوو بوو
دەس-کیسی دوژمن بوو
دوژمن بوو
چۆن هەرەس ناهێنێ بە هیوات؟
بە رزگار-بوونی تۆ؟
کوردستان؛
مەڵبەندی کۆڵنەدان

بە ستەم خوو نەگر
ئەی دیسان سەر-هەڵبڕ
بە نێو-چاوانتەوە
ئەمجارە،
تیشکێکی نوێ دیارە
ئەو تیشکەی
نەمامی ئاواتی رزگاری یەکجاری
لە قووڵایی دڵی ڕەنجدەرانا خەملاّن
ئەو تیشکەی دەگاتە هەر زنجیێك،
هەر ماڵی ژین-تاڵێك
شەوقێکی ئامانجە
لە چاوی موشتاقی پیاو و ژن؛
بزەی سەر لێوانی
مناڵی ڕەش و ڕووت؛
بۆ زنجیر، شریخەی پچڕانە!
برووسکەی فەوتانە،
کاتێك کە دائەدا بۆ دوژمن؛
پێشمەرگەی پێشڕەوی کۆمەڵەی کوردستان!
کوردستان؛
گیرۆدەی ژێر عابای پشووبڕ؛
گیرۆدەی گێژاوی مەینەتی ڕۆژ لە ڕۆژ پەرەگر؛
کراسی مەینەتت دادڕە!
سەری سەرفەرازیت،
یەکجاری هەڵبڕە!
پێشێلی چی-ستەم، کوردستان؛
یاخی بە!

ئەمجارە،
دوژمنی چی-ستەم چی-زنجیر
کارگەرت رابەرە؛
ئەمجارە،
جەسوورێك ڕابەرە،
ئاخیزی بەرو پێش
هێلانەی چۆلەکەی هیواکەی
درەختی بژوێنی دوارۆژە و
ماڵاوای یەکجاری
لە دوێنێ و لە هەرەس، کردووە
ئەمجارە،
دڵسۆزێك رابەرە
مەچەکی چەقۆگر،
مەچەکی هەرەسی،
لە پنجەی پڕهێزا، گوشیوە و
چەقۆکەی سەر ملی ئازادی،
لە دەستی دادەخا!
بە ستەم خوو-نەگر،
کوردستان؛
یاخی بەو
ئاخیزێك تا هەستان!
کراسی چی مەینەت
یەکجاری دادڕە!
سەری سەرفەرازیت
یەکجاری هەڵبڕە!

**بەهاری 1365**

# سڵاو

سڵاو،
که گەرم و گەش نەبوو،
بەکارنایە!
سڵاوی سارد و سڕ
یانی:
ماڵیات دەدەم؛
دەچەوسێمەوە،
مل داکێش؛
تۆ سەرداربە!
بەرقەراربی؛
هەر تۆسوار بە!
من چاوم سپی، پیادەم!
نەك پیادە،
من چارەوێم؛
فەرموو؛ سوار بە!
کۆیلەم؛ رەعیەتم؛ کارگەرم!
تۆ کۆیلەدار؛ تۆ ئاغا؛ سەرمایەداربە!

## بمتوانیایە

بمتوانیایە
بە تۆڕێك خۆرەتاو بگرم
لە نێوەڕاستی ئاسمانا
قەتیسی کەم؛
بمتوانیایە
هەردوولاقی باریکەڵەی سەعاتەکەی سەر مەچەکم
پێوەند کردایە
هەڵنەیەن؛
بمتوانیایە
هەر ئێستاکە
هەموو بانگەوازەکانی مارکس و لێنین
بە شیعری خۆش
بە گوێی دڵانی موشتاقی
بەشمەینەتانی سەرزەمین
بگەیەنم.
ئەمجار،
تۆرم دەکردەوە؛
جەژنێکی هێندە شکۆدار
بەرپا دەبوو،
ئیتر خۆر، دڵی نەدەهات
جێمان بێڵێ!

**پایزی 1366**

# ژانی لەدەستچوونی یاران

بۆ کچێکی ئیعدام کراو لە شاری سەقز

قەڵا لە جەرگمان دەکەندرێ،
کە شێت نابین!
گێڕایەوە:
دەستێك لیباسی کچانەی
سێ-چوار کون تێ
سوور-بوو بەخوێن
لەگەل جووتێك کەوشی وێڕنی
ناسکی پاژنە خوێناوی
فڕێدرایە نێو حەوش و
نێوکۆشی دایك؛
لەگەل، ئەسکەناسێکی پەنجا-تمەنی:
«- ئەو پارەیەش،
مارەیی کچەکەتانە!!»

قەرەنەی بام،
پڕ بە سورنام
دەم قیژان : «ژان» و
دەم پیقان!

گەر تەپڵ بام
وام لە ورگی بەتاڵ دەدا
بانم بەسەردا رووخابا!
ویۆلۆن بام
وام ئارشە لەکەمان دەدا
هەموو ژێەکانم بە جارێك
بقیژایەن
چەنگیان خستایەتە جەرگی
هەموو ویژدانێکی بێفەڕ
***
بوغزم قووت داو
چاوم بڕیە بەرژەوەند و
بەرەو ئاسۆ،
رێم گرتە بەر...

**هاوینی 1362**

# ئەی رابەرە دڵسۆزەکە

بۆ برام ، هاوڕێم، «مووسا»

نێو-چاوانت قەڵەشاوە و
لە پەناما دانیشتووی
لەناو بڵێسەی خوێنەوە
ئاوا؛
هەی داد؛
تێم ئەڕوانی
چ سەرزەنشتێکم ئەکەی!؟
بۆچی ئەمن کامە کێوم
کە بەم چەشنە
گڕ-کانت خستە دڵمەوە !؟
***
خەڵکی گریان
بە هەزار چاو
هەزاران هەژار خرۆشان
بە هەزار دڵ
کە بۆچی پەژارەکانی
ئەو ئازیزە دڵسۆزەتان
لە دڵە شەیدای عاشقەکەی
نەسڕیەوە،
با دەست بۆ نێو-چاوان نەباو

دڵی ئێمەی هەژار، ئاوا؛
خەڵتانی خوێن و گڕ، نەکا!؟
ئەمنیش هەر
بە عەشقی سووری ئازیزیان
سوێندم ئەدان
هەزار پەنجەم، بەرەو دوژمن،
وەك سیرەگرتن،
راکێشا
بەڵام روانینی تەماوی هەژارەکان
لە چاومدا،
بەسەرشانی نیگامەوە
قورسە و گران...
هەزار بریا
بمتوانیبا
نیگایانم، وەك نێزەیەك،
تیژ کردایە،
کە لە ناخی قووڵاییەکانەوە رۆچێ
تا لەو دیوی نێو-چاوانی قەڵەشاوی « کاك مووسا»وە
لەودیو دڵی بریندار و شەقارمەوە
ریشەی دەردەکە ببینێ و
هاواری کا!!
با، بەس سەر-زەنشتم کەیت و
دەستی یارمەتی دا بیلی
با، دەست و بیروباوەڕی

هەزار هەزار
خەڵکی هەژار
زامی دڵی بریندارم
سارێژ بکا
***

کاتێك کە مرد،
بەیانی بوو...
کاتێك کە مرد،
ئاسمانی مات،
ئاسمانی چۆڵ، لە مانگ و ئەستێرە و لە خۆر،
تابلۆیەکی خۆڵینەیی خەفەتبار بوو...
بۆیە، هەرچیم لێئەپرسین
نە مانگ، نە ئەستێرە، نە خۆر،
ئاگاداری مەرگی نەبوون؛
هەرچیم پرسی،
غەیری کاسی
جوابێکیان پێ نەدامەوە!
***

کاتێك کە مرد،
چما گوڵ بوو
لە کوێستانی دڵم، دامرد!

لە خەونمدا سکاڵای کرد:
-مەگەر بەخەون سکاڵایم بدیبایە-

لە خەونمدا سکاڵای کرد.

هەر بەیەك روانینی چاوم
کە ئاوێنەی باڵا-نوێنی شکۆی ئەو بوو،
هەستی بە مەزنی خۆی کرد؛
ئیتر، دەستی گێڕایەوە
ئیتر، دەستی بۆ نێو-چاوانی پان و گەش
نەبرد؛
نەمرد؛
لە خەونمدا!
لە خەونمدا
هات،
شکۆدار
پۆشتە و پەرداخ و پرچەك و شۆخ و سالار
هاتبوو بۆ لام
بەڵام هەیهات
پشتی تێهەڵکردبووم و
هەرچیم ئەکرد
نە نێو-چاوی گەش و پانی
نە روخساری میهرەبانی
بەدڵە تاسەبارەکەم
نەدا نیشان
نەیدواندم
هەرچیم دوان...

***

چەپکێ گوڵم
بە پیرایتیەوە هێنا
با پێکەنی
تۆ خۆت گوڵ بووی هەمیشە گەش
گەشی و رووخۆشی و پێکەنین
تێکۆشان و پشوو نەدان
سەمەر بەخشین بە ژیانمان
ئاوا، تەسەل، پڕ و پەیمان
ئێستاش ئەبێ لە تۆ فێربین!
***
-بۆچی وات کرد ؟
-ئەی بۆ ناتوانم نەهێڵم
منداڵەکان سەرمایان بێ؟!
-بۆچی وات کرد !؟
-ئەی بۆ ناتوانم نەهێڵم
پێشمەرگەکان سەرمایان بێ؟!
ئەی بۆ ناتوانم نەهێڵم
پێشمەرگەکان برسییان بێ؟!
ئەی بۆ توانام نەماوە
ئەم ئینسانە تەڵ-بژێرە دڵێرانە،
تێر و تەسەل و حەساوە،
بکەم بە گژ تاریکیدا؟!
بکەم بە گژ
سەرچاوەی چارە-ڕەشیدا؟!
ئەی بۆ ناتوانم...
***

دەی، هەی هاوار؛
ئەو هەموو خۆشەویستەت بوو
بۆ یەك كەلیمەت نەدركاند؟!
ئەی بۆ هەرتاقە یەك وشە
یەك كەلیمەت
بۆ ئەم هاوڕێ و برا دڵشكاوەت
نەدەنووسی؟!
جەخار ... جەخار
دڵی بەكوڵ گڕ-تێ-بەردراوم
هاوار!
ئەمە وابوو؟
وابوو و
من نەمزانیبوو؟
لە قووڵایی گەشی و رووخۆشیتا،
ئاوا،
دڵت پڕ بوو؟
ئاوا، گڕ-كانێك رەنج و خەم لە دڵتابوو؟
خەسار ... خەسار
دڵی بەكوڵ گڕ-تێ-بەردراوم،
هاوار!

***

بەسەر هەموو ئەمانەدا؛
چۆن دڵت هات جێمان بێڵی؟!
چۆن دڵت هات
بەبێ-خۆتمان بخەیتەوە؟!

چۆن دڵت هات
پێشمەرگەکان چاوەڕوان بێڵیتەوە؟!
هاوڕێیانی نانەوایی، بەری بەیان،
چاوە-ڕوان بوون،
چۆن دڵت هات
وەك هەموو رۆژ
نەچی،ماندوو-نەبینییان لێکەی؟
لەو کاتەدا
بیرت نەبوو؟
بیرت نەبوو، بەزەردەی زەهراوی دوژمن،
چۆن دڵی من
لەگەڵ هەزار دڵی هەژار
ئەگوشرێت و
چۆن چاومان ئەتۆزێتەوە؟
لەو ساتەدا
تەنانەت پرسیارێکیشت
لە دڵە دڵسۆزەکەی خۆت بکردایە
بزانە قەت دڵت دەهات
بەبێ-خۆتمان بخەیتەوە؟
***
نەتکردایە؛ نەتکردایە؛
ئاوا، کۆڵەکەی پەیکەرت
بەلادا، نەڕوخاندایە
چ کارێك بووا؟
ئەڵێم بڵێم

دڵرەق! بۆچی لەوکاتەدا،
بۆچی ئێمەت لە بیر نەبوو؛
بەڵام چی بکەم
دڵم نایە
دڵم نایە؛...

***

نە؛ وانەبوو!
نە؛ وا نەبوو، تۆ بەهێزبووی؛
پاڵەوان بووی، ڕێبەر بووی؛ ڕێ-نیشاندەری
هۆزی پاڵە و ڕەنجدەران بووی...

من بەهیوام
کە تۆ ئێستاش،
پاش ئەم دەردەش،
یارمەتی-دەری ڕێگام بی!
بە گفتوگۆی ڕێ-نوێنت
بە ڕووخۆشی و پێکەنینت،
خارای سەختی دڵنیام بی
ئەی رابەرە دڵسۆزەکە!
ئاخر،هەر کەسێك ئەبینم
باسی گەشی و خۆشیت ئەکا:
ئاخر-جارێك کە من بینیم
گوردانێك پێشمەرگەی بەرەو
پشتی جەبهە، بەڕێ-ئەکرد...
ئاخر-جارێك کە من بینیم
نامەی بۆ ناو-شار ئەنووسی

ڕێنوێنی بۆ ئەناردن...
ئاخر-جارێك كە من بینیم
نامەی بۆ دێهات ئەنووسی
کاروباری پێئەسپاردن؛...
ئاخر-جارێك كە من بینیم
سەری نیگەهبانی ئەدا...
ئاخر-جارێك كە من بینیم
لە ماڵێكی بەش-مەینەتا
بەتاقەت،
بە میهرەبانی
خەریكی كردنەوەی گرێ
كردنەوەی دەلاقەی روون بوو
بۆ بەرەژەوەند
بۆ داهاتوو؛...
ئاخر-جارێك كە من بینیم
سەر چۆپی ریزی هەڵپەڕكێی
پێشمەرگەكانی گرتبوو؛...
ئاخر-جارێك كە من بینیم
كۆمەڵێك منالی لە خۆ كۆكردبووەوە،
كایەكی فێر ئەكردن؛...
ئاخر-جارێك كە من بینیم...
***

ئەی رابەرە دڵسۆزەكە
ئەی بەڕەنجی ئینسانەكان
دڵ-پر-رەنجی پیرۆزەكە
تابلۆ تابلۆ،

بۆت ئەنووسم
قەسیدەیەك سكاڵای دڵ؛
هەر وشەیەك،
وەك مرواری
لە دەریای فرمێسكی گەشا ئەشۆمەوە و
دانە-دانە، ئەی نێمە لای یەكترین و
شیعرەكەی تۆ ئەهۆنمەوە
***
ئەمە خوێنی ڕەگەكانمە
قەترە-قەترە ئەیان گریەم
ئەیكەمە لەعل و یاقووت و
ئەی هۆنمەوە بۆ «مووسا»

خۆزگە
خۆزگە
توانیبێتم
ئاوێینەی باڵا-نوێن بم
ئەو چنارە سەرفەرازە
كە وەك هەرەسهێنانی كێو
بەسەر پشتم دا شكاوە،
بۆ ئێوە خەڵكی مەینەت-بەش
ئێوەی خۆشەویستی «مووسا»
بەخوێن و ڕەنجی هەزاران ڕۆڵەی ئاوا
پاڵەوانانی وەك «مووسا»
ئاسۆتان گەش؛
پڕبە-پڕی دڵ

بنوێنم
با بزانن!
با نەوە داهاتووەکان هەڵیگرن
لەم سەردەما
لەم سەرما و تاریکی و تەما
شاسوارێکی ئاوا ئازا
بۆ ڕەنج و بۆ چارەڕەشی ئینسانەکان،
ئاوا گریا!
با بزانن
لەم سەردەما
لەم سەرما و تاریکی و تەما
کەڵە-پیاوی ئازای ئاوا
پشتی دایە بەر ئازاری گرانیان و
پشتی شکا!
بابزانن
با لە جەژن و خۆشیانا
یادمان بکەن؛
//
لە ئەو
کە بەڕەنجی شان و
بەزمان ، بە دڵ، بیر و بڕوا
بەدەس، بە لەش، بە چەك، ئاگر،
چوو بە گژ قەڵای ستەما؛
چەنای چەند جار،
رق و قەهری شۆڕشگێڕی
بەسەر ستەمگەرا رووخا؛
چەنای چەند جار

دەستی گرانی زاڵمی
لەسەر زاری خنکێندراوی
هۆزی بەشمەینەتان، لادا؛
خۆشی و خەندە و میهرەبانی
ڕێگای ڕوونی کامەرانی
وەکو دیاری یەکی شیرین
ئەبرد بۆیان
ماڵ بە ماڵ
دەرگا بە دەرگا؛

با بزانن
با لە جەژن و خۆشیانا
یادمان بکەن؛
//
لە من
کە لە پرسانەی دا
بە هەزار مەرهەمی شیرین
قسەی خۆش و گەرم و بەتین
هی هاوڕێ و دۆست و هەڤاڵی «کاکە مووسا»،
هێشتا لێم دانەمرکاوە
دڵی برین؛
لە من کە دڵم شکاوە
لە من کە دڵم خاراوە
سەرەڕای سەد برینی قووڵ
ئالام تا ئاسمان هەڵداوە!

**پایزی 1363**

# هەتاو نەبوو

بۆ هاوڕێ «خوسرەو رەشیدیان»

ئەی ئەوانەی
کە روخساری خۆشەویستی هاوڕێ «خوسرەو»
لەگەل خەندە و شیعرەکانی
لە دڵتانا
هەمیشە و دایم زیندووە؛
ئەی ئەوانەی
مژدەی رۆژی رزگاریتان
لە شێوەدوانی شیرینی،
بە هەزار شێوە، بیستووە؛
ئەی ئەوانەی
هاوڕێ»خوسرەو»ی رابەرتان،
فەرماندەی سەنگەر-شکێنی جەنگاوەرتان،
لە ئاگرا،
لە بڵێسەی بەرزی گڕا
دڵسۆز و بەدەربەست، دیوە؛
ئەی ئەوانەی
لە رۆشنایی ئەو برووسکە
کە لە جەرگی شەوی چڕا
دڕنی بە تاریکی ئەدا
هیواتان گەش

ڕێگاتان روون
دەست و دڵتان قایم؛ پتەو؛
لەو ڕێبازە گرێداوە؛
ئەی ئەوانەی
دەرسی بێخەوشی و بێگەردی
دەرسی عەشقی بێئەوپەڕتان
بە دوا ڕۆژی شادی ئازادی و سۆسیالیزم
لە بیر، بۆچوون و کردەوەی هاوڕێ خوسرەو،
چاك ناسیوە؛
ئەی ئەوانەی
ئەو رووخسارە خۆشەویستە
چاك دەناسن و دەزانن:
هەتاو نەبوو
چونکە هەتاو
گۆنای نسار نالاوێنێ؛
روبار نەبوو
چونکە روبار
بەرەو هەوراز هەڵناگەڕێ؛
ئاگر نەبوو
چونکە ئاگر
هەر ستەمکار ناسووتێنێ؛
ئەو خۆشەویستەمان بەڵام،
تاوی بە ڕۆژ و نسار بوو؛
ئاگری جەرگی ستەمکار بوو؛
لە هەورازا و لە نشێوا،

خرۆشان وێنەی روبار بوو؛

ئەی ئەوانەی
بە بیستنی هەواڵی گرانی مەرگی
دڵتان کەیلی پەژارە و رقی پیرۆزە؛
وەرن دەیسا؛
وەرن با یادی ئازیزی
بەرز و
بەرز و
بەرێز بگرین!...
لە هەرشوێنێك،
چەوساوەیەك، دڵبرینێك،
بە ئاواتی رزگاربوون لەم
مەینە-تاوای ژین-تاڵیە
رۆژ بە شەو و
شەو بە بەیان دەگەیەنێ،
با دەست لە ناو دەستمان بنێ؛
با ئاڵای ئامانجی «خوسرەو»
بەدەستانی
بەرین ترین بێبەشانی ئیمان خاراو
بەرز و بەرزتر
شەکاوە بێ!

**زستانی 1364**

# گوێگرن

بۆ دکتۆر دەروێش

گوێم لە قاقای
لرخن و زەهراوی مەرگە...

ئەو دێوەزمە
دڵتاریکە دڵتەنگە غەرەزاوییە
حەقیەتی ئاوا
پێکەنیٚ!...

لەسەر سینگی دکتۆر دەروێش دانیشتوە!
بە دوندی ئەو شوێنە بەرزەوە حەقیەتی،
خۆی رابنیٚ!
ئەو دکتۆرەی
چەنای چەندجار
گولی ژینی
لە چنگۆڵەی ئیسکینی مەرگ
دەرهێنا بوو،
بیٚ ئەوەی بیلیٚ بژاکیٚ!
لەو زەرب و چەنگە دژوار و پیرۆزەدا،
هەمیشە و دایم دکتۆر بوو
پشتی مەرگی لە عەرز دا بوو؛
ئێستا مەرگ

چۆکـی داوەتە سـەر سـینگـی
دکـتـۆر دەروێش؛
دەیجا چلۆن
لـرخـن و سـیخـن، ژەهـراوی،
قاقای جینایەت لـە سـینگـی
ئیسـکـینـی بێدڵ
نەکـێشـێ؟!
بەڵام، تۆ دەنگ؛
چاك گـوێگـرن؛
ئێسـك و پروسـك!
لە نێو ئەو قاقا لـرخـن و زەهـرینـەوە
قرچـە و خـرمـەی
ئێسـك و پرووسـکـی تێکـشـکـاوی مـەرگ ئەبیـەم!!
ئاخـر، دکـتـۆر،
پێش کـەوتـنـی،
راسـت، برِبرِەی ئێسـکـلـینـی مـەرگـی پێکـابـوو؛
وەکـو «ئارەش»
هـەمـوو هێز و توانای گـیـانـی
کـردبووە تـەوژمـی تـیر و
راسـت، برِبرِەی پشـتـی مـەرگـی، دا بێژابوو
ئاخـر، دکـتـۆر،
هـەر دکـتـۆری برین و ئێشـی هـۆزی مـەینـەتبار نـەبوو؛
هـەڵـمـەت بـەری جـەنگـاوەری
مـەیدانـی مـان-ونـەمـان بـوو
پارێزەری جـەنـگـاوەری

بەهەشتی ژینی ئینسان بوو!!
لە داوێنی بێدرێغی شاخ و داخی شۆڕشاوی کوردستانا،
دەوەن و درەخت و دارو بەردی وحشی،
دەستەمۆی بوون!
بۆی دەبوونە
تەخت و رەختی خاوێنی ئوتاقی عەمەل
تا گیانی هەرگیز نەسرەوتووی
جەنگاوەرێکی کرێکار
لە چنگی چرووکی مەرگ
رزگار بکا؛
بیکاتەوە بە گژمەرگ و
تاریکی و ستەمگەریدا
بەڵێ دکتۆر،
پێش کەوتنی،
راست بڕبڕەی ئیسکینی مەرگی پێکابوو!!
چاك گوێگرن!
چاك گوێگرن!
قرچە و خرمەی
ئێسك و پروسکی تێکشکاوی مەرگ بیبەن!

**پاییزی 1367**

# لەگەڵ شاعیرانی تر

## چیدی رووت و ڕەجاڵ نابین*

وەرگێڕانی ئازاد لە شیعرێکی «هاینریش هاینە»

بۆرژواکان!
بۆ ئاوازی کلیساتان،
کەوای ساتان
تان و پۆ زێڕ و زیو و ئاوریشم
لەبەر ئەکەن؛
کێ ئەو کەوای چنی بۆتان؟؟
ئێمەی رووتی برسی بێ-نان!
ئێمەی کرێکاری کارگای پارچە چنین،
ئێوە، ئاوا پۆشتە ئەکەین،
کەچی، خۆمان رووت و برسین!

خاوەن شکۆکان! داراکان!
بۆ شکۆداربوونی لەشتان،
کەوڵی ئاوریشمینی دەڵپ لەبەر ئەکەن؛
کێ ئەو کەوڵەی چنی بۆتان؟؟
بۆ ئێوەی دەسەڵاتداری خاوەن شکۆ؟!

ئێمە؛
کرێکاری کارگای پارچە چنین،
ئێوە، ئاوا پۆشتە ئەکەین،
کەچی خۆمان رووت و برسین!

بەڵام کاتی دەسەڵاتی ئێمەش کەهات،
کاتێك شکۆتان دوایی هات،
کاتێك دەستی دەسەڵات و
دەستوور-داریتان کۆتا بوو،
ئەوجار،
ئێمەی کرێکاری کارگای پارچە
کفنەکەتان
بە گیان، بەدڵ
بۆ ئەچنین
بۆ ئێوە و
بۆ دنیای کۆنتان!

گوێگرن لە
قرمژنی مارشی راپەڕین!
ئێمەی کرێکاری پارچە
چیدی رووت و رەجاڵ نابین؛
چیدی رووت و رەجاڵ نابین!

**هاوینی 1365**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# گۆرانی پارچە چنانی «سیلزی»

وەرگێڕانی ئازاد لە شیعرێکی «هاینرەش هاینە»

تەنات فرمێسکێك
لە چاوی بێ نوورا
نەماوە؛
لە پشتی دەسگاوە،
بەدیانەکرۆژێ
خەریکی تەونین و
بەدەستی توڕەیی، دەنووسین:
هۆئەڵمان!
کفنەکەت بۆ ئەچنین؛
پۆی لەعنەت، تانی قین؛
بە بەری چنینی کفنەوە
سێ لەعنەت ئەنێرین؛
سێ لەعنەت:
لەعنەتێك ئاڕاستەی ئاسمان
کەسەری سوجدەمان لە حەنای دانەوان
بەسەرمای زستان و بە ژانی برسیەتی؛
بەهیوای خۆرایی،
بە دۆعای پڕوپووچ،
نزامان بردە لای؛
کە پێمان پێکەنی؛

بە سووکی خستینیە بەردەستی زاڵمان!
کفنەکەت
پۆی لەعنەت
تانی قین؛
کفنەکەت بۆ ئەچنین

سێ لەعنەت؛
لەعنەتێك بۆ سوڵتان؛
شای خاوەن-شکۆکان؛
کە دادی نەپرسین؛
خراپتر، ئاخرین قڕانی دەسکەوتی رفاندین؛
فەرمانی دەسڕێژ و کوشتاری دەرکردین؛
کفنەکەت،
پۆی لەعنەت،
تانی قبن،
کفنەکەت بۆ ئەچنین؛

سێ لەعنەت:
لەعنەتێك ئاراستەی نیشتمان؛
کە تێیدا، هەر شەرمەو
هەر عارە دەپشکوێ؛
کە تێیدا، گەندەڵی و رزیوی
هەر کرم هەڵدێنێ؛
کفنەکەت،

پۆی لەعنەت،
تانی قین،
کفنەکەت بۆ ئەچنین؛

کە ئێمە،
وەك مەکۆ
لە ژێر چەرخی کارا
لە دەریای مەینەتی رەنجی بێ ئەژمارا
گیرۆدەی هاتوچۆین،
خەریکی چنینی کفنی تۆین!
هۆ پیری پەککەوتە؛
هۆ زورهان!
کفنەکەت،
پۆی لەعنەت،
تانی قین،
کفنەکەت بۆ ئەچنین!
بەبەری چنینی کفنەوە
سێ لەعنەت ئەنێرین

**هاوینی 1365**

# داستانێکی زستانە

وەرگێڕانی ئازاد لە شیعرێکی «هاینریش هاینە»

هاورێکانم
من ئەمەوێ
گۆرانییەکتان بۆ بڵێم
گۆرانییەك
نوێتر،
خۆشتر لەوانی زوو!
ئێمە هاتووین هەر ئێستا و
لەسەر ئەم زەویە،
بەهەشتی بەرین بونیادنێین!
ئەمانەوێ لەم دونیایە
بەختەوەر بین!
چیدی نابێ بەشی ئێمە
هەر مەینەت بێ و کوێرەوەری؛
نامانەوێ تەوەزەلەکان چیدیکە
چی بەرهەمی دەستە چالاکەکانمانە،
هەڵیلوشن!
لەم دنیایە
هێندە نان و هێندە گوڵ و

هێندە جوانی و
بەرهەم هەیە،
کە بەشی گشت لایەك بکا؛

خواردەمەنی و شەهدی شیرین
هێندە هەیە کە بەشی هەمووومان بکا
ئەمە تەنیا لەسەر زەوی
با ئاسمانیش بەجێ بێڵین
بۆ فریشتە و چۆلەکەکان!

**هاوینی 1365**

# لەشکری برسیەتی

وەرگێڕانی ئازاد لە شیعرێکی «نازم حیکمەت»

لەشکری برسیەتی ڕێ دەکا
ڕێ دەکا
تا زکێ نان بخوا
تا ژەمێ گۆشت بخوا
چەند پەڕێ کتێبی دەست کەوێ
شنەیەك ئازادی لێی بدا
ڕێ دەکا و پردەکان جێ دێڵێ
وەك شمشێر دەیبڕێ
ڕێ دەکا و دەرگا، گەر پۆڵاش بێ،
بەرگەی پێی ناگرێ؛
دیواری قەڵاکان تێکدەدا
پێ لە خوێن، ڕێ دەکا

لەشکری برسیەتی ڕێ دەکا
بەهەنگاوی هەوری بە گرمەی بەهاری
ڕێ دەکا؛
سروودی ئاگرن

پڕ هیوا بە ئاڵای وەك گڕی
پڕ هیوا بە هیوا
لەشکری برسیەتی ڕێ دەکا
شار بە کۆڵ،
بە کۆڵان و ماڵ و زنجیەوە؛
دوکەڵکێشەکان و
ماندوویی بێ ئەوپەڕی
کاتی هاتنەدەری کارخانەی
لە کۆڵە

لەشکری برسیەتی ڕێ دەکا
گەڕەکی فەقیری زنج نشین
بە شوێن خۆیدا دەبا
ئەوانەی دەمرن و
نیانە بستێ خاك لەم ئەرزە بەرینەی
بێ ئەو-پەڕ...
لەشکری برسیەتی ڕێ دەکا
ڕێ دەکا برسیەکان تێر بکا؛
ڕێ دەکا ئازادی پێشکەش کا
بەوانەی نیانە
پێ-لە-خوێن ڕێ دەکا!

**زستانی 1364**

## لەگەڵ دەریای شینی «پوشکین»

لە یەکەمین دیدارمدا
لەگەڵ «پوشکین»،
تەماشام کرد
ئەو شاعیرە
دەریایەکە شین و بەرین...
نزیکەوە بووم
بە یادی
ڕۆژانی ڕەنگینی لاویم
خۆم هاویشتە باوەشی شینایی زەنگی
بەڵام ئەبینم کە جێ جێ
ئەو دەریایە
بێ بن نییە
بنی لیخن ، ڕەش دەچووەوە
هەرچەند شاباڵی چریکەی
لە پشت سەد وحەفتا پەردەی
ساڵەهای ساڵ،
هێشتا چەندە دڵبزوێنە؛
ئەبینم بەڵام چریکەی
ڕوون و ڕەوان
بەرەو بەرزەوەندی ئینسان

لینگ لە ئاوزەنگی توند ناکا!
ئەسپی خەیاڵی
بێ-لەغاو لە غارنادا!
هێشتا، پڕە
لە خورافە و گێژ و مەنگی؛
زنجیرێکی لە گەروودا!!
قووڵ تێی ڕۆدەچم؛
دەبینم:
سەیریش نییە؛
ئاخر «پوشکین»،
هی سەردەمی هەڵبڕانی هەموو زنجیرەکان نییە؛
شیعری ئەمڕۆی هەڵبڕینی هەموو زنجیرەکان نییە!

**بەهاری 1363**

# کلووچە

بە شوێن گۆرانییەکی «جەوهیل» دا:

واعیظی ریشپان، ریشدرێژ،
شەو بێ، رۆژ بێ،
لە کونەکانیان دێنەدەرو
شەویلکەیان ماندوو دەکەن
لە باسی حەڵاڵ و حەرام؛
گوایە چاك و خراپت لێ روون کەنەوە
بەڵام کاتێك پرسیار ئەکەی
ئەی چی بخۆم!؟
بە زمانی لووس
«برام» ، «برام»،
شێر و رێویت بۆ دێننەوە:
«هەمیشە و دایم خواردنی خۆشت دەبێ
لە بەهەشتی شکۆداری ئاسمانەکان
هەڵفرە بەرەو ئاسمان!»
«ئێستا کارکە و
عیبادەت کە؛
لە نێو خاك و خۆڵدا بژی
کاتێك هەڵفڕیت بۆ ئاسمان
نان و کوولوچەت پێ دەدەن؛
باوەڕ ناکەی؟!»

# دەمانەوێن

به شوێن گۆرانیەکی «جەوهیل»دا

ئێمە دارتاش و خەیات و
کرێکاری کەشتییەوان و
چی کچە جل-شۆر و ئاش-پەز
هەرچی هەیە
چی غەوواصە
کە بۆ بەدەستهێنانی مرواری گەش گەش
لە قووڵایی قووڵی دەریاوە رۆدەچن،
چی کڵفەت و کارەکەری خوێن شیرینە
کە قژیان وا شیرین و جوان پەرداخت ئەکەن
نانەواکان
نەجارەکان
سپوورەکان
ئەو کەسانەی کە وردە-شت ئەچننەوە
ئەو تفڵە بەستەزمانانەی
بۆ کرێیەکی بێقابل
نەمامی ناسکی لەشیان
لە ژێر کارا، ئەپرووکێنن،
هەموو ئەمانەمان، دەوێن؛
هەموو ئەمانەمان دەوێن،
کە لە «یەکیەتی گەورە»دا
یەکگرتوو بن!

# ئاواتەکەم

ئاخر گۆرانی جەوهیل؛ لە جیاتی
وەسێتنامەی پێش تیرباران!

ئاواتەکەم،
ئاسانە؛ بۆم جێ بەجێ بکەن:
میراتێکم نییە هەتا دابەش بکرێ؛
پێویستیشم بەوە نییە
خزم و کەسم تازیەبار بن؛
بەردی ئاوە-سوو، خەوش و خاڵ، تێی نائاڵێ!
پەیکەرم ؟
ئاخ؛ ئەگەر بەدەستی خۆم بووایە،
پێمخۆشبوو ببمە خۆڵەمێش
نەسیمی شادیش ئازاد بووایەو
بە شنە
خۆڵەمێشی ئەم پەیکەرەی
ببردایە
بۆ شوێنێك کە
گوڵاڵەکانی لێ ئەڕوێن...
بەشکم لەو خۆڵە مێشەوە
هەندێك گوڵی ژاکاو، دیسان
بژیەنەوە و
هەمدیسان بشکۆفێنەوە!
ئەمە ئاخرین ئاوات و داخوازیمە؛
ئێوەش هەموو،
با شاد و بەختەوەر بژین!

# سپاس

به شوێن شیعرێکی «برتولت برشت» دا بەناوی
«ستایش بۆ کاری نهێنی»

شکۆدارە؛
دەنگهەڵێنان لە جەمعێکداو
دوان لە باسی ستەم و چەوساونەوە؛
دەنگی دلێرت هەڵێنی
بە بانگەواز
هۆزی چەوساوە بدوێنی
ستەمگەر پێشێلی پێت کەی
بیفەوتێنی؛
شکۆدارە؛
بەڵێ، یەکجار شکۆدارە!

چەند دژوارە ،
چەندە بە کەڵك و دژوارە
کاری بچکۆلەی رۆژ بە رۆژ
سەرسەختانەو بە نهێنی
ریز بە ریز، شانەو تۆڕی حیزب
سازبکەیت و
رێك-وپێك، لێکی ئاڵێنی؛
*

لە پێش چاوی داچەقاوی لەشکری زۆر و سەرمایە،
قسەکردن،
لەو حاڵەش دا،
خاوەن-قسەکە داشاردن!
تەنانەت کاتی سەرکەوتن
سەرکەوتوەکە
بە هەزار پێچ و پەنادا
دەربازکردن

مردن،
بەڵام،
ئەو مەرگەش لە چاو ون-کردن!

کێ بێ بەدڵ، بە گیان،
نەڕوا، لە پێناو ناوبانگی بەرزا؟
بەڵام کێیە
تەقەللای وا لە پێناوی
ونبوون ، ون-کردنی ناوی!؟

سەرەنجامیش، تەماشاکە؛
زگ-هەڵگوشانی دەست-بەتاڵ،
لە شانازی دەگێڕنەوە
کە میوانی سفرەیان بێ!
دەریان؛
شەپۆلی بەهێزن،

کە هێز نییە باشاریان کا!
هۆ ناوبانگ؛
هۆ ناوبانگی بەرز؛
لێ یان گەڕێ!
لەو مەزنکارانە گەڕێ!
ئەوانەی وا
کاری گران، شانازی بەرز،
هێزی بەرین و دەریای پان
ئەخولقێنن؛
لێیانگەڕێ؛
نایان بینی!
چونکە ئەوان، بەرزترن لە بانگەواز!

بەڵام ئێوە،
نەناسراوە ڕواڵەت-داپۆشراوەکان
تەنیا تاوێك وەرنەپێشێ؛
وەرنەپێشێ،
با سپاسێکتان پێشکەش کەین!

**بەهاری 1364**

# لایە لایە

به شوێن شیعرێکی «برتولت برشت»دا
«لایەلایەی ژنێکی کرێکار»
منداڵەکە لە شیعرەکەی ئەوا کوڕە، لای من کچە؛
بە بۆنەی 8ی مارسەوە!

لایلای لایلای،
سەحەر لایلای؛
شەوگار کردی و
من کردم، لای
شەونخوونیم پێوە کێشای
سەحەر لایلای

*

کاتێك لە زگما ئەجووڵای
چاوم حەزی لە دیداری چاوانت بوو
بینم حەزی
بۆنکردنی هانای هەناسەکانت بوو
دەستم حەزی لاواندن و
زمان و گفتوگۆم حەزی دوانت بوو

*

لایلای لایلای؛
کاتێك جووڵای
رۆڵە بەستە زمانەکەم، لای،
بە قورسی قاڵبە خشتەکان
پشتی من دەهاتە ژان و
تۆش بەیەکەم تەجرەبەی رەنج
تێر ئەتاسای...

*

ئۆخەی...
بەس نەبوو نەمردی؟!
رۆڵە لایلای؛
لایلای لایلای،
کاتێك جووڵای،
شادمان وتم بە بابت:
کام دوکتور، باشە؟
کام دەرمان؟
خستیە بیرم:
«پارە کوا؟
ئەی نان؟ ئەی ژیان؟»
بێبەش لە شادی خۆم؛ لایلای لایلای،

کە دەجووڵای
وت-وویرەم بۆ ئەکردی:
«تەماشەکە،
کێو-کێو خشتمان هەڵچنیوە

گەرچی خۆمان
-هەی لە بێداد-
لێی بێبەرین،
دیسان هەر دەستی وەك خۆمان
ئەیكاتە كۆشك و ماڵی جوان،
سەحەر لایلای!
هەزار بریا، لە دەسترەنجمان بەهرەمەندبای!
لایلای، گوڵم؛ دڵم؛ لایلای!»
*
دووكان پڕە لە نانی جوان؛
دەستی برسی ناگاتە پشت شیشەی دووكان
دەبوا بەو نانە، تۆ تێربای؛
لایلای لایلای،
ئاسكی ئارام-نەگرتووم، لای؛
وت-و ویرەم بۆ ئەكردی:
«تۆ، كە لە زگما هێند سركی،
كاتێك هاتی،
دەبێ كۆڵنەدەربی، لایلای!»
كە بە ئاواتی نەمردوو،
پاش وەی رەنجی هەڵگرتنی نۆ مانگ و نۆ رۆژم كێشای،
تۆم دەستكەوتبوو
بابت لە كار دەركرابوو
هیوامان بە كار و بە نان لە دەست دابوو
برات، تامەزرۆی زگێ تێر لە شۆربا بوو،
تەنیا لای «ماركس» و لای «لێنین» بوو نووسرابوو

کە چلۆن ئێمەی کارگەر،
ئەبینە خاوەنی دوارۆژ؛ ئەبینە خێوی داهاتوو...
*
کاتێك تۆم بوو،
کچم، لایلای؛
لە جیاتی پۆیلانە و شادی،
سەرەخۆشییان لێکردم،
بنوو، لایلای؛
وتیان: باب و برای خۆشبن؛
کۆڕیش ئەبێ، کچیش ئەبێ،
قەیناکا کچ بوو ئەمجارە؛
چار ناچارە!!
بەڵێ؛
ئاوا، هەوەڵی رۆژ،
مۆری کۆیلە-بوونیان لێدای
سەحەر لایلای؛
لە ساڵ و زەمانێکی وا بێ-ڕەزادا
هاتیە دنیا؛ رۆڵە لایلای؛
زەمانەیەك
کە پووشەك و بیسکویت و چۆڕێك شیر،
خۆی سەرکەوتنە،
یان ماڵێکی رۆشن و گەرم بەدەستهێنان
سەرکەوتنە،

لەم شەڕی مان و نەمانا؛ ڕۆڵە، لایلای؛
بۆ بە-خێو کردنت، ڕۆڵە،
ناچاربووم شەڕکەم، شەو و ڕۆژ،
چون،
بۆ نانێك
بۆ تێری تۆ،
بەشداریم لە
تیمی پارێزگاری ئیعتسابەکەماندا
پێویست بوو؛
دەبوو بچمە جەنگی ئەفسەر،
جەنگی پاسدار
جەنگی فەرماندەی سەرکوتگەر
بچمە جەنگی تانگی دوژمن
بۆ بەخێو کردنی تۆ
من!
سەحەر، لایلای؛
***
خنجیلانەی خۆشەویستم،
کچم، لایلای؛
سەرەنجام من،
لە کۆڕی خەباتا، ئاوا،
تۆم پەروەراند؛
ڕۆڵە، لایلای؛
ئێستا، تۆم هەی؛
کچۆڵەیەکی کارگەر،

بێبەش لە چی بەهرەمەندییە بۆ بەشەر،
ژینێکی تاڵتر لە تاعوون لە رێتایە؛
بەڵام من،
تۆ،
گیانی دایە،
بۆ رۆژێك پەروەردە ئەکەم
شان-بەشانی من و ئەو هەموو هاوچارە،
دەست بدەینە
چارانی چاری ئەم کارە؛
دەست بدەینە
ژێر رووخانی باری قورسی ئەم دنیایە
لایەلایە؛
بۆن خۆشتر لە گوڵم، لایە!
***

هیچت پێنادەن،
بزانە!
هەرچی بێ، بەدەستی بێنە!
تۆم نەبینی، شەو لە خیابان رۆژکەیتەوە؛
شێرە کچێك بە،
بوێر و
نەگەڕاوە!
رەنگە زۆر هەڵکەوتوو نەبی؛
بەڵام هیوام پێتە سەحەر
مل بە ژینی کۆیلە نەدەی!

لە سەفی کۆپین دا، عومرت زایە نەکەی!
شەوگار کردی و
من کردم، لای؛
شەو-نخونیم پێوەکێشای؛
بەسەر-گەردی مشتە بچکۆلەکانت بم،
هەر ئەڵێی بۆ زەرپ و چەنگی شەڕی سبەی
خەریکی خۆت ئامادە کەی
سەحەر، لایلای!

***

کچم لایلای؛
درۆ و فریوم بۆ نەدای
بڵێم «شاخ و باڵت وایە»
بەڵام سەحەر، گیانی دایە؛
منیش بۆیە رەنجم نەدا.
تۆ، سبەی رۆژ،
بە سیمەخار-دارەکانا ئاوێزان بی؛
یان بۆ چۆڕێك ئاو، هاوار کەی؛
یان لە کونجی ماڵا،
کۆیلەی چیشت لێنان و
پەرۆی منال،
گێژ داکەوی؛
رۆڵە، لایلای؛
سەحەر،لایلای؛

سبەینێ تۆش لەم ڕێگادای؛
لەگەل هەموو ئەوانەی وا وەك ئێمە وان
دەست ئەدەینە چارانی چاری ئەم کارە
تاکو ئەوان
هێزیان
وەك خاك هەرس بێنێ!
لایلای لایلای؛
سەحەر، لایلای!
من وەك بابت
تۆش وەك من وای
لەگەل هەموو وەك خۆم و
خۆت و
وەك بابت
دەست لە ناو دەست
بکەینە کارێ،
چارێ کەین؛
تا لەم دنیایەدا، چیدی،
دوو جۆر ئینسان نەبێ لایلای؛
دوو جۆر ئینسان نەبێ لایلای!

**زستانی 1365**

**8ی مارس1987**

# باخچە

باخچە-باخچەو ڕەنگاو-ڕەنگە
دیوانە خۆشەکەی «گۆران»؛
باخچە-باخچە گوڵی شاری
باقە-باقە گوڵی کێوی
ڕەنگ و بۆن و بەرامەی خۆش
بەرامەی نەرگس ... ونەوشە
هەرچەند جار-جار
هەروەك كوێستان
گوڵەکانی، نەك زۆر بۆنخۆش
تەنانەت پڕ خاڵ و خەوشە،
هەزار جار شەرتم کرد، وتم:
تەنیا هەر ئەم تاقە-گوڵە
ئەکەم بە بۆ
ئیتر ئەبێ
بچمەوە سەر کاری ئەمڕۆ
بەڵام بۆنی گوڵێکیتر
رام ئەکێشێ
هەتا دیوانە خۆشەکەی
شیعر-شیعر
ئەخوێنمەوە هەتا ئاخر!

**هاوینی 1362**

## ڤیکتۆر هوگۆ

شکۆدارە «ڤیکتۆر هوگۆ»

لە دوورەوە
وەك «نۆتردام»
بەتایبەت کە
ورد بێتەوە لە کەتیبەی بەردی پایە و
هاورای داد
لە بێدادی زەمانەکا؛
*
«ئیسمراڵدا»
بۆ خۆرەتاو،
بۆ ئازادی،
سوجدە دەبا
ئاو دەکا بەدەم «پشت کوور»ی
ژێر کۆت و بەند و تازیانەی
«لووئی» یەوە...
ئەو زانا پسپۆڕە، بەڵام
کاتێك ئێمە
دەستمان برد بۆ
شکاندنی
ئەو کۆت و بەندەی «پشت کووڕ»ی
لە ستوونی نەحسی «واندوم» شەتەك ئەدا،
کاتێك بەشەق

«واندۆم»مان لە ریشەهێنا،
کاتێك پشت ملی «خۆر»مان گرت
سوجدەببا
بۆ داوێنی «ئیسمرِاڵدا»
کوێی دەئێشا؟
که وەك بیانوو بگریێ، ئاوا،
نووزەی نارِەزایی کێشا!؟
«هوگۆ»ی شکۆدار
بچێتە
سەر دوندی کتێبەکانی و
دەست حەوادا،
هێشتا دەستی
بە گوێزنگی ئێمە ناگا!

**بەهاری 1367**

## لەگەل کێتە؟

وەڵامێک،
بە شیعرێکی «یفتۆشینکۆ»،
شاعیری سۆڤیەت
شیعرەکەم لە رادیۆی «مۆسکۆ»وە بیست:

«یفتۆشنکۆ»ی شاعیردێت و
زەنگۆڵ-زەنگۆڵ،
فرمێسك هەڵدەورێنێ:
«ئەی هاوارم هەی، بۆبەشەر؛
ئەی هاوار ... بۆمبی لە ناوبەر؛
بەڵایەکە ژیان-تێکدەر
ئەی هاوارم هەی بۆ منالْ،
سووتام ، برژام ، بوومە زوخالْ...»
حالی نیم بۆ وا پەشێوە!؟
ئەو شاعیرەی ئاشبەتاڵکەر؛
ئەوەی تفی کرد لە رێباز
لە ئاسۆی رزگاری بەشەر؛
تادەبینم
دەیخاتە باری هەڕەشە:
«هەرکەسێك شمشێر بکێشێ
بە شمشێریش ئەبێ بمرێ...»

لەگەڵ کێتە؟
لەگەڵ کێتە، شاعیرەکەی دەربارانی
خاوەن شکۆ و بۆمبی ئەتۆم؟
شاعیرەکەی دەربارانی پشتیوانی
«یارۆزڵسکی» و «خومەینی»؟
لەگەڵ کێتە ئەو هەڕەشە؟
«تاچر» و «رەیگان» و «بگین»؟
«یارۆزڵسکی» و « پینۆشە»؟
ئەوان
خۆ بەرزە شمشێریان
بەرۆژ، بەشەو
شەق و پەقم ئەکەن، ئەم کوژن،
کارم، رەنجم، خوێنم ئەمژن
ئەی باشە ... تۆ ... لەگەڵ کێتە؟
لەگەڵ منی پێشێلکراو؟!
ژین تێکدراو؟
لەنێو براو؟
ئەی لاژگ خۆم
ئەگەر باوەڕ بە ڕیات کەم!
سا من، تازە
شمشێرم دەمەزەرد ئەکەم
با، بەس بێ فرمێسکی ریا!
پێت بڵێم: روون و راشکاو:

هەرکەستان شیری کێشاوە،
ناحقیەتی؛
مەگەر منی پێشلکراو؛
بەرهەمی ڕەنجم و گیانم تالانکراو؛
مل راکێشن،
ئەی هۆزی سەرچاوەی مەینەت؛
راپەڕیوم
بە شمشێری رقێکی هەزاران ساڵە،
سەری گەندەڵتان پەڕێنم
با مناڵ و گەورەی بەشەر
لە نەگبەتتان رزگاری بێ؛
کوێربێتەوە سەرچاوەی کوێرەوەری و شەر؛
گوم بن یەکسەر؛
بە خۆتان و چی بۆمبتانەوە
مەرگ هێنەر؛
با نەمانتان یەکجاری بێ!
با گشت گەڵا، گوڵ و چرۆ و
درەختی ئەم دنیا، یەکسەر،
شاد بەشنەی بەهاری بێ!

## بۆ دەرەوە

بەشێک لە شیعرێکی «محمود درویش»،
شاعیری فەلەستینی

لە هەرکوێ دەتەوێ بژی؛
بەڵام لە نێو ئێمە مەژی!
کاتی ئەوەت هاتووە کە
وەدەرکەوی
لە هەر کوێ دەتەوێ بمرە؛
بەڵام لە نێو ئێمە مەمرە!
بۆ دەرەوە
لە وڵاتمان
لە مەڵبەند و لە دەریامان
لە گەنم ، خوێ
بۆ دەرەوە
لە رەنج و ئێش و ئازارمان
هەموو شتمان؛
تەنانەت لە
بیرەوەرییەکانیشمان!

# ئۆکتۆبەر

به شوێن چریکەی «لێنین»ی «مایاکۆڤسکی»دا

ئەوا، ئێستاکە وەختیەتی،
باسی «لێنین»تان بۆ بکەم؛
نەك لەبەر سووك بوونی باری
پەژارەی گرانی مەرگی

بەڵکو بۆیە،
ڕەنجی ئاڵۆزی ئەو کاتە
بووەتە دەردێکی ئاشناو
ناسراو ڕوون

***

ڕۆژگار:
ئەی ساڵ و زەمانە
شیعارەکانی «لێنین»تان پێدەسپێرم
بیبەن ، تا پەڕی بێکەران!
فرمێسك باران
بۆ هەر کارەساتێکی شووم
کەی؟ کوانێ کردەی ئێمەیە؟
کێ زیندووترە لە لێنین
لە گشت بەرینێایی جیهان!؟
دەترسم لە
وشە-وشەی تازیەنامە و لاواندنەوە؛

وا، لە خۆڕا،
خەرمانەی نوور ئەگرن بەسەر هەر کەسێکا!
زۆر بێزرام
ئەگەر بە تاجێکی شیعرین
داميپۆشیبێ
نێو-چاوانی سیمای راستەقینەی «لێنین»؛
ئەو سیمای ئینسانی و بەرین!
بە رێزگرتن،
شکۆ-بەخشین بە ئارامگا،
ریزی دوور و درێژ و پڕژماری رێزگیران،
پەرۆشی وەم،
لە نێو عەتر و عەبیری رێز لێنان
ساکارییە زاتییەکەی «لێنین»
ون بێ، بزر بێ لە چاوان.
مەرگیش حەتتا،
هێندەی نەکردووم پەرێشان
ئەڵێم نەکا
رەنگینی نەخش و نیگاران
«لێنین»، وا بگۆڕێ لێمان!
ئەگەر ئەو رەنجە دژوارە،
ئەو رۆژەی لێ کردمە رۆژی تاڵترین،
تاڵترین رۆژی ژیانم،
خەم رەوێنی ئەو کەسەرە و
هەزاران کەسەری گران
بیرەوەرییە گەشەکەی

خۆشترین رۆژی ژینمە:
کاتێك ژینم
وەك فیلمێکی
سەر پەردەی خەیاڵی تەمەن،
سەرنج ئەدەم،
رۆژی گەشی بیست و پێنجەمی ئۆکتۆبەر،
رۆژی سەرەتای ژینی نوێ،
لە ئاسۆوە
وەك خۆشترین،
گەشترین رۆژ، بە دی ئەکەم؛
ئەو رۆژە وا
سەر-نێزەکانمان، ورشەدار،
بە خرمژنی هات و چوومان
سەمایەکی شادیان ئەکرد؛
ئەو رۆژە وا،
کەشتییەوانەکان بە گوللە و تۆپ و بۆمب
کایەیان ئەکرد؛
«سمۆڵنی»* لە شریخژنی جەنگاوەرانا
سەمای بوو؛
دەسرێژی ریزی موسەلسەل
لە پەنجەرەوە را-ئەخوشا؛
«-دەی! هاورێیان!
گورج بن خێرا!
چاوەڕێی چی راوەستاون؟!
سواری زرێپۆشەکان بن!

بەرەو ئاخرین سەنگەرە نەگیراوەکانی دوژمن
بۆ پێشەوە!
لە شکرێکی وا بەرینین
کێ هەڵی دەگرێ بەرانبەر
مشتێك مفتە خۆری دارا
بکشێینەوە !؟»
-بەسەرچاو: هاوڕێی فەرماندە!
-دادەی هاوڕێیان
بە راست، راست!
پاشان،
رۆچوون
بە جەرگی تاریکی شەودا!
بەبەر کڵاوی کەشتیەوانەکانەوە،
پیت پیت،
وشەی «ئاورۆرا»
لە نوورا، ئەبریسکایەوە و
وەك بەڵگی زێڕ، ئەدرەوشا!
لێرە و لەوێ، فەرماندەکان، فەرمان ئەدەن؛
لەو لا، سێ کەس راوەستاون،
خەریکی باس و گفتوگۆن
چەندە نامە
چەندە داواکاری، چەند سوێند:
«تکایە ئێمەش بنێرن
ئێمەش دەچین
بۆ ریزی هەرەپێشەوە!»
***

لە بن قووڵایی ڕێڕەوی «سموڵنی»* دا
لەو جەرگەی هەڵا و گرمەدا
نادیارە و سەرگەرم و ئارام و بێدەنگ،
هاوڕێ «لێنین»؛
شەو تا بەیانی
لە داڵغەی وەزعی جیهان
بەری بەیان
ڕاگەیاندنێك دەر ئەكا:
«بۆ هەموان!
بۆ هەموان!
ڕاگەیاندنێك ، بۆ هەموان!
بۆ هەموو ئەو ڕووت و ڕەجاڵانەی
لە سەنگەردان!
هەموو كوێرەوەری-كێشان؛
ئارەق-ڕێژان؛
بۆ هەموو دەروون پڕ ئێشان!
نان بۆ برسی!
زەوی و زار بۆ
جووتیاری فەقیر و هەژار!
سوڵح بۆ میللەت!
گشت دەسەڵات بۆ شووراكان!»
***

هەزاران دەست
هەزاران زار
هەزاران دڵی بەدەربەست

هەزاران گەرووی پڕ هاوار
هەزاران چلچرای چاوان
دەستی تامەزرۆی بەرهەم و
دڵی بە ئاواتی شادی و
چلچرای چاوی چاوەڕوان
وتیان: ئێمەین
ئێمەین حزبی هاوڕێ «لێنین»!

دووپشك و مار؛
خاوەن زەوی؛
خاوەن پارە؛
خاوەن فەرمان؛
خاوەن شكۆ؛
سەرمایەدار؛
پیلانگێڕی، كشت، كردن كۆ؛
قیژاندی: هەی داد! هەی هاوار،
هاوار بۆ دەوڵەت و بۆ دین؛
ڕەجاڵی هان داوە، «لێنین»!
***

سەرباز وتی:
بە زیندوویی، قەبری خۆم پێهەڵدەكەنن؛
بە گژ برای خۆمدا ئەدەن؛
ئەگەر لەگەل هاوسەنگەریش سكاڵام بێ،
ئەقیژێنن، هاوار ئەكەن،
باسی ئیعدام و دار ئەكەن،

بە نیشتمان سوێندم ئەدەن،
کام نیشتمان؟
زیندانی من؛
بەهەشتی وان؛
سا هاوڕێیان،
دەخیلتانم
لەو حزبەدا ناوی سەربازیش بنوسن!
***
دووپشك و مار
سەرمایەدار
پیلانگێڕی گشت، کردن کۆ:
هەی هاوار؛ عاسای دەستم ڕۆ!
***
جووتیاری هەژاریش وتی:
ڕەنجم بێبەرە؛ ڕەنجەڕۆم؛
دەستم خاڵییە؛ دەسخەڕۆم؛
ماڵوێرانم؛ دەربەدەرم؛
بۆ لای کێ شکایەت بەرم!؟
کاتێکیش ئەلێم: برایان
چارێ؛
تەکبیرێ؛
نان! ژیان
ئەڵێن : کافر!
هەی بێ ئیمان!

جەهەنم ، دووپشکی تیایە؛
چڵکی دەستەم ئەم دنیایە!
سا، هاوڕێیان!
جەهەننەم لە جەهەننەم و
بەهەشتیش پێشکەش بە خۆیان؛
منیش سەربازی ئەم حزبەم؛
با هەر بژی یەکیەتیمان!
***

دووپشك و مار؛
خاون زەوی؛
خاوەن پارە؛
خاوەن فەرمان؛
خاوەن شکۆ
سەرمایەدار؛
پیلانگێڕی گشت، کردن کۆ؛
دەسەڵاتم ڕۆ ، دینم ڕۆ!
سا، دەی! سا، دەی!
پەپکەی پیلان؛
لە دەوری ئەو ئاگرە سورە!
دەی!
گەمارۆ!
***

پرۆلێتێر؛

خاتری جەم، دەنگی دلێر؛
ئاڵای سووری، بەدەستی دەمار-خاراوی،
شەکاندەوە!
سەڵای سروودی ئازادی
وەکو شریخژنی بورکان،
تەقاندەوە!
روو لە ئاسۆ
بەشمەینەتی گشت کردن کۆ؛
بە تەوژمی بەرزی هەنگاو
قەف-قەفی پەپکەی پیلانی پساندەوە!
لە قووڵایی دڵی بەشمەینەتانەوە،
ئاڵای سووری سەرکەوتنی شەکاندەوە!
***
گەرچی پاشان
هەلاهەل، زەهری خۆی پژان،
نەیهێشت بەری رەنجمان بەرین،
بەڵام ئەوا،
دیسان هیوا
هەوێنی نوێی بەستوە و
هەتاوی روون
تیشك و تین داوێتە دڵی
بەشمەینەتانی سەرزەمین

**ئۆکتۆبر – نۆڤەمبری 1986**

«سمولنی»: مەدەرەسەیەکی کچانە بوو لە شاری پتروگراد (لێنینگراد) کە شەو و ڕۆژی شۆڕشی ئۆکتۆبەر ، بووبە ستادی فەرماندەیی بۆلشویکەکان، بۆ رابەری ئەو شۆڕشە.

«ئاورۆرا»: نێوی کەشتی جەنگی ”ئاورۆرا“ بە ناوچاوانی کڵاوی کەشتییەوانە شۆڕشگێڕەکانەوە نووسرابوو.

بەراست–راست: وشەیەکی سەربازییە؛ واتا: بە راست وەرگەڕێ!

پەپکە: پاپۆکە؛ مار، پاپۆکە دەدا...

**هەتا ... ”هەزاران دەست» بە شوێن چریکەی ” مایاکۆڤسکی“دا چووم؛ لەوە بەم لاوە، باسی درێژەی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە!

# چەند لاپەڕێک
# لە دەفتەری رۆژانەم

ئەم دەفتەرەم، لەزروفێکی بەرتەسکدا بەرهەمهاتوو پڕە لەسیمبوڵ و ئیشارە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای نەوەدەکان و شۆڕش لە کوردستان!

سالەهایە
هەڕەشەی چاوی چاوەشیان،
دەرگای زیندان،
ژووری ئیعدام،
نەگبەتی لە برسان، ئینسان-کوژی مەرگ و نەمان،
بەرەو رووی خەنجەری نیگام
دەکاتەوە!
نیوەی چەقۆی ئەم جیهانەش،
چلەی زستانی جەهەننەم،
داباریـن و
باری برین، باری جەنازە و وێرانی
باری گرانتر لە گران!
***
گوێم وا پڕبوو لە نرکە و ناڵەی بۆمباران
کپ مایەوە
لە هاوار و هانای هاوپشتی هاوماڵان:
هاوزنجیرانی ژێر چەقۆکانی جیهان!
***

شەوێکی مارس، مانگی ئازار،
چاوم چەواشەی ئەستێرەی کاروان-کوژە،
بەرگی خودای شەرم لە بەر
روچووم بە رەشی چاڵاوی زیندان و
زیللەت و مەرگا
لە دیواران،
بوومە تریشقەی رووخێنەر؛
پەنجەرە و دەرگا و دەروازەم
لە کازیوە خستە سەر پشت؛
چاوەڕوانی کازیوە بووم؛
تومەس، هەمان کاروان-کوژە،
سەرووی ئاسۆی لێ گرتبووم!
***

هاوارم کرد:
سێ و پێنج-سەعات-کار،
ئازادی
وتم شوورا، شوورا دڵە؛
دڵی لێدەر!
با لە کارگاو مەعمەلەوە
بە ڕەگاو-ڕەگی کۆڵان و
جادە و گەڕەك و مەیدانا
گەشی و خۆشی بخاتە گەڕ!
بەڵام هەیهات؛

زنجیری پێی ئازادیمان نەپچڕابوو،
شوورا، پەساپۆرتی نەبوو،
تلیاك بوو،
قاچاخ کرابوو!!
***
چاوم گلۆفت؛
دیسان چاوەشی نیشتمان،
ئەمجارە، چۆغەی لەبەرە!
دیسان دەستی درێژ دەکا
نێزەی برژانگم بشکێنێ،
بۆ چاوەزار
زەهری روانینم بستێنێ؛
ئەمیش لە نیگای چاویدا،
سێبەری نەردەی زیندان و
داری ئیعدام،
نەگبەتی و مەرگ و برسیەتی
دەپەرچێنێتە بەر نیگام
ئەمیش دەست دێنێ برژانگی خەنجەر ئاسا و
بەرگی مارسم لێ دارنێ
ئەمیش دەستی کردە پەرژین
دەستم نەگاتە نەگبەتی، بیخنکێنێ!
نەگبەتی لە دەستم خەلەست؛
سواری با-ڕەش بوو؛ هاتەوە!
***

هاتن؛

چۆن دەعبا دێ، ئاوا؛

دەعبای چی!؟ کام وەحش؟ کام دەعبا؟

ژین لای، ئاوا بێ قیمەتە؟؟

مەرگ هەرزان

نەك هەرزان، مەرگباران بوو!

ئەوەی لە شوێنی جێدەما،

بەس، نەمان بوو!

***

لەو گەرمەی مەرگبارانا،

گەڵای داران،

لە بەرچاوم

چەن بێعار و کەمتەرخەم بوون:

«چلۆن دڵتان دێ دەپشکوون؟!»

***

خەجاڵەت بێ پیرە مێژوو!

تاکەی، هەروا بنێینە سەر زکی برسی،

دەستی ماندوو!؟

خەجاڵەت بن، دار و درەخت و تاڤگەکان!

«تاڤگە"ی من چاوی لێکناوە؛

کاتێك ئاخر-ماچیشم کرد،

جوابی ماچەکەی نەداوە!

***

کاروان کوژە،
باری گرانی هەرەسی
ئەخاتە سەرشانی من و
وەك عادەتی جارانیشی
گۆرانی بە مەینەتەکانم هەڵدەڵێ
من ژان، من مەرگ، میوانمە،
ئەو دەڵێ: «پێ و قەدەم خێربێ»!
***

بارانی رەش
چما چارەنووس دەبارێ
شەوەزەنگ زرینگاێیەوە،
شەو، دیسان شەوگاری دەبێ!
***

«حاجی بووش»، هاتووی چی بکەی؟
ئاوی حەیاتت بۆ ئاوارەییم پێیە،
دەربەدەریم ئەبەدی کەی؟!
پێشتر پێیان وتی «گەو هۆم»
ئێمە،
لەوێش هەین،
لەوێش هەر
رێگات نادەین:
زنجیرکەرانی دنیای دیل!
تەفروتوون بن لە دنیامان؛ با ئازاد بین!
«گەو بەك توو هێڵ»

--------------------

چاوەشەکان، چۆغە لەبەر
چاوەشەکان، پۆستاڵ لە پێ
موکەببەرەیان هەڵگرت و
بە جادەکانا کەوتنە رێ
پەیمانیان بۆ مەرگ و زیندان، نوێکردەوە!
دەست لە ملان بوون، با-ڕەش و کاروان-کوژە!
***

دەبا، منیش
چنگ بە کاکۆڵی خوای ئەم جیهانەی مەینەتدا کەم،
تا گەوزاندن!
دەبا، منیش
وێڕای ئێوە
مەعمەلەکان بخەوێنم
چنگ بە گەرووی قازانج-پەرستییاندا کەم،
تا تاساندن!
دەبا، منیش
دەستانی ئاوەدان-کەرم
بەژێر دەستی وێرانکەراندا دەم
تا وێرانی وێران-کردن
کارم دەوێ؛
نانم دەوێ؛

دەست بەرداری ئازادی بم؟؟
کاکۆڵیان دەکێشمە نێوخۆڵ؛
کازیوەی بەیانم دەویّ!
***
یەکی ئەیار،
من و بەهار
ئاڵای سور و دەشتی سەوزی
ئاسمان و ئەرزمان ئەڕازان؛
با چاوەشەکانی دنیاش
زیندان و زنجیر برێسن!
هەر بینا شان و باڵامان
سەردەرگای گشت
زیندانەکانی هەڵتەکان!

# چ بەستەزمانە ئازادی

چ بەستەزمانە ئازادی؛
زمان بەستراو و بەستەزمانە ئازادی
ئەگینا گەر
زمانی ئازاد گەڕابا،
دوو تفی دەکردە ناوچاو
ئەربابانی ئەم دنیایە
کە میدالیای ئازادی ئەدەن لە سینگی
«شوارتسکۆف» و «کۆڵین پاوڵ»!

# شاژن

دنیا چی بەسەرهاتووە!؟
لە کوێن کارگەرانی چاپ و مەعدەنکاران،
وا شا-ژن دێتەوە مەیدان؟؟
جاری جاران،
شا-ژنی بەریتانیایان
حەفتا و حەوت کون دەشاردەوە
تا من و تۆ
ئەم یادگارە نەنگینەی گەندەڵ-پەرستی سەرمایە
نەبینین و
پێیان نەڵێین:
مالّی گەندەڵیتان وێران؛
ئاخری سەدەی بیستەم و
شایەتی و شاژن راگرتن!؟
بەڵام ئێستا،
دنیا چی بەسەرهاتووە؟!
شا-ژن و سەگانی پۆلیس
لە بەریتانیای مەعدەنکاران و
چاپچییەکان،
بە ئاشکرا و رۆژی رووناك،
دێنە مەیدان و جادەکان
بۆ دڵدانەوەی سەربازان؟!

# هەڵەبجە

بۆ کیمیابارانەکە، لە زمان دایکێکەوە!

نان بە روبعێك،
چوار چەپك نان، بە دینارێك
نان بە روبعێك،
چوار چەپك نان، بە دینارێك
فاتم؛ رۆڵە؛ فایدەی نیە!
گیانی دایکی؛
سبەینێ،
ئەچین بۆ مەعمەل!

***

-ئەو رۆژە من،
لقێك پیاز چییە، نەمدیبوو،
نەمجنیبوو،
سەرم سوڕمابوو: ئەو بۆنی پیازە چی بوو؟؟
دەستم لە شۆردن داشۆری و
«ئاوارە»م بە کۆڵمدا دا و
(دوایی ناوم نا "ئاوارە"؛ سێ رۆژە بوو)
تەماشام کرد،
هەڵات-هەڵاتێك بوو، شار؛ مەپرسە!

کێ بڕوای ئەکرد؟
هاومالیش، هێشتا، چاوی نەدەگلۆفت!
بۆنی سێو بوو؟؟

سـووتانـی چاو؟؟
نە، تۆ بڵـێ دەرخـۆنەیەكـی پۆلاییـن بوو
ئاسـمان!
بڵـێ بارانـی تاعـوونـی و
تۆفانـی هێڵنج و كـۆكـە
بڵـێ هـەوری كـۆنكـرێتـی
بارانـی تاعـوونـی باراند؛
ئەو تاعـوونەی
نێویشـی چـووبووە كـۆركـۆرەی ئاشـی
مـێژوو،
ئێسـتـا لـە من
وەك «هێرۆشـیما» و «داخـائۆ»،
زینـدوو،
سـەری هـەڵێنابـوو!!
جـەژنانە بـوو؟؟
جـەژنانـەی ڕۆژی كـۆمـۆنە؟؟
یان بەرە-جـەژنانـی نەورۆز؟؟
هاوار بە ماڵم... .. چۆن بیلـێم !؟

(بە سـاقـە؛ ئامان! نەكـەوی!
«ئاوارە“ گـیان؛
سـووك بـێ؛ ئازارت نەگـاتـێ... )
...
چـەند كـۆرپەی ناز؛
بەباوەشـەوە، یان تـەریك؛
سـووتاو، خنكـاو، ڕەش-هـەڵگـەڕاو!

سەعاتی مەچەك دەگەڕا
بەڵام دڵی خاوەن-سەعات،
بێ چرکە و تریە، ڕاوەستاو!
چەن جەنازە؟؟!
جا، ژماردنی هەڵدەگرت؟؟
پڕپڕی ماڵ و شەقام و جادەی شارێك
شارێك شەهید بوو،
بە جارێك!
حەددی چییە، «گرینیکا»؟!
قەقنەسەکەی «گرینیکا[1]»،
لە خۆڵەمێشیەوە، دیسان
کەوی خۆ-خۆر بوو، ئەی قاسپاند!
لێرە، بەڵام،
لەنێو جەنازەکانا من
کەوێکیشم دی،
کەوێکی خاڵ و میل دار،
قاسپەکەری هاو-خاڵانی
بەرەو سەر-کانی کەو-کوژان!!
بەرەو
هەرەس و
جار
لە دوای جار،
هەڵوەشان!

---

1- شارۆچکەیەکە لە سپانیا کە لە بەرهەمێکی «پیکاسۆ»دا بووەتە شملی بەرەنگاري دژ بە فاشیسم.

ئەمجارەش بۆ
زەلکاوی ئاوا پڕ ژار و
ئازار و ژان!!
«گرینیکا»ی چی؟!
ئەمجارە،
ئیتر، فاتم و ئاوارە
جوابی قاسپەی خۆ-خۆرانەی نادەنەوە!
راوچی تاعوونی، هەر چی بێ
کاکۆڵی بۆ ناو خۆڵەمێش، دادێننەوە!

**1988/04**

## «عەفوو»

کیمیابارانەکەی بۆتێ

هەموو رۆژێك،
ئێوارانە،
گەرم و گوڕ،
چەك و ڕەخت بەستوو،
شریخە و شاخەی پێکەنین؛
بندەست و کیف، پڕ لە نانی گەرم و تازە،
بۆ دەماخی هۆزی بەش مەینەت و هەژار،
پڕ لە شیعری کەللەتەزێن
بۆ هەست وهۆشی لەشکری بەرینی کار،
پڕ لە نوسراوی تەم-رەوێن،
لەسەر-رێگای هەنگاوی چینی کرێکار،
بەڵێ، هەموو رۆژێك ئاوا،
خۆمان ئەکردەوە بە نێو ئۆردوگادا.
«دەنگی شۆڕش؛»
«دەنگی حزبی کۆمۆنیست»ە و
هەر گرمەی دێ!

...

تاکوو رۆژێك،
رۆژێکی خەزان-بەهار بوو؛
لە ئاسمانی بێگەردەوە
ژەهر باری!
هەوری مەرگ
بە گەردەلوولی ژەهراوی

لەسەر شاخەکان دابەزی
بە هەنگاوی قورس
ئاستەم
لوولی دۆڵ بوو!
تفێکی ژەهراویشی کرد
لە ناوچاوی گەشی کانی
***
جەنازەکانم، هێشتاکو، نەژماردبوو،
نرکاندم:
«هەی زبڵی مێژوو! ...»
گوتی:
«سەهوم کردوە؛ عەفوو! ...»
گوتم:
ئێمەش
ڕۆژێك ئەبێ
وەك ڕۆژەکانی ئۆکتۆبەر
تەخت و بەختی تزاری-مان
چۆن هەڵتەکاند،
تۆش دەنێرین
بەرەو زبڵدانی مێژوو!
ئەوجار نۆرەی ئێمە دەبێ، بڵێین:
«عەفوو!»

## حەقتان چییە؟!

حەقتان چییە،
باسی هەڵەبجەی من ئەکەن؟!
لە ئێوە بوو، منداڵ-بەکۆڵ؟؟
لە ئێوە بوو دەستی ماندوو؟؟
ئەو کەسەی
دەستی کەفاوی
لە نێو تەشتی قاپ و کەوچك شۆرین دابوو،
لە ئێوە بوو؟؟

لە ئێوە بوو
منداڵی مەمکی-دایك-مژ؟؟
ئێوە خۆ، دەمێك بوو،
وەتەن؛ نیشتمانتان
سەروەت و دین و ئیمانتان
نابووە ناو کیفەکانتان
یان سندووقی پشت سەیارە و
تێتان قووچاندبوو،
شارتان جێهێشتبوو!

حەقتان چییە
تەرمەکانمان
ئەنێنە سەر یەك و ئەیبەن
لە بازاڕی بۆمبافرۆشەکانا، وا،

ئەیدەنە بەر داری حەرراج؟!
حەقتان چییە
تەرمی من ئەکەنە پەیژە
بەرەو لووتکەی دەسەڵاتتان؟!

حەقتان چییە
لە پشت جەنازەکانمەوە
حەشار ئەگرن،
تا گڕ-دانێکی تر لە ستەم
لە تەنووری چەوسانەوە؛
لە جەهەنم؛
تاو بدەنەوە بۆ گیانم!

ناماقووڵتان کرد،
ناهێڵم!
بەسیە ئیترا!!

## قەڵادزێ

ئاخێك بە قەد شەوی پاییز
بەقەد ڕۆژانی بێكاریم
درێژ بەقەد
ڕیزی زیلی سەرجادەكان
كە هاتن و
دەستیان كرد بە جەرگی شارا!
چییان نەكرد؟!
چییان نەكرد!؟
ئێستا، نەك دێ، شار دائەگرن!!
***
«ئەم لێفە شڕەم، تا ئێستا، سێ دینار كرێی بردووە»
«ئەم كۆچمە كۆچی حەوتەممە»
«شەشمان، بە هەڵدێرانی گەلابەی سەر پردەكە،
تێداچوون و
دوو منداڵمان
بوون بە ژێر دیوارێكەوە»
***
ئاوی پشت سەدەكەی «دووكان»
چەندە مەندە
ئاخۆ
چ ئاخێك لە ناخیدا پەنگابێ؟؟
كۆنكرێتی سەد
خەریكە
پشتی بشكێ!!

# شەهید

قولچماخ هات
لوولەی ساردی دەمانچەکەی
ئاڕاستەی ناوچاوی دێ کرد
دی ئەیڕوانی،
ڕوانینی مەحکوومی ئیعدام
کە چاویشی نەبەسترابێ!!
...
شاخەی دەمانچەو
هاڕژنی پەیکەری دێ
هەر وەکو گیان بەختکردوویەك
وەك درەختێك
شکایەوە؛
بەرهەمی ڕەنجی جەماوەر
زیندەوەرێکی شەهید بوو
پەیکەری دێ
لە خوێنی تۆز و خۆڵیدا
تلایەوە!

# نەفرەت

شـۆفڵ، وەکـو سـەگ ئەوەڕی
قەپی ئەکـرد بە لاڕانـی دیواری ماڵـە هەژارا
دیـوار، هاڕژنـی ئەکـرد و
قـەدقـەد ئەشـکا و
دا ئـەڕوخـا...

میـچـی تێـکـقـرمـاو
ڕهـێڵـی سـەر ئەرز ئەبوو
دەتگـوت پێڵووی چاوی مـردوو،
نەء، زینـدووە
چاوی تـووڕەی
لـە ژێر پێڵوی
نەفرەتێکـی کـۆنکـرێتـی
بۆ دوارۆژی هـەسـتـانەوەی
«بازیان» و «برایەتـی»
هـەڵگـرتووە!

# جەنازە

نیشتمانچیانی شینگێڕ
فرمێسکی زۆریان هەڵوەران
تۆ بڵێی: وەك گەڵای داران
بۆ شاری دە هەزار شەهیدی
ژار-باران،
گیرام درۆ بوو، بەس زۆر بوو
گیرام هیچیشیان نەگوت
جگە لە
قسەی مەعلووم،
هەر جۆر و بۆر بوو،
بەس زۆر بوو!
بەڵام ئەگەر
ئەو جەنازەیە من دیبووم،
ئەوانیش بینی بوایەتیان
گریانی درۆیینەیان
لێ دەبووە راست
شەپۆڕ و شین!
ئاخر ئەو جەنازەیە من
دیم،
ناوی
«خۆشباوەڕی» بوو
ناوی باوکی «ناسیونالیسم»
لە دایکێك بەناوی «ئایین»

# هەرزانی

دینار، بە نیو-دیناری دوێ،
روبعێکی پێر
بایی پەنجا فلسی پارە
هەرزان و تاڵان
بێن بەرن
ئێستا چی هەرزانە، پارە!
کێ دەڵێ بازاڕ گرانە؟
هەندێك شت هەر خۆڕاییە؛
وەرن بەرن!
مەراق، لە هەرزان هەرزانتر،
هەر مفتە، مفت!
ئەگەر گلیش نەدەیتەوە هەر پێت ئەدەن!
قسەی خۆڕایی وەك خۆڵە!
دەرگای هەر حزبێك کەیتەوە
پڕە لە وشەی سۆشیالیست و جەماوەر
هەتا ببەی بارت دەکەن!
بازاڕی عەجایەباتە
بە زمانی سۆشیالیستیش،
ناسیۆنالیسمت بار دەکەن!
ئەوەی دەیلێن نایلێنەوە:

«کات ناسکە
برایەتی گورگ و مەڕە
وەرە؛ برایانە بەرە،
پارەی هەرزان،
مەراقی مفت،
قسەی خۆڕایی... پێشکەشە؛
وەرە! بەرە!
بیخۆ! بینۆشە! بیپۆشە!
با تۆش کارت گران نەبێ،
کارەکەت هەرزان بفرۆشە!

## وەرگێڕاوی ئازاد لە گۆرانییەکانی
## «ترەیسی چاپمەن»

یاخیبوونی کۆمەڵانی مەحرووم لەم مەینەتاوایە کە بۆرژوازی پێی دەڵێ کۆمەڵ، لە هەست و سۆزی ئەم ژنە شاعیر و گۆرانی بێژەدا، ڕەنگدەداتەوە. ڕووی قسەی، لە دەردو لە شادمانی ئێمەشە. هەر بۆیە، دەدا لە تاری دڵی ژنان و پیاوان و لاوانی یاخی لە ستەم! ئەم ئاوازانە خۆی، یاخیبوونێکە لە نابەرابەری و لە ستەم؛ لەو هەموو یاسای کۆن و لەو دیوارانەی پێش بە هەست و سۆزی عیشق و دڵداری ئازادانە دەگرن.
ئەم یاخی بوونە، گەشییەکی تایبەتی پێبەخشیوە کە نەک هەر سکاڵا لە ڕەنج، بەڵکوو ئومێد و شەوقی ئینسانی ئەم زەمانەش لە خۆیدا دەنوێنێتەوە. با ئەوەش بزانین کە هەستی کەم-تەجرەبەی ئەم خانمە جەوانە، تەواو خاراو نیە و بە شنەی نەسیمی ڕزگاری سەمایەکی تەواو ناکا، بەڵام ئینسانی کارگەر و ڕەنجکێش، بۆنی ئازادبوون لە کۆت و بەندی لێ هەست دەکات و پێی دەبووژێتەوە چونکو شەپۆلی ئەم سۆزە لە پشتی دیواری کەلامیش قەتیس نەماوە و تەنانەت، ئەوانەش کە ئاشنای زمانەکەی نین لە هەست و سۆزەکەی بێبەهرە نەبوون...
بە وەرگێڕانی ئەم چەپکە ئاوازە ویستم پەردەی کەلام بدەینە لاوە و ڕاستەوخۆتر لە هەستی زوڵاڵیدا، مەلە بکەین.

**ڕێبوار**
**پایزی 1989**

# قسه له شۆڕشه

تۆ ئاگات لێ نییه؟
خەریکن له باسی شۆڕشێك دەدوێن
وەك سرته دێته گوێ
تۆ ئاگات لێ نییه؟
***
هەتاکو له سەفی کۆپیندان
که دەنگیان هەڵدێنن لەبەر خێر-خانەکان
هەتاکو مەحتەلن له سەفی بێکاران
که لێك-کۆبوونەوە
بۆ هەنگاو-بەرەو-پێش
هەڵهێنان،
دەستەنگان،
خەریکن ڕاپەڕن
خەریکن هەستن و
بەشی خۆ
بگرنه دەستی خۆ
فەقیرو هەژاران
خەریکن ڕاپەڕن؛
ئەوەی هی خۆیانه
یەکجاری بیگرن
***

تۆ ئاگات لێ نییە؟
باشترە بۆی دەرچی
پێت دەڵێم!
باشتر وایە هەڵێی!
دە یاڵڵا!

ئاخر،
قانوونەکان،
خەریکن دەگۆڕدرێن
قسە لە شۆڕشە
***

# ماشێنی تیژ-ڕەو

تۆ ماشێنێکی تیژ-ڕەوت دەستکەوتووە.
منیش بلیتێکم دەوێ؛
بۆ هەرکوێ بێ!
ئای کە خۆشە!
ڕەنگە پێکەوە بتوانین
شوێنێك پەیداکەین و بڕۆین...
بۆ هەر کوێ بێ!
خۆ، هەر لێرە باشتر دەبێ!
لە سفرەوە دەست پێ دەکەین
هیچمان نییە لەدەست بچێ
ڕەنگە، هەندێ،
کار و باریشمان باشتربێ...
گەرچی
من خۆم نازانم بڵێم چۆن دەبێ...
***
تۆ ماشێنێکی تیژ-ڕەوت دەستکەوتووە
منیش
پلانێکم هەیە
کە لێرە ڕزگاریمان بێ...
من لە فرۆشگایەکی شیك

کار بکەم و دابمەرزێم؛
هەندێك پووڵ پاشەکەوت بخەم...
زۆریش دوورناکەوینەوە
هەر لە قەراغ شارەوە دێین
هەتا ناو شار...
تۆ و من
دەتوانین هەردووکمان
ئیشمان هەبێ...
جا ئەمجار لێت حاڵی دەبێ
مەعنای ژیان دەبێ چۆن بێ!!
بەڵام
بۆ باوکە پیرەکەم
دژوار ئەبێ
ئەو
خۆیەتی و
شوشە مەشروبەکەی؛ ئیتر
ئاوا دەژی؛
دەڵێ بەدەنی زۆر پیرە،
بۆ کارکردن
من دەڵێم بەدەنی گەلێك
لەوە جەوانتر ئەنوێنێ
دایکم، لێیداوە ڕۆشتووە؛
جێی هێشتووە!
چاوەڕوانی زیاتری بوو
لەوەی ژیانی پێیدابوو...

ئاخر،
کەسێ دەبێ هەبێ
لە بابە پیرەکەم پرسێ
بۆیە،
مەدرەسەم بەجێ هێشت
(چم کردایە؟)
***

تۆ ماشێنێکی تیژ-ڕەوت دەستکەوتووە
بەڵام ئایا هێند تیژ دەڕوا
وەك باڵی پێ بگرینەوە؟
ئێمە خەریکین بڕیارێك ساغکەینەوە
ئەمشەو ئێرە بەجێ دێڵین
ژین بێ، یان مەرگ، لەم ڕێگایە؛
لەبیرمە کە گازمان دەدا، لەنێو ماشێنەکەی تۆدا
سورعەتمان هێندە زۆر بوو، من
هەستم بە مەستی دەکردو
چراکانی شار لەبەر پێماندا دەکشان...
باسکی تۆ،
بە
ئیحساسێکی شیرینەوە،
شانمی لە ئامێز گرتبوو
منیش هەستم بەوە دەکرد ...
ببمە کەسێ؛
ببمە کەسێ...
***

تۆ ماشینێکی تیژڕەوت دەستکەوتووە
ئێمە بە گەردش و سەیران،
هەروا، دەڕۆین...
تا خۆمان بەسەرکەینەوە
تۆ، هێشتا،
کارت دەست نەکەوتووە و
منیش
لە فرۆشگەیەك
کچێکی
فرۆشیارم
من ئەزانم... ئەوزاعمان باشتریش دەبێ
تۆ کارێك پەیدا دەکەیت و
منیش تەرەقی دەکەم و
ئێمە
لە ماڵۆچکەکەمانەوە
دەگوێزینەوە ماڵێکی گەورەو
لە حوومەی شار دەژین...
***
تۆ ماشینێکی تیژ-ڕەوت دەستکەوتووە
منیش ئیشێك کە هەموو خەرجمان دەردێنێ
تۆ تا درەنگان، لە باردا،
مەشرووبی خۆت دەخۆیتەوەو
ڕەفیقەکانت زیاتر لە منداڵەکانت دەبینی؛
من هەمیشە

تامەزرۆی ژینی باشتر بووم
پێموایە دەکرێ
من و تۆ
پێکەوە
بە دەستی بێنین...
من تا ئێستا
پلانێکم
دا نەڕشتووە
جێیەك نەچووم
کەوایە: سا،
ماشێنەکەت هەڵگرەوبڕۆین...
***
تۆ ماشێنێکی تیژ-ڕەوت دەستکەوتووە
بەڵام ئایا
هێند تیژ دەڕوا
کە باڵی پێبگرینەوە؟
تۆ خەریکی
بڕیارێك ساغ دەکەیتەوە
ئەمشەو،
ئێرە،
بەجێ دێڵی
ژین بێ؛
یان مەرگ،
لەم ڕێگایە...

# ئەوبەری خەت

ئەوبەری خەت
کێ دەوێرێ
پێ بنێتە
ئەوبەری خەت!؟
ژێر پردەکان
ئەوبەرەوەی نیشانەکان
کە سپییەکان
دادەبڕێ
لە ڕەشەکان!...
لایەك بگرە!
دەنا، بڕۆ بەرێتەوە!...
***
ئەمشەو
هەڵڵا بەرپا دەبێ
لە خیابانە پشتوەکانی
ئەمەریکا...
دەکووژن
خەون و ئاواتی
ئەمەریکا...
کچۆڵەی ڕەش،
وەبەر پەلامار دەکەوێ

هیچکەس
هۆیەکەی نازانێ
داستانەکە
دەکەوێتە رۆژنامەکان
فشار-خوێنی راسیستیەکان
دەچێتە سەرێ
رۆژی دواتر
هەڵڵایەکی گەورەتری لێ بوەتەوە!
هەڵمەتەکارد،
هەڵمەتە تفەنگ،
دوو کوڕی ڕەش دەکوژرێن و
کوڕێکی سپی کوێر دەبێ
کچۆڵەی ڕەش،
وەبەر پەلامار دەکەوێ
هیچ کەسیش ناوی نازانێ
چەندەها کەس بریندارن،
تورەو جاڕز؛...
***
کچەیە
ئەو کەسەی
تاوانبار دەکرێ!!

# ئەودیو دیوار

دوێنێ شەو قیژەکەم بیستەوە!
....
قریشکەو
زیڕڕەیەك
لەودیو دیوارەوە؛
شەوێکی
هەم دیسان
خەو-زڕان؛
زەنگم دا بۆ پۆلیس،
(ئەی چی بکەم؟!)
ئەو نەیامەتانەش
هەمیشە درەنگ دێن
-ئەگەر تازە بشیەن-
کاتێکیش دەگەنێ،
پێت دەڵێن؛
ناتوانن
لە کاری خسووسی
مێردێك و ژنەکەی،
خۆیان تێگەیەنن!!
لە دەرگاش چوونەدەر
چاوەکانی ژنە

فرمێسکیان
وەك باران
هەڵڕژان؛
***
دوێنێ شەو
قیژەکەم بیستەوە ...
پاشانیش بێدەنگی؛
کە مۆخ و ئێسقانمی پێ تەزی!
بەخۆم گوت
بەشکم خەون ئەبینم؛
بەشکێکم خەون بێ
ئامبولانسی سەر ڕێ
پۆلیسیش کە دەڵێ
من لێرەم هێمنی پارێزم؛
کە عالەم بڵاوەی لێبکا!
پێم وابێ
ناتوانین
وەنەوزێك
بخەوین ...

## ژیکەڵانە!
## ئەمشەو لام دەمێنیتەوە؟

«بەداخەوە»
هەموو ئەو شتەیە
کە ناتوانی بیڵێی
ساڵ بەدوای ساڵدا دێ و دیسان
وشەی ئاوا ئاسان نایە
وشەی وەکو
«بەداخەوە»

***

«لێم ببوورە»
هەموو ئەو شتەیە
کە ناتوانی بیڵێی
ساڵ بەدوای ساڵدا دێ و دیسان
وشەی ئاوا ئاسان نایە
وشەی وەکو
«لێم ببورە»

***

بەڵام خۆ دەتوانی بڵێی:
ژیکەڵانە، ئەمشەو لام دەمێنیتەوە؟
ژیکەڵانە،

ئەگەر ڕێك و ڕاست پێم گوتبای
ئەگەر
بە وەخت و وادەی خۆی
پێم گوتبای
ڕەنگە
ببوایتە هی من!
***
«خۆشم دەوێی»
هەموو ئەو شتەیە کە
ناتوانی بیلێی
ساڵ بەدوای ساڵدا دێ و دیسان
وشەی ئاوا ئاسان نایە
وشەی وەکو:
«خۆشم دەوێی»!

# عالەمێك شت

ئەو ژیانەی
هەمیشەو دایم ئاواتە-خوازی بووبم
پێموانییە هەرگیز پێیبگەم
ئەمن کارم کردووە بۆ کەسانی تر
هەتا قەبر
هەمیشەش تامەزرۆ ماوم
بۆ ژیانێکی ئاسوودەو
عالەمێك شت،
عالەمێك شت...

* * *

کە ماشێنێکی لووکسم بێ
پڕ بێ لە لیباسی فاخیر
ویڕ-ویڕکەیەك
بانگی لێکەم
هەموو شتێکم بۆ بێنێ،
هەمووان بەغیلیم پێ بەرن
منیش لەپێش چاوی ئەوان
خۆش ڕابوێرم!
عالّەمێکیش شتم هەبێ!
عالەمێك شت!
ژینێکی ئاسوودەو رەحەت
بە شامپانی و خاویارەوە

خۆزگە ئەوکات بێی بمبینی ...
چونکە دەزانی ئێمە کێین
ئەوانەی لایقی باشترین شتی ژیانن
ئەوانەی کە دەزانن پارە قەدری چەندە
کە پێشێلی بەدبەختین و
هەر لەکاتی
لەدایك بوونیانەوە عالەمێك
لە نەداری نسیبیانە!

ئاخ
ئەوکات
ئەوان پێم دەڵێن:
«هێشتا کات بەسەر نەچووە رۆحم نەجات دەم»
پێم دەڵێن: «هەمووی بدەرەوە!!
بیدەرەوە؛ هەموو ئەوەی
لە چەوسانەوەی ئینسانەکانی تر دەستت خستووە!»
با بڵێن:
«زیاتر لەوەی پێویستت بوو
هەڵت لووشی!!»

ئاخ
ئەمە هەر
ئەو خەونەیە
کە دەتکاتە تۆزی بانان
یان دەتکاتە خانی خانان...
*   *   *

من نابێ بەتەنیا بمرم
هەموو شتەکانم پێش-خۆم دەدەم بەرەو
قەبرێکی هێند پان و هێند قووڵ
کە جێگای خۆم و
ئەو عالەمە شتەی
تیدا بێتەوە
چەند هەست بە تەنیایی دەکەم!؟
ئینسانی چاك...
تەنها ئینسانە چاکەکانن کە
لایان خاتر-جەمم...
ئینسانی چاك
کە خەریکن
ئەو گشتە شتەی خۆم
دەخەنە ئیختیارمەوە...
هەموو دوژمنانی لێ دووردەخەنەوەو
خەمی تەنیاییم ڕاودەکەن...
* * *
من خەریکم خەون دەبینم
خەون دەبینم
خەون دەبینم...

# کچە، بلیتی خۆی وەرگرتووە

کچە، بلیتی خۆی وەرگرتووە
پێم وایە دەیەوێ بڕوا
پێم وایە دەیەوێ بفڕێ؛ بۆ دوور بفڕێ!
کەس نەیتوانی
دەست بێنێتە ڕێگای، نەڕوا
یان بەزۆر پێشی پێبگرێ!

بۆچی نەڕۆی؟! ئاخر بۆچی؟
دوور وە کەوە،
لەم ستەم-مەینەتاوایە
لەم هەموو زەخت و زووخاو و خۆخواردنەوە
بڕۆ
بەرەو
ڕابواردن...

هەرگیز
هیچیان
بەتۆ ڕجوا نەبینیوە...
...
گەورە کچ، دەرەتانی کوا؟
کوا ڕیشەیەك
کە قورس و مەحکەم ڕایبگرێ؟
هیوای هەر دەبێ ئەوە بێ

ڕۆژێك، لە كەسێك گرۆبێ
هەندێ كەسی عەوام

پێی دەڵێن هەڵاتوو،
ڕەدوو-كەوتوو،
یا خۆد، دۆڕاو؛
بەڵام ئەو خۆی باش دەزانێ
بلیتەكەی بۆ كوێی دەبا!
ئەو، جێگای خۆی،
لە هەتاودا پەیدا دەكا!
بەڵێ،
ئەو كچە دوور دەڕوا،
دەفڕێ؛ دەفڕێ؛

# بۆچی؟

بۆ ئینسان دەمرێ لە برسان،
کاتێك خۆراك
بەشی بژێوی گشت دەکا،
لەم جیهانا؟!
بۆچی، کاتێك
ئێمە هێندە زۆر و زەبەند
لە هەرلا هەین،
هێشتا،
هەندێکەس هەن تەنهان!؟
بۆ بە مووشەك دەڵێن سوڵح-پارێز
لە حاڵێکدا
ئاڕاستەی کوشتار کراون؟!
عیشق، نەفرەتەو
شەڕیش، سوڵحە
«نە»، «ئەرێ»یە و
ئێمەش، گوایە، هەموو ئازاد!!
بەڵام
کەسانێك هەن،
خەریکن
جواب پەیدا دەکەن؛

هاکا ڕۆژێکی وا گەیشت؛
لەناو ئەم هەموو پرسیارو ئاڵۆزییەدا
کەسانێك هەن
لەدووی حەقیقەت دەگەڕێن
کەسانێك بەشوێن جوابەوەن
هاکا ڕۆژێکی وا گەیشت
کاتێك کە کوێر
چاوپێچەکەی دادەماڵێ و
زمانی زمان-بەستراوان
لە باسی حەقیقەت دەدوێن ...

# بۆ ئازیزم

دوو حەوتوو، لە زیندانێکی «ڤێرجینیا» دا؛
بۆ ئازیزم، بۆ ئازیزم؛
بیست هەزار دۆلار زەمانەت
بۆ ئازیزم، بۆ ئازیزم؛
عالەمیش پێی وایە گەوجم!
بەڵام ئەوان، خۆ، لە عیشق،
هیچیان لێ حاڵی نەبووە!
ئێمە بۆ عیشق
کاری وەهامان کردووە...

من، پێویست بێ،
هەڵدەگەڕێم بە کێوێکدا
گیانیشم دەنێمە پێناو
گەیشتن بە تۆ؛
تۆ، تۆ، تۆ!

هەموو ڕۆژێك،
پشکنینی ڕۆحم دەکەم؛
بۆ ئازیزم،
بۆ ئازیزم؛
وەڕەز و جاڕزم دەکەن؛
منیش درۆیان بۆ دەکەم؛
لەبەرخاتری ئازیزم؛
من کەوتوومە شوێنی دڵم!

کەللەشم داناوە کەوا،
بە ووردی، لەم عیشقە بگا
کەس ناتوانێ هەڵم بوێرێ!
من کەوتوومە شوێنی دڵم،
مێشکیشم داناوە،
پڕ شەوق،
شێت وشەیدا

بایەخی ئەم
عیشقەو ئەم فیداکارییەی
من تێ بگا!

# ئەگەر ئێستا نە

ئەگەر ئێستا نە، ئەی کەی؟
ئەگەر ئەمڕۆ نە، دەی کەی؟
بۆ پەیمانت گرێداوە لە عیشقێك کە
دوارۆژ بڵێی؟!
فایدەی چییە؟
دەتوانی سەبرکەی هەتا
بەیانی دێ
هەتا ئەم ڕۆژە کەیشەوە
دەکرێ هەر سەبری لێبگری
دەتوانی سەبری لێبگری و
ئەم دڵەشت لەدەست بچێ!
دەتوانی سەبری لێبگری و
زۆر زوو پەشیمان بیتەوە!
ئێستا، تاقە-شتێك کە ئازادە، عیشقە!
دەبێ لەهەرکوێ تووشی بووین،
باوەشی بۆ بگرینەوە!
دڵبەر، لەوانەیە، زۆر زوو، خۆشەویست بێ!
ئەگەر ئێستا نە، پاشان چێ؟
ئێمە هەموو دەبێ لەژینی خۆ بەهرەمەند بین!
هەمیشە ئیحساسمان وابێ
هەمیشە پێمان وابێ کە
ئەوا، هەر ئێستا، وەختیەتی!

# بۆ تۆ

کەلامێك شك نابەم بیڵێم
هیچ کەلیمەیەك ناتوانی
ئەم ئیحساسە دەروونیەی
بۆتۆ هەمە
بیدرکێنیٚ!
هەستێك لەناخی دڵمەوە
کە دەستی پۆلیس و گاردی لێکوتایە
کە دەستی عەقڵ و مەنتیقی لێکۆتایە
ئەمانەوا هیچ کەلیمەم
بۆ بەیانکردنی ئیحساس،
پیٚ ناهێڵن؛
هەستێك لەناخی دڵمەوە
بۆ تۆ، بۆ تۆ،
تەماشام کە،
خۆم بۆ کۆنترۆڵ ناکریٚ!
پێتوایە لەتوانامدایە؟
ئاخر

ئابەم تەوژمی ئیحساساتەوە
چیدی ناتوێنم خاوەنی هەستی خۆم بم
کەلیمێك شك نابەم بیڵێم
هیچ کەلیمەیەك ناتوانێ
ئەم ئیحساسە دەروونیەی
بۆ تۆ هەمە
بیدرکێنی
هەستێك لەناخی دڵمەوە،
بۆ تۆ، بۆ تۆ

# بەڕێز جەنابی سەرکۆمار

وەرگێڕانی ئازاد لە ئاوازێکی «پینک»
سترانبێژی ئەمەریکایی

بەڕێز؛ جەنابی سەرکۆمار!
وەرە؛
تاوێك لەگەڵ من
بۆ گەڕان؛
چما دوو کەسی ئاسایی و
ئەتۆش، لەمن چاکتر نەبیت
هەندێك پرسیارم هەن، ئەگەر
ڕێك و ڕاست جوابم دەیتەو:

چۆن هەست دەکەی
کاتێك
ئەم گشتە بێ-خانەو-لانە
لەخیابانەکاندا دەبینی؟
دوعا بەدەرگای کێ دەکەی
تۆ
پێش نووستن؟؟
چۆن هەست دەکەی
کە دەڕوانیتە ئاوێنە؟
سەرت بەرزە؟

چۆن خەو دەتباتەوە، کاتێك
باقی-ئێمە شیوەنمانە؟!
کاتێك دایکێك
فریای خواحافیزییەکەی ناکەوێ؟!
چۆن ئەتوانی بەسەربەرزی
هەنگاو بنێی؟!
ئەتوانی ڕاست بڕوانیتە ناوچاوم و
بڵێی بۆچی؟؟

بەڕێز جەنابی سەرکۆمار،
تاقانە بوی بەمنداڵی؟
نەکا، ئێستاش تەنیاو تاك بی!؟
تاقانەو تەنیاو تەریکی؟
چۆن ئەتوانی بڵێی
هیچ منداڵێك پشتگوێ نەخراوە؟
ئێمە، نە گەوجین و نە کوێر!
گشتیان لەزیندانەکانتان
تۆش خەریکی
ڕێگای جەهەننەم خۆش ئەکەی!!
ئەوە چ بابێکەکەوا
مافی کیژی خۆی زەوت دەکا؟
ئەوە چ بابێکەکەوا،
لە کیژۆڵەی خوی بێزارە
چونکە کچی،

خۆی، خۆشەویستی کچێکە؟!
ئاخۆ، ڕای «خاتوونی ئەوەڵ» چ بێ؟
لەقسان
ویسکی و کۆکایینتان لێبڕاوە؟!
چۆن خەو دەتباتەوە، کاتێك
باقی ئێمە شیوەنمانە؟!
کاتێك دایکێك
فریای خواحافیزییەکەی ناکەوێ؟
چۆن ئەتوانی بەسەر-بەرزی،
هەنگاو بنێی؟!
ئەتوانی
ڕاست، بڕوانیت بە
نێوچاومدا؟!
کە باسی کاری سەخت ئەکەی؛
گوێگرە با پێت بڵێم
کاری سەخت
چۆنە:
کرێی کەمترین و
منداڵێکیش بەڕێوەبێ!
پێت بڵێم کاری سەخت چۆنە؟؟
دووبارە بەرپاکردنەوەی
ماڵێکی بومباران کراو!!
بڵێم کاری دژوار چۆنە؟؟

جێ-خەوخۆش کردن
لە مقەبا؛ لە کارتۆن!!
بڵێم کاری دژوار چۆنە؟؟
کاری دژواار
کاری دژوااهار ...
تۆ یەك ڕێزەیش،
ئاگای کاری سەخت و دژوار،
هەر نازانی؛
نازانی؛ نا!
کاری دژواار
کاری دژوااهاار...
ئااای ی ی ی...
چۆن ئەتوانی
بەسەر-بەرزی
هەنگاو بنێی؟!
بەڕیز؛
جەنابی
سەرکۆمار؛
باوەڕناکەم
هازت بێ
تاوێك بگەڕێین
وایە؟ یان نا؟؟

# دەستی ماندوو

«دەستی ماندوو لەسەر زکی تێرە»
پەندی پێشینان

خەجاڵەت بێ؛ پیرە-مێژوو!
ئاخر تاکەی
بنێینە سەر زکی برسی
دەستی ماندوو؟

ئەقیێژینن: «قەیران، قەیران»
ژین هەرزانەو ژیان گران

کوڕەی عەرزم کردە بەهەشت
چەرخی ئاسمانم گرتە مشت
بەڵام چەرخی چارە- نووسم،
دوورتر لەگشت

«دۆعا“ یان کوشت
هەزار خەون و رووئیایان کوشت
«ندا»یان کوشت
هەزار رازو نزایان کوشت
«ڤیکتۆر خارا»،
«جان لنون»و
«جەوهیل» و

«چەگەڤارا»یان کوشت
لەکوێ غەرقی شەرم و
شەلاڵی ئارەقی خەجاڵەت بووی
پیری پرتووکاوی مێژوو!!

پاشەو-پاش تاکوێ بچمەوە
هەتاهاوڕێ مارکسم بڵێ:
گوڵ لێرەیە
هەر لێرە سەمای بۆ بکە!؟

خەجاڵەت بی پیرە-مێژوو!
ئاخر تاکەی
بنێینە سەر زکی برسی
دەستی ماندوو!؟

# میوانی تۆن*

بەدووچاوی وەك زرێبار، گەرمی گرینە؛
دەشتی شینی مەریوانە، سەرگەرمی شینە!
لە"تاڵە سوار" دائەبەزن دوو سواری سوورپۆش؛
میوانی تۆن؛ «کاك فوئاد»ی دڵگەرم و رووخۆش!
میوانی تۆن؛ هاتوونەوە لەتەورێزەوە
میوانی تۆن؛ بیانگرە لە ئامێزەوە
لەهەواڵی هەڤالانی تەورێزو تاران،
چەپك چەپك گوڵیان پێیە" پڕ-پڕ بەدامان؛
بیاندوێنە؛ بابوت بڵێن سرودێکی نوێ
گەش و روونتر لەو سروودەی کە بیستووتە دوێ؛
دەستە-دەستە لاوانی سەربەرزو شۆڕشگێڕ
بەرانبەر بە جووخەی ئێعدام، بەدەنگی دلێر،
ئەگوڕڕێنن؛ تەختو بەختی دوژمن ئەلەرزێ
ئەڵێن: دوژمن"راوەستاوی بەرانبەر بەکێ؟؟
بەرانبەر بە ڕندووی قورسی شۆڕش وەستاوی
دژی سێلاوی باوەڕو هێرش هەستاوی!
وا بەیانە، بۆیە وایە، ئەی سەر لێ شێواو!
ئەستێرەکان ئەتوێنەوە نێو نووری هەتاو
زەردەخەندەی گزنگی خۆر، لەزاری لاوان

پەرچەمی فەتحی بەیانە، کاتی تیرباران
ئەستێرەکانی گەلی کورد لەگەڵ پێشەنگان
شەبەقی سووری ئاسمانی هیوایان نەخشان!
شەهیدانی شۆڕشگێڕمان پێشەنگی خۆرن؛
بناغەی بنکەن-کراوت بەخوێن ئەشۆرن

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# شیرین ئەدویٚ*

شیرین ئەدویٚ، کاڵی شیرین!
گفتوگۆت چەندە شیرینە؛
ئەی ناسکە چاو کاڵەکە
کە گەشترین گوڵی نێرگز
ئەبیٚ زۆر زۆر منەتبار بیٚ
ئەگەر بڵێم
وەك چاوەکانت ڕەنگینە!
***

شیرین ئەدوی، تەڵی ناسك
تەڵی ناسکتر لە لاولاو
کە گۆمی مەنگی چاوانت
پڕ-پڕە لە شادمانی
شادمانی مەعسوومانە
دڵی پاراوی شۆڕشگێڕ
پڕ دەکەی لە گورج-وگۆڵی؛
***

تەڵی تەڕی نەرگسی باخ؛
رازێنەری سەنگەری شاخ!
بۆکویٚ؟
بۆ شار ئەچیتەوە؟
جەخارو داخ!!

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# تا هەتایە

بە شوێن، ئاوازێکی ڤیکتۆر خارادا؛
بۆ چەگەڤارا.

بانگەوازی
لووتکەکانی مێژوو،
وتیان:
خۆشمان بوێی!
هەتاوی وەرەی بەرزت بوو،
لەگەماروی مەرگەساتا،
گۆشی کردین

ناخی دڵمان
پڕە لەعەشقی زوڵاڵی
هەست کردنەوە بەحوزوورت
هاوڕێی فەرماندە: «چەگەڤارا»!
کەدەستانی بەهەیبەت و
مەزنی تۆ
تەوژم ئەداتەوە مێژوو
سەراسەری «سەنتا کلارا»
بەخەبەری دیداری تۆن!
ناخی دڵمان
پڕە لەعەشقی زوڵاڵی
هەست کردنەوە بەحوزوورت
هاوڕێی فەرماندە «چەگەڤارا»!

هاتوویتەوە
گڕبەردەیتە گژەبای دڕ
بەهەتاوانی بەهاری
کە ئاڵای سوور باڵا بکا
بەتیشکی زەردەخەندەکەت

ناخی دڵمان
پڕە لەعەشقی زوڵاڵی
هەست کردنەوە بەحوزوورت
هاوڕێی فەرماندە «چەگەڤارا»!
عەشقی شۆڕش-پەروەری تۆ
سەرەتای تازەی خەباتە
کاتێك هەموان
سەوداسەری
دەستانی رزگاری-دەرتن!

ناخی دڵمان
پڕە لەعەشقی زوڵاڵی
هەست کردنەوە بەحوزوورت
هاوڕێی فەرماندە «چەگەڤارا»!
ئێمەش پەیگیرو پێداگر
چون-جاران: شان-بەشانی تۆ؛
لەگەل فیدل،
بەڵێنمان بۆت بەردەوامە
هەتا هەتایە“ فەرمانده؛
هاوڕێی فەرماندە «چەگەڤارا»

لێرەدا، ئەو شیعرانە دێن کە لە کۆبەرهەمەکانی پێشوودا نەهاتوون. هەندێکیان لێرە و لەوێ چاپ کراون یان لە سایتی خۆم بڵاکراونەوە؛ هەندێکیشیان هەر بڵاو نەکراونەوە. لەوانەیە هەموویان بەکات، تازە نەبن؛ یان وەرگێڕدراوی بەرهەمی هەر ئەو شاعیرانە بن کە هەندێک لە کارەکانی لە کۆبەرهەمەکاندا هاتوون؛ یان وەک یەکەمین پارچە کە بە یادی فۆئاد، بەشێکی کراوە بە سرود و بڵاو کراوەتەوە ... هەندێکیشیان تازەن و هی چەند ساڵ و چەند مانگی رابوردوون.

# بۆ فوئاد*

کارێکی ساڵی 1979

سروودی «کاک فۆئاد، هەڵبژاردەیەکە لەم شیعرە
کە لێرەدا، بە ڕەنگی شین دیاری کراون.

کاتێک کە شەیتانی گەورە
ئاگری بەردا لەم دەورە،
بۆ سەر خاکی کوردەواری
یاجووج و ماجووج دا باری؛
ئەرتەشی و پاسدار وەک دوژمن
بە خوێن-خۆری و ئینسان کوشتن،
هاتن؛ وەک لافاوی بەهار
ڕشتیان خوێنی خەڵکی هەژار،
ویستیان چاومان بترسێنن
کۆرپەی شۆڕشمان بڕفێنن،
پێشمەرگە، وەک پڵنگی لان،
لێی دەرکەوتن، بە هەزاران.
لێیان کوشتن، وەک گەڵای دار
بە دە و بە سەد و بە هەزار.
«فۆئاد»، ڕۆڵەی ئاگر و خوێن
تۆوی شۆڕش لە هەموو شوێن؛
وەستا، شێرانە، بەرانبەر

پەلامار-دەر، چەشنی سەنگەر!
«گیڤارا»ی کوردەواری بوو
لە هەموو شوێنێك دیاری بوو!
دوژمن، کە چاکی دەناسی
پشتی دەلەرزی لە باسی
خستیە ناو داوێکی گەورە؛
جاش و پاسدار، لێی دا دەورە؛
بە جاش و تۆپ و تەیارە،
دەیسا، بەرسەریدا، دابارە.
شێرانە لێیان هاتە دەست.
بەخێر بۆ مەرگی ڕێی مەبەست!
لێی تلاندن؛ نەیەك، نەدوو،
چاك لێی کوشتن، بە ئارەزوو!
بەڵام، لاڵ بم، ڕێزی شەستیر،
گلاندی شۆڕشگێڕی ژیر.
کۆستی کەوت دایکی کوردستان
لە شەهید پڕ بوون گۆڕستان!
سەرەخۆشی بۆ لە گشت یاران
لە دایکە «بەهیە» سێ جاران!
جێی دایکی وا بەرزی هەورە،
دایکی سێ شەهیدی گەورە!
ئیتر کێ بێ وەکوو «فۆئاد»
تەواوی ژینی بەخت بکات!؟
کێ بێ وەك برووسکە وابێ
کوردوستانی پێ ئاوابێ!؟

نەك هەر كوردوستان، گشت ئێران؛
هەموو تووڕە و تازیە باران؛
بۆ «فۆئاد»ێ كە سەنگەرە
یادی لە دڵمان ڕابەرە!
دەمێ یەكیەتی جووتیاران›
دەمێ كۆڕی زەحمەتكێشان؛
دەمێ سەنگەر، دەمێ مەزرا،
كۆڵ هەڵگرتن لەگەڵ فەلا!
شۆڕشگێڕی زەحمەتكێشان،
چرای ڕێی دەروون پڕئێشان؛
وەرن یاران بەشینەوە،
ئاوا بیلاوێنینەوە
كاك «فۆئاد» ئەی شەهیدی ژێر
شۆڕشگێڕی پاك و پەیگیر!
شەرت بێ جێگات بگرینەوە
سەنگەرەكەت پڕكەینەوە!
بەڵام سەنگەر پڕن، یاران؛
ئەڵێی گوڵن لە بەهاران...
شاخ و كێو پڕ لە پێشمەرگە؛
دوژمن نەسیبی هەر مەرگە!
قووڵتر بێ شۆڕش لەم دەورە!
بڕووخێ شەیتانی گەورە!

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غوڵامی)ەوە كراوە بە گۆرانی.

# بەهار

لە شیعرەکانی «هنری جۆرج»،
شاعیری ئەمریکایی 1933

دیسان عەتری بەهارە وا
گیانی بەخشیوە بە هەوای
مانگی نیسان
سەوزە گیا
زەوی پۆشیوە
سەراسەر بەرژەوەندی گیان
وا ڕەمزی ئال و گۆڕە دێ
لە پیش چاوی هەموو ماندا
شادی جیهان ئەنەخشێنێ
گەر هەبێ چاوی ببینێ
لەسەر چلە شکۆفەی ورد
چرۆ سووربا‌وتر ئەنوێنی
گەڵای سەوز گەشتر ئەدرەوشێ

هۆ دەورانی نەگبەتی و شووم!
وەرزی تازەت لە زگ دایە

بیهێنە بوون
با کازیوەی هەتاو و شادی

بدرەوشێ
چەند خۆشە شۆڕشێك
دنیای
سبەینێی لێ دەزێ...
خۆشە بەهار و مانگی مەی
مایەی شادی
مایەی ئۆخەی ...

# سیمان

لە گۆرانییەکانی «ماری تۆلای»،
ستران بێژی ئینگلیزی

ئەو شوێنە من تێدا دەژیم
دیوارەکانی سیمانن
تەبەق-تەبەق لە سەر یەکتر
هەمووی سیمان
مێیچی سیمان
تەختی سیمان
چما زیندان!
زیندانێك كە
پێویستی بە
کلیل نیە
دەرگاکان هەموو ئاوەڵان
بەڵام
گیرفانی بەتاڵم لێم بوونەتە
تەڵە و زیندان

(کورس):
بۆیە منیش
خەریکم هەڵی دەکڵۆشم
ئەم سیمانە هەل دەکەنم
ئاگاداری تۆوەکانی بن عەرز دەکەم

چرۆ دەرکەن و باڵاکەن
هەلی دەکۆلم من ئەم سیمانە
من خەریکم هەلیەکەنم
*
*
من نامەوێ لێرە بژیم؛
کەس نایەوێ
جێگایەکی نەگبەت
کە ڕۆحم یان تییدا دەناشت؛
(هەر بەو شەرتەی توانیبایان)
قەتیسی چوار-دیواریەکم دەکەن؛
چما زیندانی بم!

بەلام منیش خۆ کول نادەم؛
ئەم ئەرزەی لە ژیر پیم دایە
ئاخری دەکەم بە هی خۆم

(کورس):
بۆیە منیش
خەریکم هەڵی دەکلۆشم
ئەم سیمانە هەل دەکەنم
ئاگاداری تۆوەکانی بن عەرز دەکەم
چرۆ دەرکەن و باڵاکەن
هەلی دەکۆلم من ئەم سیمانە
من خەریکم هەلیەکەنم
*
*

من ئەمەوێ
دووبارە ئەرز
ئاسمانی بەرین ببینێ
هەست بە تیشکی گەرمی هەتاو
بکاتەوە؛
تامی باران هەم دیسان بچێژێتەوە؛
نەفەس بکیشی،
تا هەرچی زیندەوەرانی ژیر خاکە
هەڵ نەکورمێن
بژیەنەوە
کاتیك کە من
دەستم بە خاکدا
رۆدەکەم

(کورس):
بۆیە منیش
خەریکم هەڵی دەکلۆشم
ئەم سیمانە هەل دەکەنم
ئاگاداری تۆوەکانی بن عەرز دەکەم
چرۆ دەرکەن و بالاکەن
هەلی دەکۆلم من ئەم سیمانە
من خەریکم هەلیەکەنم

## مەگری، پاییز!

سەد پاییز پاش «جەو هیل»

مەگری، پاییز
شین مەگێڕە
بۆ سەدەمین ساڵیادی
«جەوهیل»ی ئازیز...
***
ئەگەر ئەوان
گەرمای پەیکەری «جەوهیل»یان
بە گوللەباران دامران،
نەیانتوانی
بانگەوازی گەرم و گەشی
بەر دەسرێژ دەن
بانگەوازی «جەوهیل» نەمرد؛
گوللە قەت کاری لێنەکرد ...
بانگەوازەکەی، ئەمەتا
ئەمەتا لە گەرووی مندا؛
گەرووی «نازم حکمەت»، «برشت»؛
لە بانگەوازی «جان لینۆن»،
لای «جۆن بایز»، «لۆرکا»، «ئاراگۆن»، «دیلان» و
«ویکتۆر خارا» ...

وا بەگشتمان
هاو-بانگەوازی «جەوهیلین»
بۆ گشت پەڕاوپەڕی جیهان!
دە بەس بگری؛
پایز، پایز؛
***

وا سەد ساڵە
یەکیەتی گەورەی جیهانی کرێکاران،

سەد بنج،
سەدان
ریشە دەکا
لێرە و لەوێ
بانگەوازی
هاندەر و ڕێکخەری «جەو هیل»
دەگاتە مەنزل
مەنزڵی
دڵی جەماوەری بەرین.
بریا ئێستا
«جەوهیل»، لێرە،
لەلامان با
جەخار، جەخار؛
«جەوهیل»، نەما تەماشاکا
چەند دەنگمان دلێرە ئێستا
بە بانگەواز
بانگەوازی یەکگرتوویی!

بۆ منداڵە بێ-ڕەنگەکان؛
بۆ کچانی کارخانە و بۆ
هەموو چەوساوەیەکی کار،
ئێمەین،
ئێمەین دەنگی بێدەنگەکان
جەخار، ئەما تەماشاکا
بەدیهاتووی ئاواتەکانی ئەوکاتی
نان و حورمەت و ئازادی
تا چەندە دەستەبەر بووە و
دەشکۆفێن و هەمیسان دەگەشێنەوە.
جەخار، ئەما تەماشاکا
چۆن سەرمایە
ترنجاوەتە کونجووڕی
قەیران و داعش و فاشیسم
-وەك چۆن «جەو هیل» ئەو زەمان، ئاواتەخواز بوو-
وا کۆیلەتی کرێگرتە
کەوتوەتە بەر پەلاماری
نەوەد و نۆ لە سەر سەدی، چەوساوەکان!
دەبەس بگری
پایز، پایز
خۆشکەرەوە بارانەکەت
بەرزە
بانگەوازی گەش
و ڕێکخەری جەو هیلی ئازیز!

**نۆڤامبەری 2015**

## پاریسی «پێرلاشەز»

مەستانی ئەفیوونی ئائین، سەرەتای ساڵی (2015)، هێرشیان کردە سەر ڕۆژنامەی «شارلی ئەبدۆ» لە پاریس؛ 15ی نۆڤەمبری هەر ئەو ساڵەش هێرشیان کردە سەر تالاری شادی و مۆسیقای «بەتاکلان» هەر لە پاریس!

پاریسم
بریندار
بەتیری مەستانی ئەفیوونی ئائینە

***

پاریسی «پێرلاشێز»
پاریسی کۆمۆنە
بە گەرووی خوێناوی
ئاوازێك هاودەردی «بێرووت» و
هاودەردی «ئەنکارا» و
هاوپشتی «کۆبانێ».
پڕ گەرووی زامداری
ئاوازی ئەخوێنێ:
هاودەردین
پێکەوە پێکراوین بە تیری سەرمایە
بەتیری جیهادی سەرمایە و
بە تیری پۆلیسی سەرمایە.
چما دوو بەرداشی سەر و ژێر.

هەستیمان ئەهارِن؛
ئاردەشانی خوینمان
سنووری گشت بەزاند...
***
کە دەسرِێژ لە «شارلی»
کە دەسرِێژ لە قەڵەم
لە گەرووی بانگەوازی «ڤۆلتێر»
نەیتوانی
نە قەڵەم بشکێنێ
نە «ڤۆڵتێر» بێدەنگ کا،
هاتنەوە مەستانی ئەفیوونی و
ئەمجارە
تەقەیان لە شادی و ئاواز کرد
«بەتاکلان» یان گەوزاند لە خوێنا
***
پۆلیسی گەمژە و گەوج
خاج لە نێوچاوانی ئەکێشێ و
خیش ئەکا و
بە پۆستاڵیشەوە دێتە سەر
گەلای سووری شەقام
سەر ئازادی مرۆڤ
وەك کردەی کۆنیشی
لاژە-لاژ،
ویرد و ئەورادی پووچ
ئەخوێنێ بە خۆیا
***

بەڵام خۆ پاریسی «پێرلاشێز»
پاریسی «کۆمۆنە» و «پوەتیە»
شەقامی بەرنەدا
بە ئاڵای ئاوازو
بە ئاڵای شادی،
بە
«پیانۆ پرۆتێست»
هاوپشتە و
هاوەنگی جیهانێك کە چاوی
هەڵدەبڕێ
مشتە بۆ ژێرچەنەی جیهادی و
پۆلیس و
سەرتاپای بێدادی نگریسی ئاژاوە!
***
ئەوێستا
پاریسە و
جیهانە و
هاوپشتی
پاریسە و
هەستانە و
هەڵدێرانی مەستان
هەڵدێرانی مەرگ و
مەنگانی مەرگ-خواز
پاریسەو
شەقامە و شادییە و ژیانە
کۆمۆنە و ئوکتوبەر
ڕێ-نیشاندەرمانە!
**2015_11_22**

# بڤه!

له یادی سه رده شت عوسماندا
5|5|2013

«بڤه! نه‌که‌ی!»
ئه‌مه روونترین په‌یامی چاوه‌شی چۆغه‌-له‌به‌ره؛
به په‌یکه‌ری له خوێن-گه‌وزاوی «سه‌رده‌شت»دا
ئاراسته‌ی من و توی ده‌کا!
«بڤه! نه‌که‌ی:»
نه‌که‌ی په‌رده له‌سه‌ر ده غه‌ڵی و تالان هه‌ڵماڵی!
نه‌که‌ی باسی
چاله‌-نه‌وتی په‌یکه‌ری کارگه‌ر قووت-ده‌ر،
ژنی سووتاو،
مناڵی بێ ناز و نه‌وا،
درامای «دۆعا»
له هه‌ڵڵا ده‌ی!
ئه گینا چی؟
ئه‌گینا قوزڵقورتی مه‌رگ!!»
ده‌ڵێ: «چاوێك لار بڕوانێته گیرفانم
هه‌ر ئه‌و به‌ڵای به‌سه‌ر دێنم
به سه‌ر زاری «سه‌رده‌شت عوسمان»م هێناوه
ئازادی به زنجیره‌کانتا هه‌ڵ-بڵێی؛
ئازادی ئاوازی ره‌نگین

بو قفڵ و نەردەی زیندان و
پۆستاڵی چاوەش دابنێی؛
دە نا قسەی زلتر لەزار؟! بقە؛ نەکەی!!
وسکوت! قوڕ و قەپ! دەنگ نەکەی!!»
***
بەڵام پەیکەری نەبەزی «سەردەشت عوسمان»
پەیامێکی تری پێ یە:
دەلی: «ئەوان خەتی سووری بقەی خۆیان
بە خوێنی من نەخشاندوە
ئەفسانە ی تۆ خۆش و من خۆش،
گەیشتە خاڵی کۆتایی گوللەی گەرم؛
چی یان لە «جە وهیل» کرد، ئاوا؛
بەڵام کوشتنی مرۆفێك
چەکی بەهیزتر لە گوللەی گەرمی دەوێ!
منیش نەمردم؛ وەك «جەوهیل»
منیش،
بۆ ئێوەی جەنگاوەر،
ڕوونتر لە پەیامی «جەوهیل».
پەیامیکی دی شك نابەم
شیوەن مەکەن!
یەکگرتووبن!

**5|5|2013**

# بۆ فەرخوندە؛

عالەم پڕە
لە بانگەوازی «فەرخوندە» و
جەخاری مەرگی «فەریناز»؛
بانگەوازی یاخی بووەکان؛
«فەرخوندە»ین
«سوهەیلا»ین
«نیدا»ین
«دۆعا»ین و «فادیمە»ین
«پیلا»ین...
«ڕێحانە»ین و ... «فەرینازین»...
لیستەیەکی بێ کۆتایی...
***

هاواری یاخی-بووانی هەناسە-سوار:
تاچەند؟!
تاکەی؟!
تاکەی تیژاو؟!
تاکەی سوهەیلای جەورکێش!؟
تاکەی چاومان
ئەکەنە چاڵی چەتوونی!؟
***

رۆژ-نه-رۆژێ
پەیکەری سووتاومان
ئاڵای نەفرەتێکی یاخی بووە
یاخین ئیتر
لە ئائین
لە نەریت یاخین
لە تەشی رستنی شیرین
دەست-بەچەك لە بێداد یاخین!
لە حوکمی بێدڵی خەمسارد،
پێشێلکەری گوڵاڵەی ژین
پێشێلکەرانی فەرخوندە،
لەبەنگییانی کوێر و کەڕ
لە نۆکەرانی حوکمی دین
حوکمی دەسەڵاتی پارە
حوکمی ئینسان-فرۆش
یاخین!
***

ئێستا، فەرخوندە ئاڵایە
دەسڕێژە، هەڵمەتە، مشتە،ڕاساوە
لەژێرچەنەی ریشنی ئائین
لە ژێر چەنەی
بێ ڕیش و بێ شەرمی «سیمین»
بەڵێ فەرخوندە بوو بە مشت
مشتی یاخی بووان لە دین
***

سیمای خویناوی فەرخوندە
گوڵێکە، ئاڵایەکی سوور
بە مژدەی نەورۆزی تازە
نەورۆزی هاودەنگی بەرین
نەورۆزەکەی پیرۆز کردین
***

سالی تازە

بەهاری تازەی هاودەنگی
لە «پامیر»ەوە تا «ئوسلۆ»
پڕ لە بانگەوازی نوێی
«یاخین؛ یاخین»
سوهەیلا ش یاخییە لە جەور
هۆزی جەورکێشان یاخین!
لە ئائین
لە نەریت یاخین!
لە تەشی ڕستنی شیرین؛
چەك بەدەست، لە بێداد یاخین!
لە حوکمی بێدڵی خەمسارد،
لەدەسەڵاتی سەرمایە و
حوکمی پارە لەسەر ئینسان؛
لە ژاکانی گوڵاڵەی ژین
بە سمکۆڵی
بەنگییانی ئەفیونی دین؛
لە حوکمی ئینسان-فرۆشی جیهان
یاخین!

**نەورۆزی 2015**

# بژی کوبانێی بەرەنگار

مەستانی ئەفیوونی ئایین؛
هاتن؛
چۆن دەعبا دێ، ئاوا!
دەعبای چی؟
کام وەحش؟ کام دەعبا؟
ژین، لای ئاوا، بێ قیمەتە؟؟
مەگەر سەرمایەی بێ-بەزەی
ژینی مرۆڤ بەتالان-بەر؛
کەڵەگای شێتی سەرمایە
مەستی ئەفیوونی ئایینی چاوچڵێسی
پڕ-چەك، پڕ-پارە، مێشك-بەتاڵ
هاتن؛
کوشتیان؛
گرتیان؛
بردیان؛
ماڵیان ڕمان؛
ملیان پەڕان؛
کۆڕەو؛
ئاوارەیی؛
دیلی؛
کۆیلەتی و
ئینسان-فرۆشی لە نێوبازاڕ!!
***

خەڵکی چەکدار؛
خەڵکی ڕێکخراوی چەکدار؛
دایکان و کچانی چەکدار؛
پیاوان، لاوان، گشت بە یەکجار؛
بوونە دیوار؛
بوونە قەڵای بەرخوەدان و بەرەنگاری؛
بوونە دەسڕێژ؛
بوونە ستران و هاوار؛
ئازادیمان؛
ئازادی هەموو کۆمەڵگا؛
ئازادی مرۆڤایەتی
بۆ سەرنجامێکی رزگار
***

مەستانی ئەفیوونی ئایین؛
کەڵەگای بێڕەحم و بەزەی
خوای سەرمایە؛
پڕ-چەك، پڕ-پارە، مێشك-بەتاڵ؛
دڵ-بەتاڵ لە شەرم و شکۆ؛
هەر لە چەشنی باجەی خەمساردی بانکەکان؛
هاتن؛
بردیان، کوشتیان، گرتیان،
ملیان پەڕان، ماڵیان ڕمان؛
کۆڕەو، دیلی،
ئینسان-فرۆشتن لە بازاڕ!!

بەڵام کۆبانێ قەڵابوو
بەرخوەدان و بەرەنگاری خەڵکی چەکدار
کچان و ژنانی دلێر؛
دەست-ودڵ-یەك-گرتوو؛ بوێر؛
سینگی کچان،
نەك قەڵغانی گولە،
بووبە قۆناغی چەکی هێرشکەر؛
دەسرێژی قارەمانانەو
ژینگەی ستران و هاوار؛
ئازادیمان؛
ئازادی هەموو کۆمەڵگا؛
هەموو مرۆڤە بەیەکجار
***

کۆبانێ قەڵابوو؛
مشت بوو؛
بۆ بن ڕیشی مەستانی ئەفیوونی ئایین؛
بۆ سەرسینگی خودای خەمساردی سەرمایە؛
بۆ نێوچاوی کەڵەگای شێتی بێمایە

بژی بەرخوەدانی گشتی خەلکی چەکدار؛
دایکان و کچانی سەنگەر؛
قەڵا و دیوار
بژی کۆبانێی بەرەنگار

**4/10/2014**

## بەجێم هێشتی

خوشکم، خەجێ، هاتبوو بۆ دیداری من کە خوشکی گەورەمان، حومەیرا، چرای ژینی کوژایەوە...!

بەجێم هێشتی و
ماڵاوایی
ئاسایی بوو...
بەتەمابووم
کە دوایی بێیتە پێشوازم؛
باوەشی گەرمی خۆشکانە

نەك ئاوا، سارد!!!

مەگەر خۆت نەت وت «بەخێرچی»؟؟

ئەی بۆ شێوانت باوانم؟؟

ئەی بۆ سارد و سڕە، ئێستا، باوەشی گەرمی دایانم؟؟

جووتە-خوشکێك بوون، من و تۆ،

وەك جووتێك چاو

ئێستا، چۆن چاوم هەڵێنم؟؟

چۆن

تەنیا-باڵ و تەنیا-چاو،

چۆن؟؟ تەنیا، باڵ بوەشێنم؟؟

چلۆن ئێستا،
میوانداری
میوانە خۆشەویستەکانت کەم؟؟
*
ئۆفف؛ جێم هێشتی!!!
کە هاتمەوە،
ئینساف نەبوو...
باوەشی سارد
بەتەما بووم...
بەتەما بووم...بە باوەشی گەرمەوە؛ وەك جاران
بێی بە پیریمەوە، دیسان...
کەچی
تەنیا
زەردەیەکی نەرم و نیان
لە پشت شیشەی ساردی قاپە عەکسێکەوە!!!
بۆ کوێی ببەم؟؟
چی لێ بکەم؟؟

**17_02_2014**

# ئەچین بە گژ ڕۆژ-گیرانا

تەواوە جەنگاوەرەکەی
بە گژ هەوری ئاسماندا چوو
ئەی ئەو نیوەکەی پەیکەرم
هاو-شاباڵی باڵ-وەشینم
کاتێك کە بووی
ساڵ و زەمانەی بێ-رەزا
گوێزەوانەی بۆ نەکردی
لەجیاتی پۆیلانە و شادیش
سەرەخۆشییان لێ کردم...
بۆ سەبووری خەمیش وتیان :
«پێ و قەدەم خێرە،
ئیشەڵڵا»
کە نیۆیان بۆت ئەدوزیەوە
لە جیاتی «نەرگس» و «نەسرین»
لە جیاتی «ئازادە» و «ئالا»
غەیزیان بەوەدادەپۆشی
ناوت بنێن:
!!«کافیە» و «بەسێ» و «ئینتیها»
کاتێك هێشتا
خەونەکانت
تێکەڵاو گورگانە-شەوێ...

هێشتا تازە
گەزە-گەزە
دارە-دارە
خەریك بووی دەکەوتیە سەر پێ
لەسەر دەسگای تەون دانرای؛
چاوە گەشەکانت فێربێ،
دەستی «نازدار»
چلۆن گورج-گورج هێلمە ئەبڕێ و
چلۆن کەڵکیت ئەوەشێنێ!

زۆر لەمێژە
منیش و تۆش
لە کوورەی کارا قاڵ ئەبین
خشت-بە-خشتی
بینای بەرزی ئەم جیهانە
دەستێکی من
دەستێکی تۆ
لەسەر یەکتری هەڵ ئەچنین
هاو-ڕەنج؛
هاو-شادی! هاو-سەنگەر!
ئەی ئەو کەسەی
کە ئاوێنەی چاوەکانت
بەرانبەر چاوم ئەدرەوشێ و
ئەبین بە شیعری تووڵانی هەتاهەتا
رۆژی بەری
کە پێکەوە

لە تاری دڵ، گەرووی پاراو
یەکەم نەغمەی شادی یەکبوون
لێك-ئاڵانی ئینسان
نەغمەی شیرینی دلداریمان هەڵێنا
هەزار دڕکی مەم و زین و
هەزار داوی کەڕوو-هێناوی دابی کۆن
کەوتە نێوان!
تەم و-مژی لێڵی زەمان
سیبەری ڕەشی عابای شووم
بەری نیوەی ئاسمانی ژین،
نیوەی هەتاوی، لێ گرتین
لێمان بۆەتە
مۆتەی نگریسی ڕۆژگیران .. .
ئیستا بەڵام
ئیمە دوو دەستی بە هیزین
هەر دوو نیوەی یەك پەیکەرین
خودای کارامەی سەر-زەوین
لە ژیر میچی کارخانەکانەوە
چەرخی ئەم ڕۆژگارە ئەسووڕینین

دەستەکانمان
وەك دوو ڕۆخانەی خرۆشان
مایەی بەهرە مەندی زەوین
وەك دوو-ڕیزە-چرای
بەرانبەر-یەکی خیابانیك
....

# یەك بین

سروودێکی جیهانی کرێکاری

بڕوانە
تۆفانی شۆڕش هەستاوە
هێرشی ڕەشی دیوەزمەش لەولاوە
هەڵکەین ئاڵای
هەڵمەت-بەری و ڕاپەڕین
باکمان لە مەرگیش نیە، لەم پێناوە!

هاواری هەڵمەت؛
پەلاماری غیرەت؛
با کوێری کەینەوە سەر چاوەی مەینەت؛
هەمو شەڕ و
کوێرەوەری و
ستەمگەری
بڕوا و
نەیێتەوە
تا ئەبدییەت!
کارگەرین رابەر
پیشرەوی جەماوەر
یەك بین، یەك بین؛
ئێمەین،
رزگاری بەشەر!

هەستین گشت
زنجیری دیلی بچرپێنین
ئازادی و بەرابەری بۆ جیهان بینین!

لیرەوە بانگ دەکەین
هەتا «شیکاگۆ»،
دەنگ دەینە دەنگی یەك
کارگەران بەکۆ
با هیچ دیوارێك-بەر
بەم
دەنگە نەگرێ
نەتەوە، رەنگ، ڕەگەز،
جیام ناکا لە تۆ
***

هاواری هەڵمەت؛
پەلاماری غیرەت؛
با کوێری کەینەوە سەر چاوەی مەینەت؛
هەمو شەڕ و
کوێرەوەری و
ستەمگەری
بروا و
نەیێتەوە
تا ئەبدییەت!
کارگەرین رابەر

پیشڕەوی جەماوەر
یەك بین،  یەك بین؛
ئێمەین،
ڕزگاری بەشەر!
هەستین گشت
زنجیری دیلی بچڕێنین
ئازادی و بەرابەری بۆ جیهان بینین!

***

بۆ دنیایەك بێ-برسی و
بێ-مەترسی
ڕابین ئەی كۆمەڵانی چەوساوە
هەستین،
تێكڕا،
خوێنمژ تەفرو توونا كەین
باكمان لە مەرگیش نییە لەم پیناوە
كارگەرین ڕابەر
پیشڕەوی جەماوەر
یەك بین؛ یەك بین؛
ئێمەین
ڕزگاری بەشەر
هەستین گشت زنجیری
دیلی بچڕێنین
ئازادی و بەرابەری بۆ جیهان بێنین
كۆشكی ستەمگەری و
حوكمی سەرمایە

تێك دەین؛
بیڕووخێنین
لە ریشەی بێنین؛
«بەسیە چەسانەوە!»
دەنگ دەین لەم دنیایە
هێزمان لە یەككگرتن دایە؛
یەككگرین!
كۆشكی ستەمگەری و

حوكمی سەرمایە
تێك دەین؛
بیڕووخێنین
لە ریشەی بێنین؛
«بەسیە چەسانەوە!»
دەنگ دەین لەم دنیایە
هێزمان لە یەككگرتن دایە؛
یەككگرین!
كارگەرین رابەر
پێشڕەوی جەماوەر
یەك بین؛ یەك بین؛
ئیمەین
رزگاری بەشەر
هەستین
گشت زنجیری دیلی بچرێنین
ئازادی و بەرابەری
بۆ جیهان بینین!

# دیالۆگ

بۆ پەیکەرەی بێنازی لێنین!

وتم:
ئەی هاوار؛
یەکجاری
خەریکن چاوم دەردێنن؛
کۆوەبووی دەور ئاڵای ستەم
خەریکن چاوم دەردێنن!!
ئالام دەکێشنە نیو خۆل
پەیکەرەی لینین ئەشکینن!!

شانیکی هەڵتەکاند، وتی:
لێیان ببوورە؛ نافامن!
ئەوە نیە،
بە چۆکەوە
دەچنە بارەگای «ئینجیل» و
«بوودا» و
«قورئان»!؟
لێیان ببوورە؛...
نافامن!

وتم:
ئاخر

خۆیان لە خۆیان نابوورن
خورافەی خوا
خورافەی خاك...
...
زكی یەكترین هەڵئەدرن ...

وتی:
با ئەوە دەردیان بی!
خۆیان ویستیان!
كەوتوونە شوین ئینجیل و مەسیح ی شوان؛
دەڵێن عالەم گشت ئاژەڵن!
شوانیان دەوێ!!
چی یانە لە رێبەری دلسۆز و لێزان؟!
«یەڵتسین» ی مل-پانیان دەوێ!
دایم سەر خوش
داهاتی هەزاران رۆبلی
چ دەر بەستە
عالەم هەیبی،
یاخۆ نەیبێ نانی شەوی؟؟ ...
دیسان دەڵێ : لێ یان گەڕێ
خۆیان ویستیان
ئەڵێم: ئەمانە لەترسی
ئاو،
پەنا بەر
ئاگر دەبەن!!...

من سەرسامم
ئەی ئاخۆ، هاو-خەمان، لە کوین؟؟
من لەدووی هاو-خەمان،
هاو-خەباتان چاو دەگێڕم...
بانگەواز کەین
کە خۆمان خواوەندی زەوین
ئێمەی بێ-نیشتمان و دین
لە کوێین؟؟ بۆ نایەنە مەیدان؟؟
چەقی نێوە-راستی مەیدان؟
با خۆمان کەینە خاوەنی ئاڵای خۆمان؛
با وەك لێنن
مەیدان، بە ستەم چۆل کەین و
بانگ هەڵێنین:
نە ئاو؛ نە ئاگر!
هەر خۆمان پشت و پەناین!

**سەرەتای 1992**

## وەرە هاوڕێ!

ئینسانی ئەم زەمانەیە گورانی دەڵێ
هەر دەڵێ و نایڵێتەوە
دەڵێ:

بەڵام دا
لەو کۆسپەی کەوتوەتە
نێوان من و هیوام
کە ڕێ دەگرێ لە دەستم، هەستم
کە جیهانم بە گوڵی شادی
بە میوەی بەرهەم
بۆ بڕازێنێ
سەرم لە ئاستی خولقاوی خۆم پێ دەنەوێنێ
لۆکەم لە گوێ دەتەپێنێ
تەمی تاریك بە بەر چاوم دا دێنێ
عەشقم؛ هیوام لێ دەستێنێ
دەمخاتە تەندووری ڕەنجەوە ...
دەمتاسێنێ

...دەلی:
وەرە هاوڕێ،
وەرە
وەرە، چون تۆم هەبی،

ئاڕاستەیە هێزو،
وزە سێڵاوە،
نەپارێزە،
کۆسپ ئەشکێنێ...
وەرە نێو دەستانم
کلیلی خۆشبار بە
با بیکەمەوە قوفڵی هەموو گیانم
وەرە نێو دەستانم
وەرو نێو ئێسك و پرووسك و گیانم
وەرە چاوم با ببیە بریسکەی هیوا، وەرە ئاڵا نە
وەرە، تۆ ئەوینی تو عەشقی دڵ و لەش بزوێن وەرە گیانە لە دڵابە
وەرە ، با ببیە هێزی زرانی ببیە گریکی گرسانی توانی هە مووگیانم
وەرە، بۆ ڕاماوی؟!
وەرە تۆش سیس مەبە،
بشکۆفەرەوە؛
باوەشی گەرم و گەشم
بژیەنەرەوە؛ گوڵی والابە!
وەرە دەریام، دەریام من؛
وەرە، تۆش قیبلەنمای دەریا بە
وەرە،
با ئەم ژانە لەسەر،
ئەم لۆکە لە گوێ

ئەم تەمە تارە لە چاوم

ئەم زرێ لە دەست و هەست،

چێ بە حەوادا

وەرە با بێ، ئاخرین فەتح و زەفەر بێ

دەستەکانم بهاڵێنم بە شان و باڵای مرادا

با سووکی و بێ-قەدری نوغرۆ کەم و رایمالم

بە چاڵی فەنادا

با گەو رەتر لە هەموو

پاڵەوانانی هەموو دەورانان

هەتاو و شادی بچێنم

بە هەموو دنیادا

**1989**

# ئاسنگەران

منداڵێکە
سەری کردوەتە سەر ڕانی
هەوریکی چڕ
بە هەزار زار
قوم-قوم بەفری لێ ئەمژێ...
...
کچیکە شۆخ
لا-رووومەت سوور
لە نێو حەریری گزنگی بەربەیانا
خەوی ناز بردوویەتەوە؛
...
بەش-مەینەتێکی ڕووگرژە
قاڵی ژینی لە-میژە-تاڵ
شانی ڕەوەزی
داوەتە
بەر تیشکی ئاورینگاوی
خۆری رۆژی چلەی هاوین؛
...
ئینسانێکە
یەخسیرکراو
بە کۆت و بەندی سەد هەزار-هەزار ساڵەی
بەرد و تەلان

لە کەللەی بەردینیدا، تەم
پەژارەی چارانی کارە؛

...

کە مانگ
بەلەمیکی سپی
خنجیلانەی
سەر دەریای یەشمی ئاسمانە
زەویش سپی پۆشی بەفرە
وەك مرواری
لە بن قولایی یەشمینی ئەو دەریاوە
بریسکە-بریسك
بە ئومیدی رۆژ بوونەوە
مانگ و ئەستێرە دەدوێنێ؛

کە تاریکی
ئەنگوستە-چاوە و شنەی با و
نەرمە-باران
بە گوێی گوڵ و گیای داوێنا ئەچرپێنن:
«بەهار، بەهار»،
گوڵ
دەکەونە سەما و ئاواز و گۆرانی:
بەیان، بەیان!

...

ژنی هەورە و
دایکی ڕەوەز و گوڵاڵەو

باوکی کانی و سیلاوی خوڕی بەهاران

...

هەڵۆیەکە

باڵی ئامادەی فڕینەو

هەڵنیشتوە

بەم شەوگارە

بەم ڕۆژگارە

سەری دەسوێ

لە سینگی بەرینی ئاسمان!

...

بەهاری جوان

زستانی جوان

پاییزی جوان و هاوینی

«ئاسنگەران»

**زستانی 1364**

**1986**

# ئەم ڕێبوارە

قارەمانی ئەم داستانە
ڕێبوارێکە
پاژنەی کەوشی هەڵکێشاوە
هەر کوێ ئەچێ
گوڵزارێك کە ئاوەدانی و
شادمانی...
بە جێ دێڵێ

هە تا چاو بڕ ئەکا، جادە ...
ڕووباری ژین
جار-جارە پۆنگ ئەخواتەوە و
شار
ورشەدار
بە هەزار ڕیزی چلچرا ...
چما ئاسمان
کۆشی لە سەر تەکاندبێ؛
گشت ئەستێرەکانی یەکسەر
لەو شوێنە هەڵ-ڕژاندبێ...

پڕ-بە-خیابان
سەمفۆنیای زرق و بریقی دووکانەکان
ئەم-سەر-تا-ئەو-سەر ڕازاوە
کۆشك و تەلار و مالی جوان
خشتێك لە زێڕ...
خشتیك لە زیو

پڕ-بەپڕی تەلارەکان
قالّی نەرمین و ورشەدار
بە نەخشی ماسی-دەرهەم *و
جقە-بوتتە *و
کلاو-فەرەنگ*
لە داستانی خۆیان ئەدوین...
کەڵکیت بە نێو قالّی تەونا
شەو و رۆژ
سەروخواری ئەکرد
بە ئاهەنگی چەکوش-وەشین
بە شوێن چنگی ئاسنی دا
تورونج-تورونج*
گیانی بە بەر تەوندا دەکرد

قارەمانی ئەم داستانە
رێبوارێکە
دەستی پیرۆزی بۆ هەر چی دەبا
خۆڵ بێ، دار و بەرد و هەوا بێ
گۆمی چۆم،
یا خود سینەی دەریا
خێرا
ژیان؛
خێرا بەهرەمەندی
پڕ بە بالا
بە بەر هەموویاندا دەکا
ئەم ریبوارە دەست و پێ مەتفەرکە،
بەڵام
ئیوارانە
لە زنجیکی تاریکا رۆژ دەکاتەوە
رۆژ هەتاوەکو ئیوارەش
کامیۆن-کامیۆن
خشتی وەك زێڕ
خشتی وەك زیو
بۆ کۆشك و تەلار بار دەکا

ئەو، هەتاوەکو بەیانیش
بە چنگی ئاسنی کەڵکیت

تۆزی تەون
تێکەڵاو هەناسەی دەکا
بۆ ژیرپێیشی
بەرێکی زبریش شك نابا
چما ئەو دەستە پیرۆزەی
لە کەلەپچێکی جادوودا
چما دیوارێکی نەدیو
لە نیوی خۆی و
کردەی دەستی پیرۆزی دا
***
ئیستا ئەویش
بڕیاری داوە کە جادووی
کەلەپچەی دەستی هەڵبڕێ!
بڕیاری داوە کە هێرش
بۆ دیواری لەمپەر بەرێ!
***
ئەگەر فەرهاد
بە تەشوێی عەشقی شیرینی
بەگژ کێوی «بیستوون»دا چوو
هەتا
دیوان-دەر
کونی کا،
تا ئاوی لەودیو-قەتیس-ماو،
بە لێوی تینووی خەڵکی شار
بگەیەنێ؛
ئەگەر هەتاو

بە ودمی گزنگی گەرمی
سەهۆڵی شاخ ئەکا بە شەتاوی بەهار
قوڕی دەشت ئەکا بە گوڵزار؛
...
ئەم ڕێبوارە
بڕیاری داوە بە تەشویێ دەست و هەستی
بیستوونی سەر-ڕێی هەلکەنێ
شاخ-بەشاخی ورد و خاش کا
زبڵی نەریتی کۆن ڕادا ...
بڕیاری داوە
وەك هەتاو
سەهۆلی شاخ بکا بە ئاو
تا دەستی بە گوڵزار ئەگا
بڕیاری داوە
تەنانەت، گەر حەوت کاڵەی ئاسنیشی
هەڵکێشاوە،
تا کۆسپ و دیوار تیك نەدا

هەتا دەستی
دەست-لەملانی
کردەی دەستەکانی نەکا،
هەدا نەدا!

**ڕێبەندانی 1367**

# بێنە پێش چاو

داڕشتنێکی تر لە وەرگێڕانی «ئیماجین» لەسەر میلۆدییەکەی
«جان لینۆن» لەسەر داخوازی هاوڕێ «ڕەزا یوسف
بەیگی» کە خۆی و بەڕێز «ئەیلەم ئەکتاش»، لەسەر ئەو
میلۆدییە، ئاوازەکەیان دیسان خوێندەوە

بێنە پێش چاو بەهەشت نەبێ...
زۆر ئاسانە، گەر بتەوێ؛
نە جەهەنەمێك لەو ژێرەوە
سەر-سەریشمان، هەر ئاسمان...
وای دابنێ کە هەمووممان،
بژین بۆ ئەمرۆهۆۆهۆۆ
بێنە پێش چاو وڵات نەبێ؛
کارێکی وا گران نیە...
بیانوو بۆ کوشتار نەبێ..
نە ئائینیش بەهانە بێ!...
بێنە پێش چاو کە هەمووممان
بژین، ژینی ئاشتی یی ییی ی ...
ڕەنگە بڵێی خەیاڵاتیم
بەڵام من خۆ بە-تەنیا نیم ...
بە هیوام تۆش ڕۆژێ بێی...

ئەمجار گشت جیهان یەك بین...

بێنە پێش چاو مۆڵك نەبێ

نازانم بتوانی یان نا ؟؟

نە تەماع بێ نە برسیەتی...

خوشك و برایەتی گشت ئینسان...

بێنە پیش چاو كە هەمووومان

شەریك بین لە ... جیهاان ...

ڕەنگە بڵێی خەیاڵاتیم

بەڵام من خۆ بە-تەنیا نیم

بە هیوام تۆش رۆژێك بێی ...

ئەمجار گشت جیهان یەك بین ...

# عەقڵی مەیموونی

کە ئینسان
کورنووشی لە دەستکردی خۆی کرد،
دانووشتا و
گەڕاوە سەر حاڵی مەیموونی و
کۆیلەتی قبووڵ کرد!
کە ئینسان
خوداکانی خۆلقان
کورنووشیان بۆ بەرێ،
زنجیری کۆیلەتی کەوتە پێ؛
کەوتە دەست؛
کەوتە مل؛
....
ئیتر هەر ئینسانە و
هەستانە و
هەر زنجیر-پسانە و
هەم دیسان هۆنینی زنجیر و
خولقانی خواکانە و
هەم دیسان
کۆیلەتی و
دا

نووو
شتا
ن
نازانم
کە تۆ خۆت
خالقی زەینی خۆت
خۆشی خۆت
ئازادی و بەندی خۆت
بی
ئیتر
پێویستیت چی ئەبێ بەو کۆتە؟؟
بەو بەندە؟؟
بەو خوایەی سەرمایە
کە خوایە و بەهەشتە، بۆ ئەوان
بۆ ئێمەش جەهەننەم؟!

...

دەی، ئەو خوا بت کا بەقوربانی عەقڵە مەیموونییەکەت!
لێی گەڕێ! گشت ڕۆژێ،
لە خوێن و ئارەقت،
بژیوی پێ مەدە!
با بمرێ!
تێك-ڕووخێ
ئەو خوایە!

سەرتاپای نەگبەتی
هەرەس کا و
داڕووخێ!
با بەس بێ
مەیموونی و
دا
نو
و
ش
تان!

# بەهار

بەهار
مندالێکی ساوا
چاوی گەشی
بە ڕووی خۆر و ئاسمانا
ئەکاتەوە...
پێ ئەکەنێ
ئەتریقیتەوە، شاد و گەش
گەورە ئەبێ
هەڵ ئەدا و جوانی ئەخەملێ
جوانترین لیباس ئەپۆشێ
لە شەتاوی سارد و زوڵاڵ، ئاو ئەنۆشێ
گەشی ڕوومەتی
نیشانەی تێروتەسەلی و خۆشییە...
ئەی منداڵەکانی ئێمە
بۆچی وانین؟!

**بەهاری 1990**

## مۆنۆلۆگ لە گەڵ بەهار

بەهارەکەم،
پڕ بە کۆشی هەورەکانت
پڕ گوڵدان و باخچە و حەسار
پڕ دەشت و دەر
گوڵت بۆ هێنام، زۆر سپاس!
ڕاوەستە تاوێك با منیش
چەپکێك لە حەقیقەت بچنم
پێشکەشت کەم:
-هەوای عەتراویت ناگاتە دەماخی من...
ئاخر لێرە دەیفرۆشن!!
ئاو و هەوای خۆش بڕ دەدەن
لە منی دوور دەخەنەوە
لەت-لەت، بەش-بەش، پێم دەفرۆشن!
لەجیاتی ئەوە دووکەڵی خیابانم دەرخوارد ئەدەن
بۆ هەناسەم!!
هەوای هەناسەم دەفرۆشن!!
ئاوی بارانت دەفرۆشن؛
ئاوی سوێر و گەرم دەکەنە تانکرەکان
ئەویشم هەر پێ دەفرۆشن!!
هەتاوە گەشەکەت دەبەن
ئەویش بەقەد پەنجەرەکان لەت-لەت دەکەن،

جا، لەت-لەت، بە منی دەفرۆشن!!
سەرتاپای تۆ،
سەرتاپای بەهاری ژیان
هەمووی براوە بە-تالان
قۆرق کراوە وەك پاوان
سەرتاپات بە من دەفرۆشن!!
لە بری گشتی
ژیانم، هەستیم لێ دەکڕن!
....    ...

بۆ وڕ و کاس تەماشام ئەکەی؟!
تێناگەی؟؟
....    ...؟؟
ئەی هاوار، لە بیرم نەبوو؛
خۆ تۆ ئاگای «کڕین و فرۆشتن» هەر نازانی...
تۆ هەر مەعنای بەخشین و بەخشران ئەزانی...
هەر مەعنای بەخشینی باران، تیشکی هەتاو،
عەتری نەسیم...
بەخشینی بێ-بڕانەوە...
بەخشینی بێ فەرق
بێ جیاوازی
جوانی بێ ئەوپەڕ ئەزانی...
مەعنای بەخشینی بێ درێغ و بێ ئەوپەڕ نەبێ،
تۆ نایزانی...
ببوورە پەرۆشم کردی!

هاکا منیش

وەك سێڵاوەکەت بخرۆشێم

بدەم لە ڕیشەی فرۆشتن

لە ڕیشەی تاڵان و پاوان...

با هەر بەخشین

بەخشینی بێ دریغ، بێ فەرق...

لەم جیهانەدا بخەملێ و

باڵا بکا!

**بەهاری 1990**

# هەرگیزیش دەبێتە ئەمڕۆ!

لە شیعرەکانی برتۆلد برشت؛

ئەوەتا، زوڵم و زۆر
بە هەنگاوی قایم
ڕوو بە ڕووت!
خەریکە
خۆی بۆ دەهەزار ساڵ تەیار کا!
پێت دەڵێ: وابووە و واش دەبێ تا هەتا...
ئەوەتا، هەر دەنگی ئەوانەو دلێرە!
لە بازاڕ
ئیستیسمار
دەنگ-دلێر نەڕڕاندی:
«من تازە خەریکم دەست-پێکەم!»
بەڵام لە مرۆڤی چەوساوە،
گەلێ کەس دەناڵێن:
«ئەوەی وا داخوازی ئێمەیە، هەرگیز، سەر-ناگرێ»
...
ئەگەر زیندووی مەڵێ «هەرگیز»!
هیچ یەقینێك یەقین نیە!
ئاوا نامێنێ، هەتا سەر!
پاش ستەمگەر، ستەمدیدە دەنگ هەڵدێنێ!
لە کێ وە چەوساندنەوە دەوام ئەکا؟؟
لە ئێمەوە!

لە کێ وە چەوساندنەوە نابوود ئەبێ؟؟
ئەویش دیسان، لە ئێمەوە!
ئەگەر لە پێ کەوتووی، هەستە!
ئەگەر شکست خواردووی، دیسان،
هەستە بۆ شەڕ،
چاکی هیممەت بەلادا کە!
ئەوەی جێگای خۆی ناسیبێ
چلۆن پێشی پێ دەگیرێ؟!
ئاخر،
شکاوانی ئەمڕۆ
سەرکەوتووانی سبەینێن؛
«هەرگیز»یش دەبێتە ئەمڕۆ!

**1991**

## بەهاری بژوێن

ئاسمانی شەو-یەشمین، بە ڕۆژ گەش و شین
پێیە هەوری پاراو
هەوری ئاوریشمین
هەوری پاراو، لە ئاسۆوە سەر-هەڵداو
بەرەو یەکتر ئەکشێن و هەنگاو هەنگاو،
لێک کۆ ئەبن
دەست لە ملی-یەك-ئالێن،
بەرەو تاقی بەرزی ئاسمان، دێن و دێن.
هەوری سپی و ڕەنگ پەمەیی و هەوری ڕەش
بە سەماوە، یەکتر ئەگرنە باوەش...
وردە-وردە،
یەك-چین، یەکپارچە و یەکڕەنگ
ناخی ئەرز و ئاسمان پڕ ئەکەن لە دەنگ
شریخژنی هەور و شیریترووسکە
ئەبارێنێ
تەرزە، باران...
برووسکە...
هەر دەرەیەك و هەر دۆڵێك، لافاوێك؛
هەر خەوش و خاڵێك کەوتۆتە سەر ئاوێك؛
هەر لافاوە و بەرەو لافاوێکی تر
لووزەو-بەستە و دەست-لەملانی یەکتر.
هەر لافاوە و بەرەو دەریا مل ئەنێ؛
هەر کانییە و قوڵپە-قوڵپ، پێ ئەکەنێ

زەوی وەکوو کچێکی حەمام-کردوو
نەرگسی چاوی ئەترووکێنێ، زوو-زوو؛
گزنگی خۆر
لە درزی هەور
وەك شانە
دەستی بە زەوق دابێتی لەو زولفانە...
چرۆ، گەڵا، بۆنی خۆش، ئاسمانی شین؛
گوڵ، ئاڵای سوور...
بەهاری بژوێنی ژین...

**1987**

# له ئاوێنه خوێناوی یه‌که‌ی

بۆ یه‌کی ئه‌یاری 1991 پاش داڕووخانی
سۆڤیه‌ت و باسی نه‌زمی نوێی خوێناوی!

که چه‌نگیز
هه‌موو گۆی زه‌وی کردوه‌ته یه‌ك وڵات،
یه‌ك جه‌هه‌ننه‌م،
بۆ چه‌قۆی، بۆ قه‌داره‌ی؛
من ئه‌مرۆ
له ئاوینه‌که‌ی چاوی سووری ئه‌وا
قه‌واره‌ی به‌سامی توانا و
هێزی خۆمم به‌دی کردوه؛
که ئه‌و
گۆی زه‌وی کردوه‌ته که‌مپی کار
تاکو شیره‌ی له‌شم،
گیانم و هه‌ست و هۆشم
به نه‌زمێکی «نوێ»
له نێو تاڵ-به-تاڵی ڕه‌گ و ئێسك و پێستم
ده‌ربکێشێ،

که ئه‌و
گۆی زه‌وی کرد وه‌ته
یه‌ك حه‌بس-خانه‌ی عموومی،
له بۆ گیانی نه‌سره‌وت و زنجیر-پسێنم

کە دێ تا بە سەد قوفڵ:
بە قوفڵی سنوور و نەژاد و
چەقۆی قینی مەزهەب،
ڕەگەز، میللەت و...
سەد قوفڵی تر
کۆ بە کۆ
تاك بە تاك
ئێمە لێك دابڕێ،

لێی دەپرسم:
ئەگەر ڕاست دەکا و
خۆی تەیار کردوە
بۆ هەزار ساڵ،
بۆچی هێند لیم دەترسێ؟؟
پێی دەڵێم:
بێ و تەماشای شکۆم کە!
کە دەستم لە سەر شانی فەلەك خستوە
تەماشای شکۆم کە
کە ئەمڕۆ وەکوو ساڵی ساڵان
بەڕێژە بەڕێوەم!
هەمو گۆی زەویش هی منە
پیی دەلیم:
دا تەماشای شکۆم کە
تا لە ئاوینە خوێناوی یەکەی
چاڵی چاوتا
منیش مەرگی تۆ و
ژینی ئینسان ببینم

**1991**

## نەك شار-بەدەر؛
## دنیا-بەدەر!

من کەمتەرخەمانە وتم:
شاعیرێك شار-بەدەر کرا
چونکە فەرمووبووی:
لە باغ دا، ئیللا و بیللا،
هەر تەنیا گوڵی سوور جوانە!
تفی کرد کرد لە باقی گوڵان!
ئەم سەر-تاشراوانەش دەڵێن:
لە بێستانی ئینسان، تەنیا، هەر کوولەکە؛
کوولەکە و بەس!
تف لە چارەی باقیتریان!

وتم: گیرام،
کارنامەی دزێوی نازیسم مان لەبیرچووبێ؛
یان کوێر بووبین، نەماندیبێ
چلۆن سەرمایەی جیهانی
بای کردە هەنگڵی «هیتلەر»
یان کەڕ بووبین، نەمانبیستبێ
چلۆن راسیست،
لە «واشینگتۆن»ەوە تا «بەرلین» و تا «ستۆکۆڵم»
بە زوڕنای پۆلیسی ئەمن هەڵدەپەڕن...
گیرام هەر کوێر و کەڕ بووین و
ئەمانەمان نەدی و نەبیست!
هەر بەتەنیا بەو تاوانەی

ئاوەها، یەکەناس، دەڵێن:
«لە بێستانی ئینسان، تەنیا،
هەر کوولەکە؛ کوولەکە و بەس؛
تف لە چارەی باقی-تریان»؛
پەیمانم داوە
راسیستیش شار-بەدەر کەم!

...

وتی: لە کوێی وا نابینی چرکەی چەقۆ و
نابیستی بۆنی باروووت و
بۆنی خوێن نابیەی لە خیابان؟؟
شار-بەدەر چییە؟؟
هەر یەکسەر
مەگەر دنیا-بەدەریان کەین!

**1992**

## دەستەکانت

تەپ و تۆز...
رمبازێن
ڕەش-سوار، ڕەش-سوار...
قرە، قاقا، لرخە
قاقای جەردە و جینایەتکار
ئەروا
هەریم تا هەریمی جیهان
شایلۆغان...
رەش سواری مەرگ دین بۆ تالان
چیم هەیە من؟؟
دەستەکانت
سیحری ژیان
چیم هەیە من؟؟
دەستەکانت
لە نیو مشتەکانی دا چارەی رزگاری خۆم بەدی کرد
چیم هەیە من؟؟
دەستەکانت
ئەی تۆ بۆ من
سەرتاپات بەهەشتی ژیان!
سەراسەری بەهەشتی تۆم هەیە؛ چۆن چیم هەیە؟؟

چیم هەیە من؟
زنجیرەکان، بۆ فڕێ دان
بۆ خستنە ملی ئەوان!!
بۆ تاڵان دێن
بۆ تاڵانی دەستەکان دێن
کە دەست گیرا، ئالا بە چی ڕاشەکێنین؟
کە دەست گیرا، بە چی
ئاسۆ نیشانی یەکتری بدەین؟
بۆ تاڵان دێن
باکت نەبێ
بەهەشتی دەستەکانی تۆ هەرگیز بە تاڵان نابرێ!
بۆ تاڵان دێن
باکت نەبێ
مادام کە من، دەستە مشت-کردووەکانی تۆم هەیە
ئاراستەی نیوچاوی ڕەشیان!!

تەپ وتۆز،
ڕمبازێن
دین بۆ تاڵان؛
باکت نەبێ!
کە من دەستم، دەستت،
مەحکەم ئاڵای خوێنرەنگ بەرز ڕاگرێ
گەردی زەردی تەپ و تۆزی سمکۆڵانیان!
قەت نایگرێ

بۆ تاڵان دێن
تاڵان؟ تاڵان؟ دوای رووت کران؟؟
چیم هەیە من؟
هەموو دارایی یەکەی ئەوان!
هەرچی ئەوان
تا ئێستا هەر بردیان بردیان
تەپ و تۆز
ڕمبازێن
ڕەش سوار، ڕەش سوار
قاقای جەردەو جینایەتکار،
ئەروا
هەرێم تا هەرێمی جیهان
شایی لۆغان
...دین، دین، تاڵان
ڕەش سوار، ڕەش سوار
باکت نەبێ
!هەموو ئەسپەکانیان لێ بێ سوار دەخەین
سەراسەری ئەم عەرزەمان
لێ کردوون بە کونە مشك
بۆ ئەسپ گلان
بۆ سوار گلان!
سواران لە سەر زین زیادین
ئیتر ئەمجار پیادە سوار!

چیم هەیە من؟؟
ئەسپەکانیان
هەردوو پێی چالاکی تۆم هەیە بۆ ئەسپەکانیان
دادەی وزاق
بۆ یەکەم جار
لە مێژووی ملیۆن ساڵەمان
دادەی سوار بە
لینگ دە بە تاو ئەسپی ژیان!

**ڕیبەندانی 1368 ـ 1990**

# کچی بەهار

دایکی سپی پۆشی زستان
کچێکی قژ-سەوزی بووە
قژ-سەوز و پشوو-عەتراوی
بە ئاهەنگی دڵ-بزوێنی
دەهۆڵی هەوری بەگرمە
سەرچۆپی سەمای گرتووە

گوڵاو-بارانی بە خوڕڕەم
چەپك-چەپك
قژی سەوزی کچی بەهاری شۆردووە
شانەی گزنگی لێ داوە

پەلکە-زێڕینەی ڕەنگینی
هەر وەکوو تێل، تێگرتووە
...
قاقای سپی
کانیاوە کەف-پژێنەکان
ئەڵێی شەپۆلی دەریایان
ڕیز بە ڕیز، شوێن یەك خستووە
ئەڵێی شیعری جەنگاوەری سروودێکی شۆڕشگێڕیان
هەڵبەستووە
بشێوەی خاکەلیوەیە
خاك شێواوە
سەهۆل-بەندان و بەستەڵەك
هەڵتەکاوە...
بەرگەی شنەی با ناگرێ

سەمای سیحراوی و گۆرانی کیژی بەهار
ئاهەنگی تازە بوونەوە و ژیانی نوێ...
ئەچریکێنێ
سەوزەڵانی بەر پەنجەرە و
چەپکە نەرگسی ناو گوڵدان
بۆنی بەهار...
ماڵ بە ماڵ، ژوور بە ژوور دێنێ

کۆڵان و خیابان و سەربان ...
خۆیان داوەتە بەر ڕێژنەی
بارانی بێ-بڕانەوە؛
شار، بە پیر بەهارەوە دێ
ئاسمان
بە تاقی نوسرەتی هەوری بە گاڵەو ڕەنگاوڕەنگ
.. گەش ئەدرەوشێ
**

ئەی کچە قژ-تۆزاوییەکەی مەیدانی کار!
لێزمە-بارانی بژوێن
تەپ و تۆزی ئاسمان و ئەرز دائەشۆرێ
تۆش وەکو من بچۆ بەری
با قژە تۆزاوییەکانت بشواتەوە...
نەرم و خاوێن
زولفت بەرەڵای بەر با کە

بیکە بە ئاڵای شێوانی
ژیانی بەستەڵەک-بەستوو
خونچەی دڵت با بشکوفێ
وەرە
دەست لە ناو دەستم نێ
بۆ هەڵپەڕکێ..
لە هەوای ژیانێکی نوێ.
ژیانێک کە بەهار تێیدا
مانای ڕەنج و
ماندوویەتی زیاتر نەبێ

ژیانێک کە شادی تێیدا
وەک گوڵی کەم-عومری بەهار
تێپەڕ نەبێ
دەستت با بێ
با دەستەکانی من و تۆ
گوڵی سوور و سەوزەڵانی
وا لێک گرێ دەن، هیچ بایەک!
گوڵاڵەکان نەپرووکێنێ
با بەهارێک بە خێر بێنین
خونچەی قونجاوی دەروونی پڕ ئاواتمان
بشکۆفێنێ!

**1995**

# هێز لە یەکێتی دایە

لە شیعرەکانی «جەو هیل»

دەتەوێ ئایا رزگار بی
لە کۆیلەتی کرێ-گرتە؟؟
دەی وەرە
وەرە ناو کۆڕی
«یەکێتی گەورەی سەنعەتی»١
دەتەوی ئایا رزگار بی
لە نەداری و لە برسیەتی
دەی وەرە، بەشی خۆت بیکە؛
دەستت با بێ!

هێز لێرەیە؛
هێز، لە پێکەوەبوونی کرێکاردایە!
کەوا ڕاوەستاون پتەو،
دەست لە ناو دەست!
دەسەلات ئەمەیە!
هێزێکی ئاوا دەبێ گشت
دەسەلاتی لەدەستدا بێ،
لە هەر شوێنێ!
...

دەتەوی ئایا لە ئاسمان
کۆشکی زێڕینت بی و لێرە،

لە کۆڵیت بژیت، مەینەتبار؟؟
دەتەوی ئایا لە بەهەشت بە باڵ بفڕی
بەڵام لێرە، شەنگە-شڕەت بە کۆڵتەوە؟؟

ئەگەر لە باسی «بەرخی قوربانی»
ماندووبووی،
دەی وەرە پەیوەس ببە بە
کۆڕەوی «گەورەی سەنعەتی»

...

ئەگەر بۆ تام و چێژ گۆڕین
گۆشتی ڕان و هێلکەت دەوێ
دەی وەرە، بەشی خۆت بیکە!
دەستت با بێ!
ئەگەر دەتەوێ قولجماخ
لە تەپڵی سەرت ڕاکێشی
ڕێکخراو مەبە؛
سەندیکاش
پووشێك ناژێ!
ئەگەر پیش مردنت هیچت ناوێ
لە گەل کارفەرما
تەوقە بکەو عاقل بە!...
وەرن! هەموو ئێوەی کارگەر؛
خەڵکی هەر وڵاتێك کە هەن؛
وەرن پەیوەس بن بە زومرەی

«یەکێتی گەورەی سەنعەتی»!

ئەمجار

با بەشی خۆمان لەم

کورەی ئەرزە

داوابکەین؛

وەرن!

وەرن،

بەش بە حاڵی خۆمان،

بیکەین؛

دەستان با بێ!

**1912**

# کچی شۆڕشگێڕ

شیعر و ئاوازی «جەو هیل»

هەر وەکو هەموان دەزانین؛
لەم دنیا پڕ لە مەینەت و نەگبەتەدا
ژنانی جۆراوجۆر پەیدا دەبن!
هەندێك لە کۆشك و عەمارەتی جوان-جوان دەژین
جوانترین لیباس ئەپۆشن
شاژنن و شازادەن و
نەجیب زادەن
کە جوانییان بە ئەڵماسە و بە مرواری
بەڵام خانمی جێگای ڕێز و تاقانە
هەمان کچی شۆڕشگێڕە؛
هەمان کچی یاخی،
کچی خەباتکارە
کە بۆ چینی کرێکار، خۆی،
مروارییەکی نایابە!
پیشتریش بوومانە ئێمە، کچی ئاوا...
بەڵام بۆ «یەکیەتی گەورەی کرێکاران...»
لە مانەش زیاتر پێویستە!

چون، عەزەمەتە جەنگین مان بۆ ئازادی
وێڕای کچانی شۆڕشگێڕ؛
بەڵێ،
ڕەنگە،
دەستەکانی بە کار کردن زبر بووبن؛
ڕەنگە جل و بەرگیشی زۆر-زۆر جوان نەبن؛
بەڵام دڵێك
لە سینەی دا لێدەدا کە
ڕاست و ڕوونە لەگەڵ هاو- چینی خۆی؛
هاو- نەوعی خۆی...
تاڵانکەران، سەرتاپایان دێتە لەرزین
کاتێك کە ئەو
تووڕە
وەجواب دێت و
هێرش دەکا!
ئاخر، تاقە خانمی جێگای ڕێز و تاقانە،
هەمان ئەوە؛
هەمان کچی شۆڕشگێڕە!

**1915**

## لەشفرۆش!

داستانی عیشقت دەریایەك
دەریایەکی شکۆدارە
بە عشقێك کە
هەر بە زەردە-خەندەیەك دەیتوانی
پەژارەی شەوانی سڕی پاییز
بکاتە ئاسۆی رووناکی
بەری بەیانی بەهاری!

*

ئەوانەی وا چنگ و پەلیان
لە کڕینی دەریا دەریا
خوین و عەرەقی ئێمەوە
هەڵژەندبوو
عیسمەتی عیشقی تۆیان
ئاڵۆزاند؛
پیش ئەوەی تۆ
تەنانەت فرسەت پەیداکەی
خۆت بناسی
نێوی فاحیشەیان لێ نای!
*

لە بازاڕی
بێ-ڕەحم و بێ-بەزەی تیجارەتدا
تۆیان فرۆشت!
جوانترین هەستی تۆ،
عیشقی تۆیان
وەك كۆترێكی
سپی بچكۆلانە كوشت و
ناسكترین و جوانترین هەستی تۆیان
بە دیانی ئاسنین
كر...
...ۆشت
...
ئاوا، تۆیان لە ئیحساس
بەتاڵ
كردەوە
پەژارەیەكی قووڵی ئینسانی
لە پشت پێكەنینەكانت دا
جێی خۆش كرد...
داستانی عیشقت
لە هەستی
بە سامی مردنی
ژینێكی پڕباردا
تو...و...ا...یە...وە
ناسكترین و جوانترین
هەستی تۆیان
بە دیانی ئاسنین
ك...ر...
ۆ...شت

ڕۆحی تۆیان
به سکەیەکی بێ قابل
کڕی و فرۆشت
تا هەڵپەی سوود
ماوەیەکی تریش لە سەر
تەختی سەروەری بمێنێ
هەرکاتێکیش پێویستیان بوو،
روخساری نگریسی خۆیان
لە ژێر سەرپۆشی «عیففەتی عوومومی»دا
بشارنەوە،
ناوی فاحیشەیان لێ نای!
بەڵام بەڕاستی «فاحیشە» ناوێکە وا
!                لە سەرتاپای ئەوان زیادە
چونکو فاحیشەکان هەرگیز
غرووری تێك-
ڕوو...
خاو...
یان...
تا
مەقامە پەستەکەی ئەوان
دا ...
نا ...
شکێ...
نن!

**2005**

## به شوێنەواری باب دیلانا؟

پاش تەقینەوەکانی لاهوور و بەغدا و بروکسیل
به شوێن ئاوازەکەی باب دیلانا بە ناوی:
...Blowin´in The Wind
How many roads must a man walk down
?Before you call him a man
Bob Dylan

بەسەر چەند گوڵی ژاکاودا
هەنگاو بنێم
تا بگەم بە «بەسیەئیتر»؟؟

لە چەند شار؟
چەند وڵات و چەند
پارچەی جیهان؟؟
بازدەم بەسەر
چەند هەزاران؟
پەیکەری شەڵاڵی خوێندا؟؟

چەن «دیلان»ی خنجیلانەم
لە سەر کەنار
بێ لایە-لایە جێ بێڵم؟؟
تا دەرباز-بوون لە شەوەزنگ؟؟
«لاهوور» و «بەڵخ» و «بامیان»

«بروکسیل»، «پاریس» و «لەندەن»
«ئەنکەرا»، «ئەستەمووڵ»، «عەدەن»،
«قەندیل»، «ئامێد» و «کوبانێ» و .....
چەند جار ئەبێ مار-گەستە بم
لە ماری پەروەردەی مزگەوت؟؟
چەند جار
لە بەر
چەند دەرگای زیندانی ئێران
هەڵ لەرزم تا بەری بەیان
چەند پەیکەری
بە پەت-تاساوی ئازیزان
هەموو ڕۆژێك
بە ساردی
بگرمە ئامێز؟؟
...

چەند مانگ
بێ مووچە،
بێ مەعاش
خۆم و مناڵ
زگ هەڵگووشین....؟؟؟
ئیتر گەیشتووەتە
گیانمان!!
ئەی کەی جادە و شەقامی شار
پڕ کەین لە هەزاران هاوار؟؟
گەرووی گەندەڵی گەندەڵی

کەی وا بوگشین
مافی خوراوی کۆن و نوێ
دەستەبەر بێتە بەر دەستان؟؟
...
باب دیلان،
رۆژێك لە رۆژان،
وتی: «وەڵام،
ئاژوانە لەگەل بای زەمان! ...»
بەڵام ئێمە
داوین
بۆ ئەو بای سەرگەردان؛
تۆرین؛

یەخسیر-کەری وەڵام
پەیکەرمان
ئاڵاوەتە
چی کۆت و زنجیر و شیر و تیر
شانمان
ترنجاوەتە ژێر
تاقی تەنگی ئاسمانیان
چاوەروانی
ئاژوانی با و
باب دیلان
نین
تاقی فەلەك هەڵدەتەكێنین و هەتاو
هەتاو ئەبێتە میوانمان!

**سەرەتای 2017**

# دژی سێداره و ئیعدام

بۆ ڕۆژی جیهانی دژ به سزای سێداره
10ی ئۆکتۆبەر!

دەکووژن؛
چەن بە خەمساردی؛!
تاکوو پێش بگرن بە کوشتن؟؟
گێل-گەمژەن ئایا
یاخود من دەگەوجێنن؟؟
دەنا بۆ دڵداران دەکوژن؟؟
دڵدارانی ژین-خوشەویست و ژیان-بەخش،
بۆ چی دەکوژن؟؟
پێش بە کامە تاوان دەگرن؟
خۆشەویستی «نا-یاسایی»،
«نا-شەرعی» ئایا تاوانە؟؟
دڵداران و ژیان-بەخشان
شیاوی بەردە-بارانن؟؟
***
دەکووژن
چەند بە خەمساردی!!
پێش بە تاوانکاران بگرن؟؟

تاوانی ئەو سەربازە چییە نایەوێ
خوشك و برای
ئەو بەری خەت، بەرەی بەرانبەری، بکوژێ؟؟
سزای، ئایا، تیر-بارانە؟؟
گەر دز و جەردە، شیاوی
سزای لە-سێدارە-دانە،
چ بکەین لە ئێوەی عالەم-دز
لە ئێوەی جەردەی ئاشکرای
ژێرسای یاسای چەوساندنەوە؟؟
سا، گوێکرن؛
دز و جەردە یاساییەکان!
بکوژانی دڵدارانی ژیان بەخش و
تیر-بارانکەری سەربازان!
بەتەمای گەوجاندن مەبن!
نە خۆ بدەن لە گەمژەیی؛
نە من بە گەمژە بزانن!
ئێوە، تەنیا حوکم-ڕانن!
بەڵێ؛ حوکم-ڕانن، ئێوە کە دەکووژن بۆ تۆقاندن!!
حوکم-ڕانیەکەتان،
ئێوە،
بەندە بە کوشتن؛ ترساندن!!
بە کوشتنی خەمساردانەی
بێ-بەزەی
پیلان-داڕێژراو:
لە سێدارە-دان، تیرباران، مل پەڕاندن!!

دەنا، تەمبێ؟؟
کێ تەمبێ دەکەن؟
بکوژان؟
بکوژانی ڕاستە-قینەتان نیشان دەم؟
نیشانتان دەم ئەوانەی وا بۆ کوشت وبڕ بار-هێنراون؟؟
دەستەمۆ کراون؛ ڕۆژ تا ئێوارە گوژ دەکرێن
بۆ کوشت وبڕ؟؟
نیشانتان دەم؟؟

هێزی چەکدارتان!
بەڵی هێزی چەکدار و سپاتان
سپای گەورە و گرانی پڕ-چەکتان!
پەنتاگۆنتان!
بێتاوان-کوژان
منداڵ-هەتیو-خەران؛
منداڵ-کوژان؛ پیر و زورهان-کوژان
جیرە-خۆرانی چنگ و پەل خوێناویتان!
ئامادەن سزایان بدەن؟!
ئامادەن، ئایا، جیرە-خۆری چنگ و پەل خوێناویتان، سزا بدەن؟!
دە بەسیە درۆ و دەلەسە!
ئیتر بەسە!
پێ بێن کە هیچ بکوژ و هیچ دز، هیچ تاوانکارێك،
بەو شەرت لە خزمەت تاڵانگەریتاندا بن
لە خزمەت حوکمڕانیتاندا، بکوژن؛
تەمبێ نابن!!

...

نەخێر؛ ئێوە؛
نە بکوژ و نە تاوانکار تەمبێ ناکەن!
بەڵێ ئێوە
دەکووژن تا حکوومەت کەن!
بۆ ترۆر، بۆ ترساندن و تاڵانکردن!
بۆ ترۆر و ترساندنمان
ڕۆڵەکانمان ئیعدام ئەکەن!!
شەرم و ڕووخان بۆ حوکمتان!
ڕیسوائی یەکجاری مێژوو،
بەشتان!!

**10ی ئۆکتۆبەری 2018**

# خیابان خرۆشاوه*

خیابان خرۆشاوه
هەستاوه زیندوو (2)

سەدان دەست و لەش
پەیکەره و ڕەمزی هەستان دژی کۆیلەتي...
خیابانه سەنگەر (2)

شریخەی تفەنگ و
سەری پڕ لە ئەندێش (2)
به دار و چەك و مشت؛ به دەیلەم

خیابانه سەنگەر (2)
خیابان چ سەخت و چ بەرینەدڵ بوو (2)
سەدان پشت چەماوه (4)

کە هاتن
به ماشین
به پۆتین
دەهاتن بەگژ سەنگەر و خەڵکی جەنگاوەردا...(2)

خیابان چ سەخت و چ بەردینەدڵ بوو (2)
سەدان پشت چەماوه (2)
***

چەنێك دەرد و ژان
چەندەها شان و پیل بوو
کە کوتران کە ئێشان
لە پاسگا و ئیدارەی شەرارەت
چەندەها لەش کە گەوزان لە خوێنا...
هەمیسان خیابان شەقامی هەژاري [2]

بەڵام وا دوبارە،
دژی کۆیلەتي و مەینەتاوا
خیابان دەبێتە پەڕاوپەڕ
شەپۆلی شەڕ و ئیعتراز و شوڕش ... [2]

خیابان خرۆشاوە...

* ئەم شیعرە لەلایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

## بۆ سولەیمان

سولەیمان محەمەدی، تێکۆشەرێکی کومۆنیست و ڕێبەرێکی خەباتی کرێکارانی کوورەپەزخانە گەلاوێژی (1365)؛ دیسەمبری (1986)؛ کەوتە بەر کارەساتێکی حیزبی دیموکراتی سەرمایەداران و گیانی بەختکرد. شیعرەکەم لا نەمابوو؛ یەکێک لەهاوڕێیانی دێرین، لە ئارشیوی خۆی دۆزییەوە و ناردی بۆم بەسپاسەوە لەم هاوڕێیە پاش 33 ساڵ، دیسان بڵاوی دەکەمەوە:

پەنجەیەك بوو
پەنجەکانیترمی فێرکرد بن بە مست و
پۆزەی بەهەڵپەی تاڵانکەر
لە خوانی خێزانی برسیم دوورخەنەوە!
پەنجەیەك بوو
دەستمی فێرکرد
کە دەستی هاوماڵەکانم
گەرم و گوڕتر، بگرمەدەست!
پەنجەیەك بوو
نەبزی مەچەکمی ئەگرت و ئازارەکانمی ئەڕەواند؛
ئاواتەکانمی ئەناسي؛
ئاڵۆزاوي تاڵەکانی، ئارام ئارام،

ئەکردەوە و
بێ گرێ و گۆڵ
لەگەڵ ئاواتی هاوماڵان ئەیهۆنیەوە...
ئارامی ژانی منالّی نەخۆشم بوو
لە گەرمەژانی پڕئێشا...
پەنجەیەك بوو
گوڵی لامپای ژوورەکەمی هەڵئەکێشا...
پەنجەی پیرۆزەی ئیشارەت
ئیشارەتی بەشارەت بوو بۆ رزگاري
نیشانەی دەریای وشیاري...
***
پەنجەبووین، کردینی بە مست!
هەرکام، دەستێکی لاواز بووین
لێکی هەڵپێکاین: هەزاران...
بێ هێز بووین، بەهێزی کردین...
دابێینەوە
تارێنەری پۆزەی تالاّن!
کە سەرتاپا، خەریکین بینە هەڕەشە
ئاڕاستەی جەستەی تالانکەر،
دێوی دزێوی هەزار-سەر
سەرچاوەی ڕەنج،
ڕووناکي-کوژ،
سۆما-خنکێن،
چنگی چەپەڵی چەتوونی هاویشتووەو
گەش-ئەستێرەی لە ئاسمانم ڕفاندووە!

چاوی چەواشە لە حەنای شەوقی چرام،
چنگاوشی دەستم بووەو
پەنجەی، ئاوا، چرا-گرمی
شکاندووە!!
***
هۆ چنگی دز!
هۆ چنگی چەوت!
دەستی پەستی چەتەی چەتوون؛
کە ژانی مەرگ ئەتجووڵێنیٚ!
گوڵی سولەیمانت ژاکاند؛
بەڵام بۆ گوشینی گەرووت
من
شێر-پەنجەی هەزار-پەنجەم!
ئاسمانێکی پڕ-ئەستێرەم
نووخاومەتەوە بە سەرتا!
ئەرزێکی پانم
پڕ بورکان
تەقیومەوە لە ژێر پێتا!
لەم سەر-عەرزە و ژێر-ئاسمانە
-ئەی دەرەتان-کوێرەوە-بوو-
لە کویٚ سەری پیرە-مەرگیت ئەنێیتەوە؟!

**ڕێبوار؛**

**31ی 6ی 1365**

# بەڕێزە گیانبازیتان*

خەمی مەرگی ئێوەمان
نایە سەرشانی کێوەکان
کێوەکان ڕمان
بەڕێزە گیانبازیتان
لەو ڕێبازەی خۆی بەڕێزە:
ڕێی ڕزگارییە!
رزگاریبەخشی ئینسان
بۆ سوسیالیزم:
بۆ ئازادي یەکجارییە!
خەمی ئێوە تووڕەیي و قین
خەمی ئێوە ئەوژم و تین

خەمی ئێوە، تین بوو،
هێز بوو،
بۆ پێشی بردین...
بەری بەیانی ئازادی
دڵان هەموو لانکی شادی
یادتان دەکەین
لە بەر-بەیانی شادی ئازادی [2]

ئازیزترین پێشڕەوان
ورە و بێباکیتان
سامی مەرگی تێکشکاند
مەرگی بێباکانەتان
زەبوونی سەرکوتکەرانی
ئاشکرا زڕاند
قەڵای بیر و باوەڕتان
ئیرادەی پتەوی ئێمەی
بە هەموو نواند
بەری بەیانی ئازادی
دڵان هەموو لانکی شادی
یادتان دەکەین
لە بەر-بەیانی شادی ئازادی [2]
خیابان و کووچەی شاران
شەپۆل-شەپۆل،
دەریای خەباتی لێ مۆنج دەدا
هەر سەنگەرێکی بەرزی کێوان
ئاڵایەکی سوورە،
بە یادی ئێوە هەڵکرا...
هاواری زیندانەکان
پەردەی شەوی ڕەش لادەدا
شەوگار شەق دەکا...

بەری بەیانی ئازادی
دڵان هەموو لانکی شادی
یادتان دەکەین
لە بەر-بەیانی شادی ئازادی [2]

* ئەم شیعرە لەلایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بەگۆرانی.

# بۆ ئازادی، بەرابەری، حکوومەتی کارگەری*

دەربەدەری و ڕەنج و مەینەت، سەرکوت ستەم و برسیەتی
لە تاقەتا نییە، نییە، ئەی هاو-زینجیران وەختیەتی.
تاکەی دنیای پێچەوانە لەجیاتی پێ لەسەر سەر بێ؟!
وەختیەتی ژێرەو ژوور بێت و ئێمەی ژێر دەستی سەروەربێ
کۆیلە زنجیری دەپسێنێ، حزبی وشیاری رابەری
بۆ ئازادی بەرابەری، حکومەتی کارگەری.
چی نیعمەت و بەرهەم هەیە، چی کانگای خێروخۆشییە،
تا لەچنگی سوود پەرستی تالانکەربێ فایدەی چییە؟!
دەسکۆتاکەین تالانکەران،
هەمووی بێ بەموڵکی هەموان.
ئازاد و بەرابەر بژین ، بەختەوەربێ نەوەی ئینسان.
کۆیلە زنجیری دەپسێنێ، حیزبی وشیاری ڕابەری.
بۆ ئازادی، بەرابەری، حکوومەتی کارگەری.
زنجیری هەزاران ساڵە، دەپچڕێ و حوکمی بەتاڵە
ڕۆژێکی وا لەمێژوودا، نەورۆزی نوێ و سەری ساڵە
بۆ یەکەم جار چەوساوەکان دەبن بە ڕابەری جیهان
هەتاوی گەش، هەتا هەتا، تیشك داوێژێ بۆ ئینسان
کۆیلە زنجیری دەپسێنێ، حزبی وشیاری ڕابەری.
بۆ ئازادی، بەرابەری، حکوومەتی کارگەری.

# پەپوولە

لە مێژەوە
لە کراژی کرمینەی دا
پەلەقاژە بوو
تەقەللاو تەوژم و ڕەوت ...
هەر هەڵگەڕان ....
هەر چنگە کڕێ لە زەوی
جارجار گلان
بەڵام دیسان
هەر هەڵگەڕان،
جێ هێشتنی ئاستی پەستی نزم و نەوی ...
تاکو یەکسەر
کراسی کرمی دادڕێ
با لە ڕەنگاو-ڕەنگەکانی
وەك دوو لێوی ماچێکی مزر
بە یەکاداو
بەرەو بۆن-خۆشترین گوڵی سووری سەرچڵ
بەرەو دەریای شین و بەرینی بێ ئەوپەڕ
لەگەڵ پەپوولەیەکی تر ....

# وەك چۆلەكە*

وەك چۆلەكە چلاوچڵ
وەك پەروانە گو ڵاوگوڵ

شارەوشاری کوردستان
ئەکەم لەبەر بۆمباران

دایك و بابم بێکارن
رووت و برسی و هەژارن

ماڵ وێرانە و ڕووخاوە
خومپارە و بۆمب لێیداوە

جەژنم کوا؟ نەورۆزم کوا؟
گۆرانیم کوا؟ سۆزم کوا؟

شەڕ هەمووی لێ تێکداوم
ئاخ بۆ برای کوژراوم

دایەی شیرین بابەگیان
با هاوار کەین بە گشتمان:

شەڕ دەسبەجێ تەواو بێ!
خێر و خۆشی لەناو بێ!

دنیای ئێمە با شاد بێ!
دنیایەکی ئازاد بێ!

ئەو شیعرەشم، کە بوو بە بنەمای ئەم گۆرانییە، یادگاریێکی فامیلی (1960)ەکانە، بۆ منداڵێکی خنجیلانەی خزممان، بەناوی «بەهار» کە هەر بەمنداڵی دایکی نەمابوو! من ماڵم لە شاری سنە بوو. بەهاری ئازیز، زوو زوو ئەهات بۆ لامان؛ کە بنەماڵەی دایکیشی خەڵکی شاری تەورێز بوون، زوو–زوویش هات و چۆی تەورێزی دەکرد ...

وەك مەلیچك چلاوچڵ
وەك پەروانە گوڵاوگوڵ
لە تەورێزەو بۆ کورسان،
بەخەیربیتەو. بەهار گیان
بەدوو چاوی کاڵ و گەش
زوان شیرین و قسەی خوەش
ماڵمان پڕکە لە شادی
پەریچە و پەریزادی!
لەم باوەش بۆ ئەو باوەش
خۆشە بۆنی گوڵی گەش؛
یادگاری ئازیزی
ئازیزەکەی تەورێزی
رووخۆش و خوێن شیرینی
بۆیە لامان شیرینی!

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# تاسەم لێت نەشکا*

تاسەم لێت نەشکا، گیانی شیرینم
وامن ڕۆیشتم، سا کەی بتبینم
ئەستێرەی دووری، ئاسمانی ڕەشی
ئاسۆی ڕووناکی، بە دیمەن گەشی
دڵ کەیلی گەشی، ئاسۆی گەشی دور
بە بێ کۆکردن، لە کۆسپ و سنوور
تا ڕۆژی ژینی، سەربەست و ئازاد
سەربەست بتبینم، سەربەست و دڵشاد

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غولامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

# دەسا ڕاپەڕن*

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان
دەسا ئەی چینی دەست و پێ سواو
کرێکارانی برسی و بەش خوراو
بەش مەینەتانی خاوەن هەژاری
کۆیلانی حوکمی سەرمایەداری

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان
ئیتر با بەس بێ سەر دانەواوی
بەسیەبێ دەنگی ودیلی وچەوساوی
ئیتر با بەس بێ ژیانی سستی
گیرۆدەی یاسای کۆنە پەرستی

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان
ساڵەهای ساڵە دەردی گرانە
بە هاری شادی زەردی خەزانە
با خەڵاتی سوور ئاگر بستێنێ
دوا ڕۆژی ڕوون و ئازدی بێ نێ

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (کاڵێ ئاتەشی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

## هەروا تاوێك

تاوێك تێفكرە ، چەند خۆشە:
قیامەت، درۆبێ، نەبێ!
هەروا تاوێ: تاوێك بیری بەرێ
جەهەننەم لە گۆڕا نەبێ
ئەم ئاسمانەی سەر سەریشمان
هەتا بڕۆی هەر ئاسمان بێ...
*
تێبفكرە و بیری بەرێ
هەموان هەر بۆ ئەمڕۆ بژین.
دژوار نیە!
تۆش پێت وانیە دەگونجێ؟!
پێناوێك نەبێ بۆ كوشتن
-یان بۆ كوژران!
ئاین نەبێ!
تاوێك هەروا بیری بەرێ
هەموان بە ئاسایش بژین!...
رەنگە بڵێی، من خەیاڵ هەڵیگرتووم
بەڵام هەر من وا دەڵێم
تۆش بە هیوام
رۆژێك
بێیتە كۆڕمانەوە
جیهان هەمووی
یەكدەست بێت

روو لە یەك مەبەست!
تەنیا تاوێك بیری بەرێ
”هی من“ و ”هی تۆ“ نەما بێ
هیچ شتێك موڵكی كەس نەبێ
-بریا دەتتوانی تۆش وەك من بیسەلمێنی!
دونیایەك بێ
برسیەتی و تەماع و تالان
هەرلە بیری كەس نەما بێ.
بەشەر – یەكسەر-
دەست لە مل و بەرابەربێ!
هەر تاوێك بیری پێبدە
هەموان هەموو شتێكیان نەبێ
-رەنگە بڵێی ، من خەیاڵ هەڵیگرتووم-
بەلام هەر من نیم وا دەڵێم
تۆش بە هیوام
رۆژێك بێیتە كۆڕمانەوە!
لە گەڵمان بێ بۆ ئاواتەخوازی رۆژێك
دونیا چما
ئاسمانێكی شینی شینی مانگی گولان
تابلۆیەكی شكۆداری ئازادی بێ
پەردەی زەردی لە بیرچونەوە كێشرابێ
بەسەر دونیای
كۆیلەیەتی و رەشی و ستەما
تۆ هەر تاوێك بیری بورێ
تاوێك هەروا بیری بەرێ...

**رێبوار**
**وەرگێڕانێكی ئازاد لە گۆرانی ئینگلیزی**
**«ئیماجین»ی «جان لێنۆن»**
**گولانی 64**

# سروودی دوو پەیکەرە*

رۆڵەی شیرینم گەنجەکەم
بەرامەی تاڵی ڕەنجەکەم
پەیکەرت بەرزە نابەزێ
وەك سوارێك کە دانابەزێ
منیش سەربەرزم بە بەرزیت
دڵ قایمم کە نەبەزیت

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکانا
لە مەیدانا لە زیندانا
بە شکۆی پەیکەرەتانا
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

لە ژینی بەشمەینەتانا
لە ژێردەستی زاڵمانا
لە کۆت و زنجیر بەولاوە
چیت هەبوو؟ چیت لە دەستداوە؟
منیش ڕەنجم کوێرەوەریم
زیاتر نابێ بە مەرگی تۆ

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکانا
لە مەیدانا لە زیندانا
بە شکۆی پەیکەرەتانا
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

زیاتر نابێ بە مەرگی تۆ
بۆیە وتم ئەرێ بڕوا
لە گەڵ کاروانی خۆشاجۆ
لە گەڵ هاو زنجیرانی تۆ
بڕۆ بێ ئاوڕدانەوە
بیرە وبادانەوە

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکانا
لە مەیدانا لە زیندانا
بە شکۆی پەیکەرەتانا
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

هەرچەند داخا لە دڵمانا
نیت لە کۆڕی هاوڕێکانا
بەڵام تینی لە لەشیانا
ورشەیت لە چاوی گەشیانا
وزەیت لە پەلارمایانا
سروودیت لە سەر زاریانا

بە جەربەزەی هاوڕێکانا
نەترسی شەهیدەکانا
لە مەیدانا لە زیندانا
بە شکۆی پەیکەرەتانا
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (نەجمەدین غوڵامی)ەوە کراوە بە گۆرانی.

## لێکۆڵینەوەکان دەربارەی ڕێبوار:

- ڕێبوار، ئەلگۆ و سیمبوڵی ئەدەبی کرێکاری و چینایەتی
- ڕێبوار، سمبول و رەمزی ئەدەبی بەرگری
- ژنبوون و جوانناسی لە شیعری شیرین ئەدوێ
- دوالیزمی شیعر و شۆڕش لەخاکی ژیاندۆستیدا
- شیعری گۆرانی و ڕۆمانسییەت لای ڕێبوار

(1)

# ڕێبوار
# ئەلگۆ و سیمبوڵی
# ئەدەبی کرێکاری و چینایەتی

دیسان سپاس سەبارەت بەو سەرنجە ورد و دڵسۆزانەیە.
خوێندمەوە. زۆر بەپێزە.
هەندێک هەڵەی ورد و درشتی هەیە؛ وەک ئەوەی من، بەهۆی
کەوتنە بەندیخانەی ساواکەوە، تەواوکردنی زانکۆم، ساڵێک
دواکەوت و لە 1971 تەواوم کرد..
ئەگەر پێتان باشە، بە وردی، چاوی پێدا بگێڕم، بە دڵنیاییەوە
دەیکەم؛ دیارە، هەندێک کات دەخایەنێ! ئەگەر زوو ئاگادارم
بکەنەوە، تا ئاخری حەوتوو نابات!
هەر بژین بۆ هونەر و کەلتووری کوردی

**مصلح ڕێبوار**
2020-4-28
**سوید**

سـلاوی گـەرمی دڵـی پڕ هومێدی مەت پێشکەش
پڵـنگی هـەردی وڵات، ئـەی هـەڤاڵی پـێشـمەرگە
لە دەوری دەسـت و تفەتگت گەڕێم کە ڕۆژی خەبات
لەئـاسـتی هـەڵـمەتی تـیژت، چ نـاگـرێ بـەرگـە

ئـەم سـروودە کە لـە سـەر زاری خەڵکی کوردستان دێتودەچێـت، وەکـوو مـارش، سـروودێکی نیشـتمانی و چینایەتـی و ئەدەبیاتـی بەرگریی لێهاتوە، تـا ئەو کاتەیش نەکرابوو بە سـروود، نەکەوتبوە سەر زاری خەڵک، ڕێبوار دەڵێت «ئەم دوو کۆپلەیە، هی (چاوە)ی برامە» و من چەند کۆپلەکەی تری سروودەکەم لێ زیاد کردوە..

ئەم شـیعرە هێندەی خۆی ناسراوە، هێندە شاعیرەکەی نەناسراوە، کە گرفتی سەرەکی لێرەدایە، بۆیە ئەم نووسینە هەوڵێکە:

**یەکەم**: بۆ ناسـاندنی شـاعیر، کە هێـندە دەقی ناوازە و جوانی بەرهەم هێناوە لە ماوەی ئەو شەسـتودوو سـاڵەدا، کە شایەنی زۆرترین نووسینە، شایەنی خوێندنەوەی زۆرتر و گرینگیپێدانی زۆرترە، کە نزیک بە شەش دیوانی هەیە.

**دوەم**: ئاشـکرابوون و دۆزینـەوەی هەندێـک شـیعر و دەستنووسـی کۆنی شاعیر، کە پێشتر نەزانرابوون یان ون ببوون، ئەم ماوەیە پاش گەڕانی بەردەوام دۆزیومانەتەوە، کـە هەندێکیان لە سـەر زمانـی خەڵکی خۆشـناون، بەڵام مێژووییەکی ونن، ئەم کارەیش وەکوو ئەرکێکی مەعریفی و ڕۆشنبیرییە بۆ ڕزگاربوون لە فەوتانی بەشێک لە کەلتوور

و ئەدەبی کوردی و شیعری شاعیر.

**سێیەم:** هەوڵێکە بۆ لێکدانەوەیەکی کورتی هەندێک لە شیعرەکانی و ڕوانگە و تێڕوانینی ڕێبوار لە ماوەی ئەو شەست ساڵەدا.

**چوارە:** قسە لە سەر شیعر و شاعیرێک دەکەین، کە یەکێکە لە پێشەنگانی شیعر و هونەر و ئەدەبیاتی چینایەتی و کرێکاری، کە لە بواری ئەدەبدا کەمتر قسە لە سەر ئەم لایەن و ڕەهەندەی شیعری کوردی کراوە.

**پێنجەم:** قسە لە سەر وەرگێڕانی ئەو شیعرانە دەکەین، کە دڵی ئەدەبیاتی کرێکاریی جیهانین و لە لایەن ڕێبوارەوە کراونتە کوردی.

شـیعر، وەکـوو ژانرێکـی ئەدەبـی و جاویدانـی ڕۆڵی گەورەی هەیە، پێ بە پێی ژانرەکانی تر، لە ناو سەدان دەق و نووسـین، کە مێژووی داهێنان و بەشـەریەت شانازییان پێـوە دەکات، شـیعرەکانی (ڕێبوار)یـش دەکرێـت وەکوو یەکێک لەم دەقە زیندوانە سەیر بکرێن.

شـیعرەکانی ڕێبوار هەناسـە و ڕەنـج و ماندووبوونی ئینسـانە، ڕەنـج و ئـازاری کرێـکاران و زەحمەتکێشـانە، قسەیە لە سەر سروشتی کوردستان، پڕاوپڕە لە هیومانیزم و چوونـەوە بە گژ سـتەم و ناعەدالەتی، قسـەیە لە سـەر نابەرانبـەری بەرانبـەر ژنـان و ڕێزگرتـن لـە ژن وەکوو ئینسان.

ڕێبـوار، جیـا لەوانە لە ڕێگەی شـیعرەوە قسـەی دڵی هـەزاران کرێـکار، ژنـان، منـداڵان و کچانـی کورەخانە و تەون-کەری فەرشە ئاوریشمییەکانی دونیای چەوساندنەوە و سەرمایەداریی کردوە.

ڕێبوار (موسـلیح شێخ لئیسـلامی) لە ساڵی (1947) لە شارۆچکەی مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایک بوە، سـەرەتای دەیەی شەستەکان چۆتە خوێندن بۆ تاران و لە ساڵی (1970) لە زانکۆ ئابووریی تەواو کردوە.

ڕێبـوار خۆی دەڵێت (لە لاویمەوە هۆگریم بۆ شـیعر و ئـەدەب پەیـدا کـرد و تێکەڵـی کاری ڕێکخراوەیی و کاری سیاسـی بووم و دواتـر ڕێکخراوێکمان بەنـاوی (کۆمەڵە) دروسـت کـرد، کە جیـاواز بوو لە (تـودە، چریک و حزبی دیموکرات...).

دواتر هەر بە هۆی هەندێک لە شیعرەکانییەوە دەکەوێتە زیندان، وەکوو خۆیشی دەڵێ لە سەرەتاکانی شیعری خۆی تام و بۆی ناسیۆنالیزم بە شیعرەکانییەوە هەبوو، ساڵی (1979) بەشداری چالاکیی سیاسی دەکات و دواتریش دەبێتە خاوەنی چەند دیداری جیاواز و کاری وەرگێڕان و لە پاڵ کاری سیاسی و پێشمەرگایەتی لە شاخ و کارکردن لە بەرنامەی ئاسۆی شۆڕش بۆ ڕادیۆ و ڕۆژنامەکانی حزبی کۆمۆنیست و کۆمەڵە.

ساڵی (1991) دەچێتە سوید، وەکوو مامۆستای بیرکاری و زانست لە سوید کار دەکات و بەشدار بوە لە دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی (پێشەنگ، پێشڕەو، هانا)، ئێستایش لەگەڵ فەوزییەی هاوسەری دەژین لە سوید و خاوەنی سێ منداڵە.

ڕێبوار دەکرێت وەکوو دەربڕی ژانی هەموان سەیر بکرێت، دەکرێت وەکوو دەنگ و ڕەنگی زوڵاڵی چەوساوەکان و بەشمەینەتەکان و بێسەرپەنا و دەنگە کپ کراو و تاساوەکان سەیر بکرێت، کە تا ئەم ساتەیش بە ئارمان و ئامانجەکانییەوە پێوەستە، وەکوو ئەوەی کە فروغ فروخزاد دەڵێت: ڕێبوار بە خۆی، ژیان، کار، کردەوەکانی و شیعرەکانی یەک مانا و مەدلوول و یەک ڕێگا و ڕێبازیان هەیە، واتا شیعر و شاعیر یەک دونیا، یەک خەون و یەک واقیعن.

ڕێبواری شاعیر خاوەنی ئەم دیوانانەیە: (گەشتی کوردستان، بۆ ئازادی، دەنگ هەڵبڕە، چەند لاپەڕەیەک لە

دەفتەری ڕۆژانەم، وەرگێرانی شیعرەکانی ترەیسی چایمەن و کۆمەڵێک شیعری تر)،

وا بـــەهارە کـــەژ و کـــێـو ڕەنـــگـیـنـە
دڵ خـــەمـــگـیـــنـــە، بـە تـاسـە و تینە!
وەرە با ســـەیرێ لـە کـوردســـتان کـەین
ئـاوپـرژێـنـێـکـی کـولّـی دڵـمـان کـەین

ئەم شــیعرە لە دیوانی گەشتی کوردســتاندا هاتوە، یان وردتــر بڵێــم ســەرەتاکانی شــیعری ڕێبوارە، کــە باس لە بارودۆخــی گەلی کــورد دەکات، باس لــە خوازیار بوونی ژینی سەربەست دەکات، دواتریش لە شیعری (سنە) دەڵێت:

لـــە ســـەر ئـارێـــزەوە بـــا بـرِوانـم
بۆنەکـــەی خۆشـــە ئەگـاتـــە گیانـــم

ئەم شــیعرە لە پاڵ وەســفی جوانی و پیرۆزی ســنە و شــاخی ئارێز، نامەیەکە بۆ ســمکۆ کە پێدەچێت مەبەســتی سمایل شەریفزادە بێت کە دەڵێت:

گـوڵـــە بارانـــی گـڵـــی ســـمکۆ کـــەم
گـڵـــە بانانـــی دڵـــی پـــڕ ســـۆ کـــەم

دواتریــش لە شــیعری (بۆکان) (ســابڵاخ) (مەریوان) بە هەمان شــێوە وەکوو قۆناغی یەکەمی شیعری ڕێبوار، جیا لەوەی شــیعری کێش و سەروان و دەکرێت وەکوو بەشی یەکەمی شــیعری ســوننەتی ڕێبوار ســەیر بکرێت، وەکوو

خۆیشی دەڵێت ڕەنگ و بۆی ناسیۆنالیزمیان لێ دێت، بەڵام جوانی و بەهای خۆشـیان هەیە، وەکـوو لە کتێبی یەکەمی خۆیدا هاتوە بە ناوی(گەشتێک بۆ کوردستان).

یان بڵێم لەم دیوانەدا زۆری شیعرەکانی شیعری گۆرانین و هەر یەکە لە ناسـری ڕەزازی و بەکری لەگزی کردویانە بـە گۆرانـی وەکـوو خۆیشـی دەڵێـت «شـیعری کوردی ئاوێنەیەکـە لـە کۆمەڵی کـوردی، بەڵام شـیعری کوردیی سـەردەم زیاتر کاریگەری لە شیعری جیهانی وەرگرتوە تا کاری تێ کردبێت».

لـە دیوانی دوەمی ڕێبـوار کە ناوی (بـۆ ئازادی)یە و خۆیشی دەڵێت «ئەم شیعرانە کردەی ئەم شۆڕشەن، هەر چەندە من لە دەیەی شەستەکانەوە شیعر دەنووسم، بەڵام ئەم شـیعرانەم تەواو جیاوازن»، لە ڕاستیشـدا هەر وایە، واتـا لـەم دیوانەدا جیا لـەوەی تا هاتوە بـاوەڕ و ئیمانی ڕێبوار بەرانبەر مارکسیزم و بزووتنەوەی چەپ پایەدارتر و حەکیمتـر بـوە، جێ مـۆری شـۆڕش و ئاڵوگۆڕی ئەو شۆڕشـەی پێـوە دیـارە، واتا وەکوو خـۆی دەڵێ هەوڵی داوە شیعرەکانی (کۆمۆنیستییانەتر) بێت، وەکوو خۆیشی دەڵێت «لەم سـاڵانەی دواییدا شـیعری کـوردی ئاوڕێکی تازەی لە ئەدەبی جیهانی داوەتەوە، شیعر لە زمانەکانی تر دەکرێتە کوردی، شـیعر لە فۆڕمدا زیاتر سیکۆلار دەبێت، بەڵام جوانناسییەکەی زامدارە»، وەکوو لە شیعری (نامە) دەڵێت:

«خوشکی خۆشەویستی برات!
سڵاوێکی گەرم و گەشی پێشمەرگانە
لە ڕێگای دووری سەنگەری شۆڕشی کوردستانەوە
پێشکەش ئەکەم،
سڵاو ئەکەم
لەو دڵە میهرەبانانە
شەو تا بەیان
ڕۆژ هەتا وەکوو ئێوارە
ئۆقرە و ئارامیان نەماوە
تەیری دڵیان
لەگەڵ دڵی پێشمەرگەکان
لە سەر هەموو زیندانەکان
پەرواز ئەکا»

دەبێت ئەوەیش بڵێم (ڕێبوار موسیلح شێخ لئیسلامی) نەک بە تەنها شاعیر و ئەدیبە، بەڵکوو ڕاستییەکی شاراوەیش هەیە ئەوەیە، کە ڕێبوار لە یەکەمین دەستەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەیە (کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) کە لە ساڵی (1969) لەگەڵ هاوڕێیان (فوئاد مستەفا سوڵتانی، حەمەحوسێنی کەریمی، یەدوڵڵای بیگلەری، ساعید وەتەندوست، عەبدوڵڵای موهتەدی، فاتح شێخ لئیسلامی «چاوە»ی برای ڕێبوار کە ئەو کات لە مەریوان، مامۆستای قوتابخانەی ناوەندی بوو) وەکوو کۆمەڵێک خوێندکاری زانکۆ لە تاران، ئەم حیزبەیان دروست کرد، لەو کاتە بەدواوە، ڕێبوار جێگە و پێگەی لە ناو ئەدەبیاتی شیعر و لێکۆڵینەوە زۆرتر دەرکەوت و

ڕۆڵی ســـەرەکی و یەکەمینی هەبوو لە دەرچوونی گۆڤاری (پێشـــەنگ) و دروســـتکردنی کانوونی هونەری و ئەدەبی و کرێکاری کوردستان و دواتریش گۆڤاری (هانا).

لە وەرگێرانی شیعری (ئەنتەرناسیۆنالی)ی ئۆژین پۆتیە دەکرێـــت بڵێـــم «ڕێبـــوار یەکەم کەســـە، کە ئەم شـــیعرەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.»

«هەستن! ئەی هۆزی بەشمەینەتان
دیلانی برسیەتی دنیا
لە تەنوورەی بیروباوەڕمان،
قرمژنی تریشقە راسا
تەنوورەی ئاخرینە هەستن
با هەڵیپێچین دەورەی کۆن
ڕابین و ژێرەوژوورکەین جیهان،
ئێمەی "هیچ" بین بە "گشت"، ئەی کۆیلان!
ئاخرین شەڕە، شەڕی سەر و ماڵ
با یەکگرتوو بین هەڤالان
بە ئەنتەرناسیۆنال
ڕزگار دەبێت ئینسان»

* * *

ئەم شـــیعرە وەکوو مانفێستی حزبی کۆمۆنیست وەکوو ســـروود و مارشـــی کۆمۆنیســـتەکان پیرۆز و ڕێزلێگیراوە شـــیعر و ســـروودی کرێکاران و ڕەوتە ڕادیکاڵ و چەپ و سۆسیالیستەکانی هەموو دونیایە.

گەر دیقەت بدەین، ئەم شیعرە هێندە جوان وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردی، ئەوەیش دەلالەتە بۆ ئەوەی ڕێبوار کەسێکی مارکسیست بوە، بۆیە وەرگێڕانەکانیشی تام و بۆی شیعرە ئەسڵییەکانی پێوەیە، وەکو وخۆی دەڵێت «کە گوێم لە دەنگی هاوخەباتەکانم بوە لە جیهاندا وەرمگێڕاونەتە سەر کوردی»، بە تایبەتی کە دەبێت ئەوەیش بڵێم ڕێبوار زمانی ئینگلیزی باش دەزانێت، جگە لە فارسی، سویدی و کەمێکیش عەرەبی، هەر بەو بۆنەیەوە دەبێت بڵێم کە (مانفێستی حیزبی کۆمۆنیست) کە نووسراوی مارکس و ئەنگڵسە، هەر یەکەم جار ڕێبوار کردویەتی بە کوردی و ڕۆڵی زۆری هەبوە لە ناو حیزبە چەپ و کۆمۆنیستەکاندا.

لە شیعرێکی تری ڕێبوار هەر لە دیوانی (بۆ ئازادی) لە شیعری بڕیاری یەکی ئایاردا دەڵێت:

«پۆنگی خوارد مۆنجی دەریای کرێکار
دژی سەرمایە، ئەوەڵی ئایار
سەد ساڵە ئەڵێم
ئەمە بڕیارە
بڕیاری ڕۆژی یەکی ئەیارە
کرێکارانی جیهان یەکگرن
چەرخی چارەنووس لە دەست خۆ گرن»

* * *

یەکێکە لەو شیعرانەی لە سەر زاری کرێکاران و ڕەنجدەرانە، یەکی ئایار جیا لەوەی ڕۆژی هاوبەشی چینی کرێکارە، ڕۆژێکی تەواو جیهانییە، بۆیە ڕێبوار ئەم بۆنە چینایەتییەی تێکەڵی هاوخەباتیی کورد و فارسیش کردوە، کە ڕەنگە یەکێک بێت لە جوانترین ئەو شیعرانەی بۆ ئایار نووسراون، وەکوو قوربانیانی شەقام، تێکەڵبوون لەگەڵ شۆڕشی ئۆکتۆبەر و ڕێبازی لینین، بۆیە ئەم شیعرەی ڕێبوار دەکرێت وەک چۆن لە ئاستی هونەری شیعریدا بەرزە، بە هەمان شێوە مانایەکی چینایەتیی زۆر گەورەشی هەبێت.

جەلال ئەمین دەڵێت «لە نێو هەموو گاشە بەردێکدا پەیکەرێکی جوانی شاراوە هەیە، ئەوە تەنیا هونەرمەندانن پەیکەرە جوانە شاراوەکانی نێو حەشارگەی گاشە بەردەکان دەدۆزنەوە».

لە مێژووی ئەدەبیاتی جیهانی شاعیرانی گەورە زۆرن کە وەکوو شاعیری ئەدەبیاتی کرێکاری و چینایەتی ناسراون (ئۆژێن پۆتییە، جەوهیل، لانگستۆن هیووز، هاینریش هاینە، نازم حیکمەت، بێرتۆلد برێخت) کە بەشێکی زۆری شیعرەکانیان هەر لە ڕێگای ڕێبوارەوە وەرگێڕراون بۆ کوردی، لە بابەتی شیعرەکانی (چیدی ڕووتوڕەجال نابین، گۆرانی پارچە چنانی «سیلزی»، لەشکری برسێتی، کلووچە، سپاس) و دەیان دەق و شیعری جیهانیی دیکە.

دەکرێت بڵێم لە ناو ئەدەبیات و بە تایبەتی شیعری کوردیدا ڕێبوار یەکەمین و تا ئێستایش دوایین شاعیری

ئەم بوار و مەجالەیە، واتا لە ڕیزی پێشـەوەی شـاعیرانی چینایەتی و ئەدەبی کرێکاریی کوردستاندایە، کە بێ گومان چەنـد فاکتەر لە پشـت ئەم مەیل و ئیرادە و پێشـەنگییەوە هەیە:

**یەکـەم:** خانەوادەکـەی ڕێبـوار لـە شـاری مەریوانـی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان، خانەوادەیەکـی پێشـکەوتنخواز، شۆڕشگێڕ و مۆدێرن بوون.

**دوەم:** زانکۆ ڕۆڵی هەبوە لەوەی ڕێبوار ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەبیاتی فارسی لە تاران پەیدا بکات و بەرەو پێش بچێت.

**سـێیەم:** بەسـتنی پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجی چەپ و مارکسیسـت لە زانکۆ لە دەیەی شەستەکان و بە تایبەت لـە (1969) وەکوو یەکەم کەسـانی دامەزرێنەری کۆمەڵە و وەکـوو ڕێکخراوێکـی کرێـکاری و کۆمۆنیسـت خـۆی دەرخسـت و بوون بە پێشـمەرگە و لە شـاخ لەمسـی ئەو بارودۆخەی کرد.

**چـوارەم:** زانینی زمانی ئینگلیزی، فارسـی و سـویدی و تێکەڵبـوون لەگەڵ ئەدەبیاتی جیهانی، کاریگەریی لە سـەر دانـاوە و هەر لە ژێـر کاریگەریی ئەو هەموو فاکتەرە وای کرد ڕێبوار ببێتە شاعیرێکی چەپ، کۆمۆنیست و ڕابەرێکی چەپ و مارکسیسـت، خولقاندنی ئەدەبیاتی چەپ، خزمەتی ئەو ئارمان و ئامانجە.

جیا لەوەیش ڕێبوار برای فاتح شـێخ لئیسـلامی (چاوە) یـە، کـە یەکێکە لەو سـێ شـاعیرەی کە لە پاڵ سـوارەی

ئێلخانیزاده و عەلی حەسەنیانی، بە شاعیری پێشەنگ و نوێخوازی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دانراون.

لە شیعری پێشمەرگەی کۆمەڵەدا دەڵێت «پێویستمان بە هاوخەباتیی چینایەتی هەیە بۆ مافی چارەنووسی میللەتان، واتا ئەم شیعرە پێوەستە بەو مانفێستە مارکسیستییەی کە لە جیهان ڕێزی لێ دەگیرێت».

«لە قوڵایی دڵی
زەحمەتکێشان ڕا
هەڵیان کرد ئاڵا
هەستان ڕاسان
پێشمەرگەی کۆمەڵە وەك پۆڵان
لەشکرێکی ئەرتەشی سووری کرێکاران»

دواتر لە شیعری (سروودی ژنانی تێکۆشەر) وەکوو پیاوێکی ئازادیخواز و عەدالەت تەڵەب و یەکسانیخواز، هانی ژنان دەدات بچنە ڕیزی شۆڕش و ببنە پێشمەرگە، کە ئەمە کاتێکە، عەیبە بوو، ژنان ببنە پێشمەرگە لە ناو جەرەیانێکی کۆمۆنیستیدا چەک هەڵگرن، ئەو سەردەمە کە کۆمەڵگا ئەمەی پێ قەبووڵ نەدەکرا، ڕێبوار لەو کاتەدا نەک هانی ژنانی دا، بۆ ئەو کارە، بەڵکوو بە شیعر و ئەدەبیات پشتیوانیی لێ کردون و ڕێزی دانا بۆ ئەو هەنگاوەی ئەوان، پێی وابوو ئەو سەنگەرە ئاوەدانە کە ژن تێیدا پێشمەرگەیە، ڕوانگە و بۆچوونی ڕێبوار پێش سەردەم و تێڕوانینی

کۆمەڵگاکـــەی بوو، بۆیە دوای ئەو هەزاران ژن لە ڕیزەکانی یەپەگە و یەپەژە بوونە سیمبوڵ و چەکدار و ئێستایش جیهان شـــانازی بە ئەوانەوە دەکات. ڕێبوار، هاوشێوەی بۆچوونی خودی مارکس و مارکسیســـتەکانی دیکەی سەدەی بیستەم لە نموونەی لیۆن ترۆتسکی، کە ئازادیی ژنان دەکەنە پێوەر بـــۆ ئازادیی کۆمەڵگا، ئەویش دەڵێت «کۆمەڵگا هەر ئەوەندە ئـــازادە، کـــە ژنەکانی ئازادن، ئەو هەســـت و هەڵوێســـتانەی مـــن دەرم بڕیـــوون پێداگرییەکـــی تازەیە لـــە بابەتی ژنان و هیوادارم ڕێبواری ئەم ڕێگایە لەوە زیاتر بن» دەڵێت:

«شـــۆڕشــــــە هەســــــتن ڕاپەڕینـــــە
ئـــــــەی ژنـــــانـــــی گـــــشــــــت وڵات
شـــــان بـــــە شـــــانی پیـــــاوان هەســـــتن
بـــێـــنــــــە نـــــاو ڕیـــــزی خـــەبـــــات»

ڕێبوار، لە وەسف و ستاییش و هاوڕێ و هاوسەنگەری پێشـــمەرگەی کۆمۆنیستیدا، بێ گوێدانە ئەوەی بچێتە قاڵبی دەربار و ستاییشی بێ بنەما، شیعری بۆ هاوڕێی کۆمۆنیست و مارکسیســـتەکان نووسیوە و لە شیعری (سروودی کاک فوئاد، ســـروودی کاک شـــوان و ســـروودی مام ڕەحمان)، ڕێبـــوار لە بەرانبەر ئەم شـــیعرانە و پرســـیاری ئەوەی ئەم شـــیعرانە ناچنە قاڵبی دەربارەوە؟ دەڵێت «شـــوان، فوئاد و مام ڕەحمان شازادەی دەربارن، یان کارگەر و کۆمۆنیست و زەحمەتکێشن، ئایا شایەنی ڕێزلێگرتن نیین؟» بۆ نموونە لە شیعری (سروودی کاک فوئاد) دەڵێت:

«فوئاد، ڕۆڵەی ئاگر و خوێن
تۆوی شۆڕش لە هەموو شوێن
وەستا شێرانە بەرانبەر
پەلامارەدەر چەشنی سەنگەر
گیڤارای کوردەواری بوو
لە هەموو شوێن دیاری بوو
* * *
دەمێ یەکیەتی جووتیاران
دەمێ کۆڕی زەحمەتکێشان
دەمێ سەنگەر دەمێ مەزرا
کوڵ هەڵگرتن لەگەڵ فەلا»

پڕاوپڕی خۆشەویستی وەسفی ئەوانە دەکات وەکوو ئەستێرەی پرشنگداری کۆمەڵگای کوردستان، وەکوو ئینسانی کرێکار و زەحمەتکێش باسی ڕۆڵ و مەینەتیی یەکێتیی جووتیاران، کۆڕی زەحمەتکێشان، مەزرا و ئیدامەدان بە سەنگەری کاک فوئاد و شوان دەکات و ئەوەیش دەڵێت «کە ئەوە مانای ئەوە نییە بۆ هەر گیانبەختکردویەک شیعر بنووسین، بەڵام کەمیش نیین»، بۆ نموونە لە شیعری (سروودی مام ڕەحمان)دا دەڵێت:

«مام ڕەحمان پیری پێشمەرگەی ئازا
پەی گیر پڕکینە لە زاڵم ڕاسا
سێبەری ئەخست بە سەر هەژارا
چرایێ ڕووناك لە ڕێی جووتیارا
ئازا و بەغیرەت بەرامبەر زۆردار

بــرای برپرەی پشـتـی کـرێکـار»

کاک شــوان وەکوو ڕەمزی بەرەنگاری و پێشــمەرگەی ئازا و تێکۆشــەر، ڕێبوار وەکوو پێشــمەرگەی ڕەنجدەران و زەحمەتکێشــان چـاوی لێ دەکات، ئەمەیـش جیا لەوەی وەکوو هاوڕێ ســەیری دەکات، بەڵام لەوە گرنگتر وەکوو ڕەمزی خۆشەویستیی کرێکاران و کۆمۆنیستەکان شیعری بۆ نووســیوە، بۆیە لە شــیعری (ســروودی کاک شوان)دا دەڵێت:

«مــــەرگ لــەبــەرچــاوتــان ســـــووك بــوو
ئـــاســــمـــان بـــۆتـــان بـــچـــووك بـــوو
بـــــــەڵام لاڵ بـــێ ئـــاســــمـــان!
بـــۆ شـــا بـــاڵــی تـــۆی شـــكـــان!؟
كـــــاك شـــــوانـــــی قـــــارەمـــــان
پـــێـــشـــەنـــگـــی پـــێـــشـــمـــەرگـــەكـــان
كـــــاڵ بـــــــوەوە چـــــاوی ڕەشـــمـــان
بـــۆ مـــەرگـــی تـــۆ كـــاك شـــــوان»

هەر چەندە لە ســەرەتای نووسینەکەدا گوتم کە ڕێبوار تــا ئەم ئەخیرانــەش زۆر ناســراو نەبوو بە ئێستایشــەوە جێگــە و پێگەی خۆی لــە ناو جامیعــە و ئەدیبانی داهێنەر پــێ نەدراوە، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی شــیعری ســروودی (ســڵاو لە پێشــمەرگە) دەنگدانەوەی گەورەی هەبوو، چوە سەر زاری هەموو خەڵکی کوردستان، کە دەڵێت:

«ئەوئێستەتۆیلەشەویتار مۆمیهەڵگیرساو
لە نێو دڵی شەوەزەنگا وەکوو گڕێك راساو
کە ڕات شەکاندوە ئاڵا بە دەستی خاراوت
دەگەی لە کۆسپ و بواران بە هەستی پاراوت»

ڕێبوار لە وەسفی پێشمەرگەدا هێندە بەرز ستاییش دەکات، تەنانەت خۆی دەکاتە قوربانیی دەست و تفەنگی، ئەمەیش مانای وایە، ڕێبوار دەرک بە ئارەزوو و هیواکانی کۆمەڵگاکەی دەکات، بۆیە بەم شێوەیە ڕێز لە پێشمەرگە دەنێت و دەڵێت «پێشمەرگە بە بۆنەی ڕێبازی خەباتیەوە لای من ڕێز و بایەخی هەبوە».

ڕێبوار، جیا لەوەی گوتم: وەکوو پێشەنگی شاعیرانی ئەدەبیاتی چەپ و مارکسیزم ناسراوە، بەڵام گەر دیقەت لە شیعری «وەڵامی نامەکەی ڕووناک» بدەین، مەنەلۆگێکی نێوان دایک و کچێکە:

«کۆریە شۆڕش پەروەرەکەم
ڕۆڵە شیرینەکەم
ڕووناك!
خۆزگا، شنەی بای بەیانی
بۆنێکی تۆی ئەهێنا بۆم؛
خۆزگا، ئەتزانی، یەکجاری چەند بەتاسەی بینینی تۆم

دڵ بەخورپەی بیستنی پێکەنینی تۆم؛
تامەزرۆی بۆنی هەناسەی بەربینی تۆم!
چەند خۆش، دەنگت لە گوێمدایە؛
کۆرپە شیرینەکەی دایە!
کە بە زەنگی دەنگی نەرمین، ئەت وت: دایە: دایەی شیرین!
کوانێ بابم؟ کوا؟ لە کوێیە؟
خاڵم، لە کام شار؟ کام دێیە؟ نامەیان بۆ هەرگیز نایە؟؟
منیش ئەم گوت: گیانی دایە! بابت، لەوێ، لە چیایە!
تۆش، بەو دەستە بچکۆلانە،
کاغەزێکت کرد بە نامە؛
کە زانیت من، بۆ ئێرە دێم؛ ئامانەتی نامەت داپێم، جوابی نامەت، داوا کرد لێم!
ئازیزە دڵ-خەمینەکەم! رووناك، رۆڵەشیرینەکەم!
ئەوا، منیش، لە سەنگەری ئەوانەوە، لە سەنگەری شۆڕشی کوردستانەوە،
-یادگارە شیرینەکەی یادی بابت- لەجیاتی وان، وا خوم، دەنووسمەوە جوابت!
نەکا دڵە بچکۆلەکەت
بە دووریی دایەش غەمگین بێ
نەکا نەرگسی چاوانت
لێڵی شەونمی ئەسرین بێ»
تا لە کۆتاییدا دەڵێت:
«خاڵۆ و بابە پێشمەرگە بوون
بە شوێن خۆری بەهارا چوون» ...

...

ئـەم مەنەلۆگـەی ناخی ڕێبـوار، واقیعیەتی نـاو ژیانی پێشـمەرگەیاتی و ئۆردوگاکان بوو، کە تروسکەیەک ئومێد نەبوو، بەڵام ڕێبوار لەو شـەوەزەنگەی ترس و خەفەقانەدا، ئومێد دروست دەکات و هانی ڕووناک دەدات، کە تێ بگات دایکی چۆتە شـاخ و لە پێناو ئارمان و ئامانجێکی پیرۆز و ئینسانی بوەتە پێشمەرگە.

بەڵام شـیعرەکە بە تەنها قسـە لە شـۆڕش و بەرگری ناکات، نەخێر قسەیە لە ناسکی و وێنە و ئەندێشـەی جوان، قسەیە لە سژن، وەکوو کائین و ئینسانێکی بە ئیرادە. ڕێبوار دەیەوێـت بڵێت ئەوە بە تەنها پیـاوان نین، کە دەچنە ڕیزی خەبـات و پێشـمەرگایەتی، بەڵکوو ژنانیـش وەکوو نیوەی کۆمەڵگا، شانبەشانی خاڵ، باوک و پیاوان پێشمەرگەن.

ڕێبـوار لـەم شـیعرەدا، باسـی سـەنگەری شۆڕشـی کوردسـتان دەکات، کە بە شـوێن خـۆری بەهاردا چوون، بە واتا بە شـوێنی ئازادیدا چوون، شـوێنی دژایەتی لەگەڵ ستەم و چەوساندنەوە چوون، باس لەوە دەکات شۆڕشێک بەرپا بوە، ژنان کارەکتەری سەرەکین و کۆمەڵگای فیودالی و خێڵەکی ناتوانێت تا سەر ژنان کۆیلە و زەلیل بکات و ئیتر ژنان شۆڕشـگێڕن، پێشـمەرگەن، کرێکار و ئینسـانن، جیا لەوەی لەم شیعرەدا، بە زمانی منداڵ قسە دەکات و هەست بـە خۆزگـە و ئارەزووەکانیان دەکات، دیالۆگێکی ناسـک و ئینسانییان لەگەڵ دەکات تا دەڵێت:

«چاوتان نەشێوێ بە ئەسرین
لێوتان پڕ بێ لە پێکەنین»

ڕێبوار لە بارەی چیرۆکی ئەم شیعرەوە دەڵێت «ئەوەیە کە دایکی ڕووناک بۆی گێڕامەوە، کە چلۆن ماڵاوایی لە ڕووناک کردبوو».

ئەو هەر لە پێوەند بە ژن و ڕێزگرتن لە ژن، شیعرەکانی پانتاییەکی زۆریان گرتوە لە بابەتی شیعرەکانی (نامەت نایات نازانم بۆ، ماڵئاوایی؟) هەر دووکی بۆ هاوسەر و هاوسەنگەرەکەی فەوزییە خانم نووسیوە، کە خەریکی کاری تەشکیلاتی نهێنی و حیزبی بوە لە شار، ئێستایش هاوژیان و هاوخەباتی ڕێبوارە تا دەڵێت:

«چاوەکانم
ماوەیەکە
خولیایەك لە سینەمدایە
خولیای خەم و خەتەرەی تۆ
نامەت نایە، نازانم بۆ؟»

دیوانی سێیەمی ڕێبوار، وەکوو خۆی دەڵێت «ناوی (دەنگ هەڵبرە) کە ساڵی (1988) لە شاخ بڵاو کراوەتەوە و پێشتریش (گەشتی کوردستان) لە ساڵی (1958) و دیوانی دوەمینیش بە ناوی (سڵاوی ئازادی) لە ساڵی (1984) بڵاو کراوەتەوە»، بەم شێوەیە تا دواتر باس لە دیوانەکانی تری دەکەین.

لەم دیوانەدا، لە کۆتاییەکانی شەڕی عێراق–ئێران بڵاو

کراوەتـــەوە هەســـت دەکرێت ڕێبوار لە شـــیعرەکانی تر، لە دیوانەکانی تر زۆرتر دەنگی بە ڕووی ناعەدالەتیدا هەڵبڕیوە و گەروی پڕە لە هاوار و ژانی هەموان، دیارە کە ئاڕاستەی نووسین و بیرکردنەوەی زیاتر لە پێشوو ڕادیکاڵتر بوە.

وەکوو حەمەســـەعید حەسەن دەڵێت «شـــاعیر لە پێناو داهێنانـــی دەنگـــدا لـــە دەرگای بێدەنگـــی دەدات، لـــە پێنـــاو بونیاتناندا هان بۆ ڕووخاندن دەبات».

ڕێبوار لەم بوارەدا بەتایبەتی لە بواری ئەدەبی، کرێکاری و مارکسیســـت و دڕی بە شـــەوە زەنگـــی بێدەنگی داوە و بـــە دەنگی بـــەرز هـــاوار دەکات، ئەم چـــەرخ و گەردونەی ســـەرمایەداری هەڵی دەســـوڕێنێت پڕە لە چەوساندنەوە و ســـتەم و بێ مافی، دەکرێت بڵێین «ســـەبارەت بە مەکتەبی شـــیعری ڕێبوار، ئەگـــەر کارەکان ڕەنگدانەوەی هەســـت و ڕەوشـــی کۆمەڵانی کارگەر و چەوســـاوە بێـــت، کە وایە لە خەباتـــی چینایەتیـــدا، دەکرێت بڵێین زۆرینەی شـــیعرەکانی ڕێبوار ســـەر بە مەکتەبی ڕیالیزمین»، گەر دیقەت بدەین لە شیعری (دەنگ هەڵبڕە) دەڵێت:

«هاوماڵە هەژارەکانی بابە و دایە
هێندەیان چاکەتی پەشمین
بە دەست و پەنجەی ماندوویان، بۆ چنیوین
کە نەك هەرمن
هیچ منالێك سەرمای نەبێ!»
جگەلەوەی لە شیعری (بانگەواز)دا دەڵێت:
«عومری ستەم
عومری چەوسانەوە، تەواو!
لە کۆمۆنەوە تا ئێستا»

ڕێبـوار، وەکـوو چەندیـن جـاری تریـش گوتومـە، هێنـدەی گەورەیـی شـیعرەکانی، خزمەتـی مرۆڤایەتـی و ڕووبەڕووبوونـەوەی ناعەدالەتـی پـەی بـردون، ڕەنج و ئازارەکانـی کۆمەڵگا و چینوتوێژەکانـی و نەهامەتییەکانی کرێـکاران و ژنـان و زەحمەتکێشـان نەناسـراوە، هێندەی میدیاکانـی کوردسـتان و بـە تایبەتـی باشـوور فۆکس و چاویان لە سـەر هەندێک نووسـەر و شـاعیر بوە، زیاد لە پێویسـت ڕۆڵ و گرینگییـان پـێ داون و تا ئـەو ڕادەیەی هەندێکیان کردونەتە سـوپەرمان و ئەفرێنەر، بەڵام هەرگیز ئەم کارەیان لەگەڵ ڕێبوار و شـیعرەکانی و ئەفراندنەکانی نەکـردوە، وەکـوو پێویسـت ڕۆڵیان پێ نەداوە، دراسـە و لێکۆڵینەوەی ورد و پڕ ئەهمیەتیان بۆ نەکردوە.

ڕەنگـە هەبن بڵێن «ڕێبوار کوردی ڕۆژهەڵاتە، بۆیە لێرە ناسـراو نییە»، یان هەن دەڵێن «لە ئەروروپا دادەنیشێت»، یـان دەڵێن «خـۆی کەمتەرخەمـە»، یان هـەن دەڵێن «ئەو کۆمۆنیسـت و مارکسیسـتە»، کـە هەمـوو ئـەو وەڵامانـە ناتوانێت بۆ هەر ئینسـانێکی ئازادیخواز و دۆسـتی شیعر و ئەدەبیـات قەناعەت پێکەر بێت، چونکە هەر چی چۆنێک بێت، کۆی بەرهەم و شـیعرەکانی ڕێبوار لە ناو مێژووی ئەدەبی کـوردی و لە ڕیزبەندی ئەدەبی چینایەتی، ئەدەبیاتی کوردی دادەنرێـت و لە سـەریان دەنووسـرێت و خوێندنەوەیان بۆ دەکرێت، با سەر بە قوتابخانەی ڕیالیزم و سەر بە مەکتەبەی چینایەتی و کرێکاریش بن، وەکوو چۆن شـیعرەکانی شـێخ ڕەزای تاڵەبانی، کە شیعری هجون، وەکوو چۆن شیعرەکانی

عەبدوڵڵا پەشێو پڕن لە ڕەخنە و جوانی، بەڵام دوا جار لە ناو ئەدەبیاتی کوردی شوێنیان دەبێتەوە.

کوردبوون عەیب نییە بۆ شاعیر و نووسەر، ئیتر چ لە باشوور یان ڕۆژهەڵات یان ئەفریقیا بێت، چ جای ئینسانی بێت، جێگەی شانازییە، ئەورووپایش مەحکوومییەتی مێژووی بەسەریدا سەپاندوە و ژیانی سەخت و دوو دەیە خەباتی پێشمەرگایەتی و شەڕی نەگریسی ئێران و عێراق ئەوەی بە سەردا سەپاندوە و گەرنا حەزی دەکرد لە ڤێلایەکی کوردستان ژیان بکات، لە باوەشی گەرمی هاوینانەی سروشتی کوردستان، نەک لە بەستەڵەکی سارد و سڕی سوید و ئاسمانی بێ ئەستێرە، بەڵام خۆ زۆر لە نووسەرانی جیهانی لە وڵاتەکەی خۆیان ڕایان کردوە، لە تاراوگە ئەفراندن و داهێنانیان کرد و بونەتە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ.

ئەوەیش کە قسەیەکی پووچە، شاعیر و ئینسانی داهێنەر خۆی نایات بە دوای گرینگیپێداندا بگەڕێت و ئەرک و کاری ئەویش نییە، بەڵکوو ئەوە ئەرکی کۆمەڵگا و میدیایە بۆ ئەم گەوهەرانەی ناو کۆمەڵگا، وەکوو مەرجان لە ناو دڵی دەریادا بدۆزێتەوە و خزمەتیان بکات.

ئەوە ئەرکی دەزگا و دامەزراوەی پێوەندیدارە، کە دەبێت لە کونی دەرزییەوە جاویدانی بدۆزێتەوە، گەورەتر و گەورەتری بکات و بە خەڵکی بناسێنێت و خزمەتی بکات، وەکوو سەرمایەی ئینسانی کۆمەڵگا بیانناسێنێت.

ئەوەیــش کە ڕەنگە لای هەندێک کەس و لایەن وەکوو شــاعیری چــەپ و مارکسیســـت ڕەخنــە بکرێــت، خۆی قســەکە، ڕێک لێرەدایە، بە پێچەوانەوە، ڕێک ئەو ڕەخنەیە نامەنتقی و پێچەوانەیە، واتا گەورەیی و سەربڵندی ڕێبوار هــەر لەبــەر ئەمەیە، کە جیــا دەکرێتەوە لە کەســانی تر، واتــا ڕێبــوار ڕێچکە، ڕێباز، ئایدیال و مانفێســتێکی هەیە، مارکسیســـتییانە، ڕادیکالانــە، هیومانیســـتییانە و تــەواو ئینســـانی و پڕبەپڕی عەدالەت، ڕێبوار خۆیشـــی شانازی دەکات بــەم ســـەرمایە ئەدەبی و ئینســـانییە، کە ڕەنگ و بۆنـــی مارکسیســـتییانە و کرێــکاری لێ دێــت، نەک تەنها شیعرەکانی، بەڵکوو هەموو تەمەنی لە خزمەتی ئەم ئایدیا و فیکرە خەرج کردوە، چونکە شیعر و نووسراوەی ڕێبوار لە پێناو ئازادی و بەرابەریدا بوە، ڕاســتە ڕێبوار سەرەتا بــە هــۆی نزیکبوونەوە لە ڕەوتی ناســیۆنالیزم، بەرهەمە ســەرەتاییەکانی ئــەو شــوێنەیان پێــوە دیــارە، بەڵام تا زۆرتر دوور کەوتوەتەوە، شیعرەکانیشی دەچنە خزمەت ئــازادی و بەرابەرییــەوە، هونــەری کارگــەری، هونەری چەوســـاوەکان، یان (ڕیالیزمی سۆسیالیستی) یان بابەتی ئەوەی دەبێت بڵێم مانگرتنێکی ســـەرکەوتوو بۆ کرێکاران چەژنە بۆ سەرمایەداران شینە.

ئەم ڕێبــازە ئازادی و بەرابەری پێکــەوە دەکاتە ئامانج و مەبەســـت، نە بۆ ئازادیـــی بەرابەری فیدا دەکات، نەک بۆ بەرابەری ئازادی دەنێتە لاوە، بۆ نموونە لە شیعری (حیزبی خەباتکار)دا دەڵێت:

« له جەرگەی شۆڕشی ئێرانەوە
لەم گرو کلّپەی کوردستانەوە
لە بۆ یەکگرتن خۆ تەیار دەکەین
بانگەوازی گشت کرێکار دەکەین

* * *

دارێژین حیزبی خەباتکار!
لە پێشڕەوانی کرێکار!

لەبەرامبەر ئەو هەموو بیانوە بێ فاکتانە دەبێ بڵێم «ڕێبوار نووسین و شیعری بۆ ئەوە نەنووسیوە بە شان و باڵیدا هەڵبدرێت و سەرمایەدارانە بژی و بمرێت، نا ئەو ڕێک دەیەوێت لەگەڵ ئارمان و ئامانجەکانی خۆی ڕاستگۆ بێت، بەلام دڵنیام ڕۆژێک دێت ئەویش وەکوو (هاینریش هاینە، جەوهیل، بریێشت) وەکوو شاعیرێکی کرێکاری و شاعیری چەوساوەکان، ناوبانگی کیشوەرەکان دەبڕێت و وەکوو شاعیرێکی ئینتەرناسیۆنالی هیومانیستی چاوی لێ دەکرێت».

عەزرا پاوەند دەڵێت «لایەنی هاوبەشی هەموو شاعیرە نەمرەکان ئەوەیە، پێویستییان بەوە نییە بەرهەمەکانیان لە زانکۆ و قوتابخانەکاندا بخوێنرێت، بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمێنێتەوە، با کتێبەکانیان لە کتێبخانەکانیشدا تۆزیان لێ بنیشێت، وەلێ هێندە نابات، خوێنەری وا پەیدا دەبێت بێ ئەوەی، چاوەڕێی دەستخۆشانە بکات، شیعریان دەداتە بەر تاڤگەی ڕووناکی»، (چۆن دڵت هات جێم بهێڵی – حەمەسەعید حەسەن – 2019).

شیعر گەر وتنی واقیع بێت، نە شادی دەشێوێنێت تا لە خەم بچێت و نە خەم جوان دەکات تا لە شادی بچێت، بەڵکوو ڕاستە و ڕاست هەر خودی شیعرە بە هەموو ماناکانییەوە، ڕێبوار و شیعرەکانی سەر بەو مەکتەبەن، کە سەرچاوەی مەینەتییەکان لە سیستمی چەوساندنەوەدا دەبینن و خۆشی و کامەرانی مرۆڤیش لە سۆسیالیزمدا دەبینن، گەر لەم ڕوانگەیەوە دیقەت لە شیعری «لەم بازاڕە بێ ڕەحمەدا» دەڵێت:

«من ئەو کەسەم
هەموو ڕۆژێك
ژیانی ئەمڕۆم دەفرۆشم
بۆ کڕینی نانی سبەی
لەم بازاڕە بێ ڕەحمەدا
ژیان هەرزانترە
لە نان»

ئەم شیعرە، کە پڕیەتی لە خەم و بەدبەختی ئینسان، بەڵام نەخشاندنی ژیانە بە واقیعی و فاکت، کە مرۆڤ گەلێک وەها دەژین، ئەم شیعرە هەم دەرخستنی حاڵی واقیعی هەژارانە، هەم ڕەتکردنەوەی سەرمایەدارییە، لەم بازاڕە بێ ڕەحمەدا، هەر لە چوارچێوەی ئەم واقیعیەتەی کە ڕێبوار ژانی هەموانە و پێشەنگی قەڵەم بە دەستان و ئەدەبیاتی چەپە، دەبێت بڵێم «هیچ شاعیرێکی کورد هێندەی ڕێبوار شیعری بۆ یەکی ئایار و ڕۆژی جیهانی چینی کرێکار نەوتوە،

وەکـوو ڕێزگرتن لە ڕەنج و ماندووبوون و شـەونخونی و بەشمەینەتی ئینسانی کرێکار و زەحمەتکێش»، هەر بۆیە لە شیعری (سەد ساڵە، سەد ئایار)دا دەڵێت:

«سـەد سـاڵە
ژینـی سـەوز
بە ئاڵای ئایارم نەخشـاوە
هەشـسـەد و هەشـتا و شـەش
لە یەکـی ئایارا
پڕگـەرووی «شـیـکاگـۆ»
خـرۆشـام
بەسـیـەتی برسـیـەتی و کـۆیلـەیـەتـی!»

وەک پێشتریشـگ وتـم: ڕێبـوار لە وەرگێڕانیشـدا لەم بوارەدا پێشـەنگ بوە، بـە تایبەتی لە وەرگێرانی شـیعری شاعیرانی چەپ و هەڵگری خەسڵەتی کرێکاری.

بۆیـە لـە شـیعری (چیـدی ڕووت و ڕەجـال نابین) کە شیعرێکی (هاینە)یە دەڵێت:

«بۆرژواکـان!
بۆ ئاوازی کـڵێسـاتان،
کـەوای سـاتان
تان و پۆ زێر و زیو و ئاوریشـم
لەبەر ئەکـەن؛
کـێ ئەو کـەوای چنـی بۆتان؟؟
ئێمـەی ڕووتـی برسـی بێ-نان!»

هەروەها لە شیعری (لەشکری برسێتی)ی نازم حیکمەت کە وەری گێراوە دەڵێت:

«لەشکری برسیەتی ڕێ دەکا
ڕێ دەکا
تا زکێ نان بخوا
تا ژەمێ گۆشت بخوا»

هەروەها لە وەرگێرانی شیعری (کلووچە)ی جەوهیل-دا دەڵێت:

«مەلای ڕیش درێژ، ڕیش درێژ،
شەو بێ، ڕۆژ بێ،
لە کونەکانیان دێنەدەر
شەویلکەیان ماندوو دەکەن
لەباسی حەڵاڵ و حەرام...»

لە وەرگێرانی شیعرێکی برتولت بریشت-دا بە ناوی (لایە لایە)دا دەڵێت:

«لای لای لای لای،
سەحەر لای لای
شەوگار کردی و
من کردم، لای
شەونخوونیم پێوە کێشای
سەحەر لای لای»

واتا کۆی شـیعری وەرگێڕراوەکانی ڕێبوار ئاماژەن بۆ خەباتـی چینایەتی و هاوبەش لە سـەر زەوی، کە پڕاوپڕن لە هاوخەباتی و یەک-ئازار و یەک-مەینەتی ئینسـان، هەر بۆیە ڕێبوار لەم کارەیشـدا گەڕاوە بۆ وەرگێڕانی شـیعری شـاعیرانی ناسراوی ئەدەبی و کرێکاری و پێشڕەو، چونکە جیـا لـەوەی ئایدیا و فیکر و ئایدۆلۆژیـان لە یەک نزیک و هاوبەشـە، لە هەمان کاتدا ژانی هاوبەش و زمانی هاوبەش و شـیعر و وێنەی کرێکار و چەوسـاندنەوەی هاوبەشیان هەیـە، واتـا ئەدەبیاتـی ئینتەرناسـیۆنالی سۆسیالیسـتی، کرێکاری، ئینسانی و بەرهەقە.

بۆیـە دەکرێـت بڵێین «هەمـوو شـیعرەکانی ڕێبوار لە نموونەی بەرزی ئەو شیعرانەن، کە ئینسانی عادی، ناتوانێت ببینێت و هەسـتی پێ بکات، بەڵکوو ئەو لە فێرگەی شـیعر و ڕۆژگاری پڕ لە مەینەت فێر بوە».

لینیـن دەڵێـت «ئەگەر جاڕی شۆڕشـت دا، تـا کۆتایی درێژەی پێ بدە، ئەوانەی لە نیوەی ڕێ لە شۆڕش پاشگەز دەبنەوە بە دەستی خۆیان گۆڕ بۆ خۆیان هەڵدەکەنن».

بۆیـە دەتوانم بڵێم «ڕێبوار چەندە چێژ و تامەزرۆیی لە نووسین و شیعر وەرگرتوە، هێندەش وەرگێڕان ئاسوودەی کردوە، چونکە شـیعر دەکرێـت ویژدانێکی زیندووی ناخی ئینسـان بێت، هەر ڕێک شـیعرەکانی ڕێبـوار ڕەنگدانەوەی کەسـایەتی شـاعیرەکەیە و بـەردەوام لە سـەر ئارمان و ئامانجەکەیەتی».

بە پێی لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان یەزیدی کوڕی موعاوییە یەکەمیـن شـاعیری عەرەبییـە، کە لـە پاش هاتنـی ئاینی

ئیسلام، وەکوو شاعیرانی سەردەمی جاهیلی شیعری بە سەر مەی و شەراب و ڕابواردن و خۆشی ئەم گەردونە هەڵداوە، چەشنی ئەپیکۆریستەکانی یۆنان جەوهەری بوون و ژیانی گەڕاندوەتەوە بۆ چێژی جەستە، بەم شێوەیە یەزید بوەتە خاوەنی ڕێچکەیەکی تایبەت بە خۆی لە شیعری عەرەبیدا، کە یەزیدگەرایی پێ دەڵێن – (ڕزگار جەباری – گۆڤاری باران) من نامەوێت ڕێبوار بە یەزید بشوبهێنم، بەڵام دەمەوێت بڵێم «ڕێبوار یەکەم شاعیری سەردەمەکەی خۆیەتی، ڕێزی بۆ ڕەنج و ماندووبوونی کرێکاران و زەحمەتکێشان گێرایەوە لە ڕێگای شیعرەوە»، یان بڵێم «لانی کەم لە پێشەنگی شاعیرانی کوردە، بە جیدی و بە ڕێزەوە ستاییش و خزمەتی ئەدەبی کرێکاری کرد و خستییە سەر ڕێچکەی خۆی و مانا و مەغزای پێ دا، ئینسان کاتێک کۆی دیوانە شیعرییەکەی (بۆ ئازادی) دەخوێنێتەوە، تێ دەگات، ڕەنج و ئازاری کرێکاران نەک تێکەڵ بە شیعرەکانی بوە، بەڵکوو تێکەڵی خوێن و دەمارەکانی و هەست و شعوری ڕێبوار بوە، واتا شیعر و ئەدەبیاتی ڕێبوار مانای ئەوە نییە، قابیلی ڕەخنە نەبێت و تەنها جێگەی ستاییش بێت، نا! بەڵام لەم بوارەدا ڕێچکەیەکی تایبەت بە خۆی و ئەدەبیاتی خۆی هەیە و زیادەڕۆیی نییە دەکرێت پێی بڵێم (ڕێبوار ڕێچکەشکێن بوو)»، هیوادارم گەر بۆچوونەکانم وا نییە، بە فاکت لەو ماوە زەمەنییەدا گفتوگۆی ورد بکەین لە سەر ئەم بابەتە.

ڕێبوار لە شیعری (دوو پەیکەرە) دەڵێت:

«ڕۆڵەی شیرینم، گەنجەکەم!
بەرامەی تاڵی ڕەنجەکەم!
پەیکەرت بەرزە نابەزێ
وەك سوارێك کە دانابەزێ
* * *
لە کۆت و زنجیر بەولاوە
چیت هەبوو؟ چیت لە دەست داوە؟؟
منیش ڕەنجم کوێرەوەریم،
تاڵیم، دەردم، دەربەدەریم،
زیاتر نابێ، بە مەرگی تۆ
بۆیە وتم: ئەرێ؛ بڕۆ!
بڕۆ، بۆ ئاوڕ-دانەوە؛
بیرە-بیرە و بادانەوە!....»

بەڵام دڵنیام بۆ تێگەیشتن لەم واقیعیەتە، دەبێت شیعرەکانی بخوێننەوە و ئاشنا بن لەگەڵیدا.

نیچە، کاتێک کتێبەکانی پارەیان نەدەکرد، گوتی: ڕۆژێک دێت کتێبەکانم پارەی باش بکەن و خەڵکی ڕێزیان بگرن، وایش بوو.

من نازانم کەی؟ بەڵام دەزانم ڕۆژێک دێت ڕێز لەم شاعیرەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە شاعیری هەژاران دەناسرێت و خەڵکی تێ دەگەن، ڕێبوار لە هەموو کەس و هەندێک جار لە خۆشیان زیاتر هەست و شعوری بە نەهامەتی و نەداری ئەوان کردوە و ئەو نوێنەری هەژارانی ناو شیعر و ئەدەبیات بوە.

دڵنیـام کـە خەڵکانێکـی زۆر ڕێبوار ناناسـن، بەڵام ئەو پێوەندییـە قـووڵ و پێوەندییـە ڕۆحییـەی ڕێبـوار لەگـەڵ هاوچینەکان و هاوبەشەکانی وەکوو خۆی دروستی کردوە و پڕە لە چنگی پڕ لە گوڵە شەقایقی بەهارانە، پڕە لە موحیبەتی ناو کورەخانە گەرم و گوڕەکانی سنە و کامیاران.

ئەو موحیبەتەی ڕێبوار بۆ ژنان و کچان و پێشمەرگەی سۆسیالیست و کرێکاری زەحمەتکێشی نووسیوە، پێوەندیی ڕۆحی و ئینسانی تۆخ و تۆختر دەبێتەوە.

دەبێ بڵێـم ڕێبوار لە بـەردەم ئاڵنگارییەکی گەورەدایە، کـە دونیـای سـەرمایەداری و جیهانـی چەوسـاندنەوە و چاوچنۆکییـە، ڕێبـوار دەیەوێـت تەحـەدای ئـەو زوڵـم و نەهامەتییانە بکات، کە بە سـەر مرۆڤدا هاتوون و پێی وایە ئینسان شایستەی ژیانێکی باشتر و باشترە.

بۆیە دەبێت ئەوەیش بڵێم «لە وەسـفی عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان، پاش مردنی سەید عەباس ساڵحی - وەزیری ڕۆشنبیری ئێران، گوتی: کاتێک چیرۆکەکانی ئەوم خوێندەوە، بە تەواوەتی هەستم بە تامی هەژاری و نەداری کرد...!».

ڕێک ئەم دێرە بۆ ڕێبواریش هەر وایە، کاتێک شیعرەکانی ڕێبـوار دەخوێنیتـەوە، هەسـت بـە هـەژاری و نەداریی و هەسـت بە ڕەنجی کرێکاران و بەشمەینەتی ژنان دەکەیت، بەڵام بەداخەوە وەزیری ڕۆشـنبری ئەمەی بە ئێمە نەوت، بـەڵام دڵنیا بن ڕۆژێـک دێت، ڕێبواریش وەک (سـەمەدی بەهرەنگی، سـادقی هیدایـەت، هەمنگـوای، ئۆرجینا ئۆلف، نیچـە، نازم حیکمەت...) دەچێتە نـاو ئەدەبیاتی جاویدانی و سەرمەدی و یادی دەکرێتەوە.

هەر چەندە من لەم نووسینەدا زۆر باسی ئەدەب و هونەری کرێکاری و چینایەتیم کرد، بەڵام وەکوو ڕێبوار خۆی دەڵێت «ئایا هونەر چینایەتییە؟ مادام هونەر بەشێکە لە کەلتوور، یان بەشە مەعنەویەکەیەتی، چۆن زانست و هونەر و فەلسەفە و ئایدۆلۆژیا لە بەشی مەعنەوی (کەلتووردان) ئاشکراتریش هونەر و شیعر و ئەدەبیات، کە زیاتر مۆرکی هەست و هۆشی ئینسانی پێوەیە، یان دووبەرەکی چینایەتی کۆمەڵگای تێدا بەرجەستە دەبێت.

بۆ نموونە شیعری (بۆ ڤیکتۆر خارا)ی ڕێبوار لەساڵی (1983)دا کە دەڵێت:

«ئێمەیش لێرا،
ڤیکتۆر خارا،
گۆرانیمان ئاگراوین
ئاسایی نین!
* * *

با لەم شاخە بەرزانەوە
لە ناو شنەی شۆڕشی کوردستانەوە
لە بەربینی توند گوشراوی
کارگەرانی ئێرانەوە
تا ژێر چەکمەی پینۆشەی سەرکوتکەری تۆ ...»

لەم شیعرەدا دەربڕینی هەستی چینایەتی هاوبەش بە گەرمی دەبینرێت، ئەمە ئەو کاتەیە کە ئەنگۆستۆ پینۆشەی دیکتاتۆری چیللی لە ڕێگای کودەتایەکی سەربازی بە پشتیوانی ئەمریکا، دەسەڵاتی ئالیندە، سەرۆک-کۆماری

ڕووخاند و «ڤیکتۆر خارا»، هونەرمەند و گیتار-ژەنی چەپ و کۆمۆنیستی خستە بەندیخانە و گیتارەکەشیان شکاند و ...، واتا ڕێک دیوە مەعنەوییەکەی کەلتوورە، کە هەست و سۆزی ئیحساسە، بەڵام هەستێکی ئینسانی و چینایەتییە، وەکوو دوو کۆمۆنیست و دوو داکۆکی سەرسەختی خەباتی کرێکاری و سۆسیالیستی.

ڕێبواریش وەکوو چۆن بتهۆڤن بە مۆسیقا خەونی ئازادی خوڵقاندوە و شکسپیر چۆن شاکاری هونەری بۆ ئازادی دەخوڵقێنێت، ئاوەها دەیەوێت شیعر و ئەدەبی چینی کرێکار بخوڵقێنێت، بۆیە ڕێبوار خۆی لە وەڵامی ئەدەبی هونەری چینایەتی یان هونەری کارگەری چی یە و کامەیە؟ دەڵێت «کەلتووری ئێمە، بۆیە بەرهەڵستی هەموو ئەفیونێکی هۆشبەر دەبێتەوە و ژیان وەک تاقە مەودای خۆشی و شادی دەبینی و خۆشەویستییەکی بەرین دەخەملێنێت، کەلتووری ئێمە خۆی نابەستێتەوە بە ناموس پەرستی و بەند و باری یاسای کۆنەوە، جوابی ڕەسم و ئایین و یاسای سەرمایەی کۆنەپەرست ناداتەوە و ئاواتی نزم ناکاتە ئاسۆی جەماوەر، کەلتووری ئێمە بە هەر دوو باڵی زانست و هونەر، دەفڕێ و بەرەو ئاسۆی ڕزگاری یەکجاری، بەرەو ئاسۆی ئازادیی هەموان دەمان هەژێنێت، بۆیە پێویستیمان بە ڕوانگەیەکی زانستی و کۆمۆنیستی تیروتەسەل هەیە! مەبەست لە ڕوانگەی کۆمۆنیستی، دینامیسمێکی پێشڕەوە، لە کارگەری وشیار و ئینسانی داهێنەر، کە بە هیچ شتێک کەمتر لە ڕزگاری یەکجاری لە هەرچی ستەم و چەوساندنەوەیە ڕازی نابێت».

بۆ نموونە لە شیعری (سەد بەهار بە شوێن مارکسدا) بە بۆنەی سەدەمین بیرەوەری مەرگی مارکس لە 14 ی مارسی (1983) دەڵێت:

«هاوڕێ!
هۆزان!
مەزن!
رابەر!
هاوڕێ مارکس!
سەد بەهارە بە جێت هێشتووین
سەد بەهارە
سەد بەهاری
پڕ لە هەڵسوکەوت و خەبات،
کەوا سیمای دلێرانەت
پیری پسپۆڕ!
گەشترین و ڕوونترین ئەستێرەمانە
بەرەو ئاسۆی
گەش و ڕوونی سۆسیالیزم
بەرەو ئاوات»

هەروەها دەڵێت «لەبارێکی دیکەوە ئەم کەلتوورە هاوعومری خەباتی چینی کرێکارە! بۆیە من لەگەڵ ئەوانەم ،کە بەم کەلتوورە دەڵێین (کارگەری)، کەلتوورێک کە بە دووباڵی هەستی بێ سنوور و زانستی کۆمۆنیستی ئەو چینە، دەفرێت هەر لە سەرەتای مێژووی ئینسانییەوە، خەریکی بنج بەستن بوە، بەڵام لەم دوو سەدەی دواییدا

گەشــەی کردوە. کەســانی وەک (هاینریش هاینە، ماکسیم گۆرکی، برتولد برێشت، ئاراگون، جەوهیل و نازم حیکمەت) چەند ئەستێرەیەکی ئەم ئاسمانەن ئیتر با، شکسپیر و حافز و هــەزاران دونــدی فەرهەنگــی بە شــەریش، بــە میراتی ئینسانی، پێش هاتنە مەیدانی چینی کرێکار دابنێن».

بۆ نموونە لە شیعری (دەریای جەماوەر)دا دەڵێت:

«یاخــی بوە
دەریای بەرین
دەریای بەرینـی جـەماوەر
هێزی سـامـدار
وەك شـەپۆلـێكـی پڕ خـرۆش
ڕادەچـەنـێ
ئاسـمان و ئـەرز ئـەلـەرزێنـێ
تـەماشـای ئـەم سـەما بكـەن
ئـەم مـۆسـیقا تونـدە ببیـەن
ئـەی ئـێوە هـێشـتـا بـێ خـەبەر!
ئـێسـتا ئـەبـێ چاك تـێ بگـەن
كـە جـەماوەر
خـەریكـی چـی خـولـْقـاندنـە
دەریا.....»

هەروەهــا دەڵێت «ئەم هونەرە، ڕێگریشــی هەیە. یەکەم بەرهەڵستمان چینی ستەمگەرە کە لە سەرانسەری مێژوودا خەڵکــی بە شــەوارە خســتوە و لــەم ســەدانەی دواییدا لە پەیکــەری ســەرمایەداریدا خــۆی دەنوێنــێ و دەیناســین، کــە دەمێکە ئیتر ڕێگری ئازادی ئینســانە، کە دەســەڵات و میدیا و ســامانی کۆمەڵگای بە دەستە و دەتوانێت هونەری

چەواشــە بڕازێنێتــەوە و بــە چەق و لــووری دژ بە ژن و دژ بــە ئازادی و بەرابــەری، کۆمەڵانی خەڵک بە شــەوارە بخــا، بۆیــە ڕێبازی ئێمە پێویســتە میلیتانت بێ و بچێتەوە بەگژ نەریت و کەلتووری بورژواییدا، کەلتوورێک کە ئێستا خەریکی زیندووکردنەوەی پرتووکاوترین دابونەریتی چینە کۆنترەکانیشە و هیچ نیشانەیەک لە ئازادی و ئازادیخوازی ســەدەکانی پێشــووی پێوە نەمــاوە، نابێــت بتوانێت چیدی ڕێگر و ڕێونکەر بێت».

بۆ نمونە لە شیعری (بیهێنە پێش چاو) تەرجەمەی ئازاد لە گۆرانی ئینگلیزی (imagin)دا دەڵێت:

«بی هێنە پێش چاو ڕۆژێك بێ
هەموان هەموو شتێكیان بێ
ئاسانە ئەگەر تێیفكری
هیچ شتێك موڵكی كەس نەبێ!
بیهێنە پێش چاو كە هەموان
هەر بۆ ئەمڕۆ بژین،
یەكسەر...«

کاتێــک دەڵێین «کەلتووری کارگەری، مەبەســتمان ئەم کەلتــوورە ئالترناتیوەیە، کە بەشــێکە لــە خەباتی مێژوویی چینــی کرێکار بــۆ ڕزگاری هەموان. بۆیــە جێگای خۆیەتی کــە هونەر لەم ڕوانگەیەوە ســەیر بکرێــت و بەم پێوانەیە، ڕەخنەی لێ بگیرێت».

جارێکی تریش ڕێبوار خۆی لە وەڵامی پرسیارێکی مندا دەڵێت «من خۆم بە شــاعیرێکی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی

و کرێـکاری دەزانـم»، لە بارەی ئەو بـاوەڕ و مەبدەئەوە زیاتـر دەڵێت «ژن نیوەی کۆمەڵە، مرۆڤەکان نیوەیان ژنن و نیوەیـان پیاون. لە ماف، بایەخ، ڕێـز و حورمەتدا، ژنان بەرابەر و یەکسانن لەگەڵ پیاوان. ئەمە بۆچوونێکی تایبەت بە من نییە. ڕێبەرانی کۆمۆنیسـت، ئازادی و بەرابەری ژن بـە ئاوێنەی ئازادی و بەرابەری کۆمەڵ دادەنێن. کۆمەڵێک هەر ئەوەندە ئازادە، کە ژنەکانی ئازادن، ئێمەی کۆمۆنیست سـەبارەت بەم پرسـە، کۆمەڵێـک کتێـب و لێکۆڵینەوەمان هەیە. ئەو هەست و هەڵوێستانەی من لە شیعرەکانمدا دەرم بڕیون، پێداگرتنێکی تازەیە، لە سـەر ئەو هەڵوێستانە و بە هیوام ڕێبوارانی ئەم ڕێبازە گەلێک لەوەیش زیاتر بکەن».

بۆیە لە شیعری (با هیچ خەمی ڕێی پێ نەگری)دا دەڵێت:

«با هیچ خـەمێ
ڕێـی پـێ نـەگـرێ
نەڕۆمـەڵـخـەزای شـاران و
نە بۆمبارانـی هـەڵـەبجـە و
نە جـەهـەنـنەمـی جـەبهـەکـان
با هـیـچ خـەمـێ ڕێـی پـێ نـەگـرێ
جـەژنـی شـادی «ئایار»ە دێ
نە بێـکـاری
نە برسـیـەتـی
ڕەنـگ زەردی مـنـاڵـی پـەتـی، ....»

ڕێبـوار بۆ سـەلماندنی ئـەم لێکۆڵینەوەیە کە شـاعیری چینـی کرێکارە لـە وەڵامی ئەو پرسـیارەدا دەڵێت «هەموو دەرد و ژانـی کۆمەڵایەتی ڕیشـەیان لە سـتەمی چینایەتی

دایە، لە نەداری و نابەرابەری و ستەمێک دەوەشێتەوە کە ئەم سیستمی (کۆیلەداری کرێگرتە) سەپاندوویەتی بە سەر زۆربەی جەماوەردا.، بۆ نموونە: ئەمڕۆ ئیتر لای گەلێک کەس ئاشکرایە، کە زوڵم و زۆر لە ژنان دەکرێت، کە لە بەرژەوەندیی سەرمایە و چەوساندنەوەی خۆڕایی ژنان لە زیندانی خێزاندا دەوەشێتەوە، تەنانەت ئێشوئازارێک کە دێتەڕێی دڵداری و ئەو هەموو گۆرانی و شیعرەی لێی دەبێتەوە هەر لە نەداری و نابەرابەری و مەزهەب و سوننەتی کۆن دەوەشێتەوە، کە لە خزمەتی ئەم سیستمەدایە. ئەمانە و هەزاران دەرد و ستەمی تر، بە سیستمی نابەرابەری سەرمایەدارییەوە بەندە. من و هەڵسوڕاوانی ئەم ڕێبازە هونەرییە، بە ڕەنگدانەوەی ئەو دەرد و ژانانە، ڕێگای ڕامالینی هەموو مەینەت و دەردەکان خۆش دەکەین، بە سەرکەوتنی خەباتی چینایەتی و بە ئازادی مرۆڤ لە چەوساندنەوە، ڕێگا بۆ چارەسەری هەموو دەرد و ژانەکان خۆش دەبێت، بۆیە خەمخۆری بۆ ئەم خەباتە، خەمخۆریێ بۆ ڕزگاریی مرۆڤ لە هەموو ئێش و ئازارێک، دیاریشە من، وەک تاکە کەسێک، فریا نەکەوتووم هەموو ئەو ئێش و ئازارەی دیومە و ناسیومە، وەک بەرهەمی هونەری پەروەردە بکەم».

چینی کرێکار و زەحمەتکێشان لە کوردستانیشدا سەرباری مەحرومبوون، بێبەشن لە دەستەبەری ژیانێکی باشتر و بەهرەمەندتر، بەڵام بەردەوام بەرەوڕوون لەگەڵ فەقیری و هەژاری، بەڵام لە ناو بگرە و هەرا و زەنا و ململانێی چینایەتی کۆمەڵگا، جیا لە ڕەهەندە سیاسییەکەی، ڕەهەندی هونەری و ئەدەبیشی هەیە، کە ئەوەی لێرە و لە

ناو باسی ڕێبوار هونەر ئەدەبی کرێکارییە، کە پانتاییەکی فراوانی ناو شیعرەکانی ئەوی داگرتوە.

بۆیە لە شیعری (یەکی ئایار)دا دەڵێت:

«ئاخر ئەمساڵ
دەیان و سەدان...
هەزاران ئیعتسابمان بە دەستەوە
سەدان جار دێینە خیابان
تێ چریکێنە سرودی یەکی ئایار
ئاخر ئەمساڵ
دەیان هەزار هێرش و هەڵمەت دەبەینە
سەر کۆیلەیەتی
لە کۆریا ئەفریقا ئالمان
ئینگلیز ئامریکا لە هستان
لە هەر شوێنێك دەستمان بڕوا
ئاڵقە ئاڵقەی ئەم زنجیرە
ئەپچڕێنین»

دەیەی حەفتا و هەشتاکان وەکوو چۆن مەیل و گەرایشی سیاسی چەپ و مارکسیست وای کرد بوو، کە کورد و حزبە سیاسییەکان لە ناو بلۆک و میحوەری سۆسیالیست و چەپ و کرێکاری خۆیان ببیننەوە و باوەڕیان بەوە هێنا بوو کە ڕەوتی چەپ و بزووتنەوەی سۆسیالیست، مارکسیست و ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی مارکسیست – لینینیست – مائویست، خەتی سێ، ڕەوتی ئەلبانی و کوبی، دەکرێت وەکوو پێشەنگی خەباتی حەقخوازی کورد بۆ مافەکانی چاویان لێ بکرێت.

ئەو ڕەوتە سیاسییانە پێیان وابوو «لە بەرانبەر هەموو ئەو بۆچوون و ڕەوتە هونەرییە بۆرژوازیی و وردە بۆرژاوازییەدا کە هەن، لە بەرانبەردا دەبێت هونەری کرێکاریش هەبێت، وەکوو ڕەوتێکی هونەری دیاریکراو و ئامانجدار، کە لە ڕوانگەی جیهانبینی و بەرژەوەندیی چینی کرێکار و بزووتنەوەی سۆسیالیستی دەڕوانێتە هونەر، پێویستە بێتە مەیدان و پرۆلیتاریا و ئەو هونەرمەند و شاعیر و نووسەرانەی سەر بەم چینەن، واتا سەر بە پرۆلیتاریان، دەبێت لە بەرەی هونەر و ئەدەبیشدا دژی ئەو چینەی بۆرژوازییە خەبات بکەن».

لە شیعری (بم توانیایە)دا دەڵێت:

«بم توانیایە
بە تۆڕێك خۆرەتاو بگرم
لە نێوەڕاستی ئاسمانا
قەتیسی کەم !
بم توانیایە
هەر ئێستاکە
هەموو بانگەوازەکانی مارکس و لینین
بە شیعری خۆش
بە گوێی دڵانی موشتاقی
بەش مەینەتانی سەر زەمین
بگەیەنم...»

گەر دیقەت لە کار و هونەر و ئەدەبیات و شیعر و سروود و گۆرانی ئەو کات بدەین، ڕێک هەموو شتێک لەوانە ڕەنگ و تام و بۆی چینایەتی لە خۆ گرتبوو، پێیان وابوو

دەبێت گۆرانییەک بخوێنن کە نەهامەتی و ڕەنج و کاری کرێکاران بچرێنێ. دەبێت گەر شانۆگەرییەک نمایش بکرێت، باس لە ستەمی سەرمایەداری و بێبەشی زەحمەتکێشان بکات. گەر ڕۆمان و نۆڤلێت و چیرۆکێک بنووسن، دەبێت کارەکتەرەکانی ڕەمز و سیمبوڵ و ڕووداوەکانی لە خزمەتی کرێکار و هەژاران و زەحمەتکێشان بێت، ئەوانە ئەگەرچی ئەدەب و هونەرێکی ئینسانی و ویژدانی بوە، بەڵام هەندێک جار زیادەڕۆیشی تێدا بوو، بەڵام زۆربەی کات دەستی دەخستە سەر برینەکان جەدەل و نیقاشی زۆر لە بارەی ئەم هونەرەوە دەکرا، بەڵام هەبوون پێیان وابوو، پێکهاتنی دەرفەتە بۆ بڵاوکردنەوە و ناساندنی ئەو بەرهەم و کارە هونەرییانەی کە لە پێناو ژیان و خەباتی چینی کرێکار و جەماوەری زۆ لێکراوانە.

بۆیە بە تایبەت گەر سەیری شیعرەکانی لە نووسینەکان، لێکدانەوەکان، ڕەخنە، نەقدەکان، سەرنج و بیروبۆچوونەکانی ڕێبوار بدەی لەوکاتانەدا، ڕێک هەر ئەوەی دەوت و یان وردتر بڵێم پێی وابوو هونەر و ئەدەبیاتی پێشڕەو، هونەر و ئەدەبیاتی کرێکاری، ئەو بەرهەم و کار و نووسینانە دەگرێتە خۆ، کە ڕەنگدانەوەی ئەدەبی و هونەری ژیانی واقیعی، ئامانجەکانی هەست و سۆز و عشق و خۆشەویستی، مەینەت و کوێرەوەی، کۆڵەواری و بێبەش و خەبات و فیداکاری زۆربەی زۆری کۆمەڵانی کرێکاران و بێبەشەکانن.

هەروەها لە شیعری (داستانێکی زستانە) لە وەرگێرانی شیعرێکی - هاینە - هەر بەم ناونیشانە دەڵێت:

«هاوڕێکانم !
من ئەمەوێ
گۆرانییەکتان بۆ بڵێم
گۆرانییەك
نوێ تر
خۆشتر لەوانی زوو
ئێمە هاتووین
هەر ئێستا و
لە سەر ئەم زەویە،
بەهەشتی بەرین بونیاد نێین !»

بۆیە ڕێبوار ڕەنگە جیا لە زۆربەی ئەو شاعیر و ئەدیب و نووسەرانەی سەردەمەکەی خۆی وەفادار مایەوە بەرانبەر بەڵێن و نووسین و ئارمان و ئامانجەکانی.

ڕێبوار، یەکێک لەو پێشەنگانەی شیعر و ئەدەبیاتی کرێکاری و پێشڕەوە، کە نەک هەر دیفاعی لەو ڕێچکە و ڕێبازە کرد، کە باو بوو، بەڵکوو دواتریش لە ناو جەرگەی دڵی مۆدێرنەی ئەورووپاش جەسورتر و وەفادارتر لە مەیدان مایەوە، چ وەکوو کارەکتەرێکی سیاسی لە ناو بزووتنەوەیەکی چەپ، چ وەکوو شاعیرێکی چەپ و کرێکاری ئیدامەیدا و یەک تۆزقاڵ سازشی لە سەر مبادی و هەڵوێستەکانی نەکرد، وەکوو خۆیشی دەیوت لە هیچ کام لە شیعرەکانی پەشیمان نییە، کە لە هەلوومەرجێکی تایبەت نووسراون، بە عەزم و ئیمانی کۆمۆنیستی وتراون و عەهد و پەیمانیان بەستوە.

هەر بۆیە لە شـیعری (لەگەڵ دەریای شـینی پوشكین)دا دەڵێت:

«لە یەكەمین دیدارم دا
لەگەڵ پوشكین،
تەماشام كرد
ئەو شاعیرە
دەریایەكە شین و بەرین
نزیكەوە بووم
بە یادی
ڕۆژانی ڕەنگینی لاویم
خۆم هاویشتە باوەشی شینایی زەنگی
بەڵام ئەبینم كە جێ جێ
ئەو دەریایە
بێ بن نییە ...»

ڕێبـوار پێی وابـوو، ئـەدەب و هونەری كرێـكاری، ئەو هونەرە ڕەسەن و بەشەرەفانەیە، كە لە بازاڕی ڕەنگاوڕەنگی هونەر فرۆشـیدا خۆیـان نادۆڕێـنن و هونەرەكەیان لەگەڵ بزووتنەوەی بەرینی چینی كرێكار و لێك گرێ دەدەن.

* * *

بۆیە هەر لەو سەردەمەدا، كە ڕێبوار یەكێك بوو لە بونیاد گوزارانـی ئەو ڕەوتە چـەپ و كرێكارییەی ئەدەب و هونەر، لـە ژوئیەی (1985) یەكێك بوو، لە دەسـتەی دامەزرێنەری كانوونـی هونـەر و ئەدەبیاتـی كرێـكاری كوردسـتان، كە ئـەم كانوونە پێڕەوی خۆی هەبوو تێـی دا هاتبوو ئامانجی پەرەپێدانی هونەر و ئەدەبیاتی كرێكارییە.

دواتریــش هــەر لــە پایــزی (1985)دا، ئــەم کانوونــە گۆڤارێکــی دەرکرد بە ناوی (پێشــەنگ) و ڕێبوار لەوەشــدا لە بونیاد گوزارانی بوو، کە پێشــەنگ لەو کاتەدا ســەدایەکی گەورەی هەبوو، توانی جەمعێکی زۆر لە نووســەرانی چەپ و کۆمۆنیســتی خاوەن ئایدیای هونەری کرێکاری لەم دیوو و لــەو دیــوو لــە خۆ بگرێــت، کە تــا ئاخیــر (16) ژمارە و یەک پاشــکۆی لێ چاپ کرا، بە ســەدان شــیعر و چیرۆک و لێکۆڵینەوە و شانۆیی کرێکاری و هونەری شۆڕشگێڕانە.

بــە چەند ســاڵێک پێــش ئەم کانوونــە، (تیپی مۆســیقای بانگەواز) لە شــاری ســنە، پێــک هاتبوو؛ دروســت کرد، کە جیا لەوەی ئەوانە هونەرمەند و ســرووودبێژی خۆشەویستی کۆمەڵــگا بوون، بەڵام خاوەنی ئەدەبی کرێکاری و پێشــڕەو بوون لەوانە: (کاڵێ، کە بە پێشــەنگی ســرووودبێژی شۆڕش و ســرووودی کرێــکاری و چینایەتــی ناســراوە)، (ناســری ڕەزازی، نەجمــەی غوڵامی، ڕەزا بچکــۆل، بەکری لەگزی...) جیــا لەوەی ئەوکات چەند کاســێتی هونەرییــان دایە دەر و دەور و کاریگەری گەورەی لە سەر کۆمەڵگا دانا، کە تا ئەو کاتە هێندە ســرووودی گۆرانی هەڵگری ئەو خەســڵەتانە بڵاو نەبووبووەوە و هەر کام لەو هونەرمەندانە تا ئێستایش وەکوو خوێندکاری ئەو مەکتەبە فیکریی چەپ و ڕادیکاڵە چاویان لێ دەکرێت، کە بەرهەمی پێشــکەوتن و پێگەیشتنی ئەو کانوون و ڕێچکــە و ڕێبازە بوون، کە ڕێبــوار و هاوبیرەکانی دایان مەزراند، جگەلە کۆڕی شــانۆش کە هەر ســەر بەم کانوونە بوە بە تایبەتی ڕۆڵی وریا نازری لەم بابەتە زۆر گرنگبوو.

هــەر ئەو کاتە لە ناو ئەو ململانێی فیکر و ئیدۆلۆژییانەدا

بــوو، کە کانوون ئــەوکات باوەڕی پێی بــوو، ڕێبواریش لە ناویاندا بوو، لە پاشکۆی ژمارە (12)ی پێشەنگ کە لە (مەی 1991) بــڵاو کراوەتەوە، جەدەلێکی گرنگی هێنایە کایەوە لە نێوان ســتافی کانووندا، لە ســەر ئەوەی ئایا ئەوەی کانوون پەخشــی کردوە تەنها و تەنها ئەدەبی کرێکاری و پێشــڕەو بــوە؟ یــان تێکەڵەیــەک بــوە لە نێــوان ئەدەبی کرێــکاری و جیێبوونەوەی ئەدەبی ناسیۆنالیستی و بۆرژوازی؟

هەر ئەوەیش بوو وای کرد لە پاشــکۆی پێشەنگی ژمارە (12)دا ســەروتاری گۆڤارەکەی ئاوا نووسرا بوو «کانوون هــەر لــە ســەرەتاوە دوو ئامانجی هەبوو، یەکــەم: پەرەدان بــە بزووتنەوەیەکی داهێنانی ئەدەبــی و هونەری کرێکاری. دووهەم: پەرەدان بە ڕەخنە لە سەر تیۆری مارکسیستی».

ئەمەیــش واتــا پارادۆکس لــە ڕووی فیکرییــەوە، دەبێت بڵێــم «خــودی جەدەلەکــە ڕێبوار دروســتی کرد بــە ناوی (ناســیۆنالیزم لە پێشــەنگدا چی دەکا؟)، گوتی: ناســیۆنالیزم شــەریکە ماڵی پێشەنگە»، خۆیشی گوتی: ڕەنگە کەسێک بڵێ ناســیۆنالیزم تەعبیرێکی سیاســییە، بە هونــەر چی؟ دەڵێت «یەکێک لە نیشــانەکانی بۆچوونی ناسیۆنالیســتی کاتێک لە ژێــر ئیدیعای کۆمۆنیزمــدا خۆی دەشــارێتەوە، هەر چەندە بۆچوونەکانــی ڕێبــوار و بــژار لــە هەمبــەر ئــەو ڕەخنە و بابەتــەدا و وەڵام بــە ڕەخنەکانــی ئەویش لــە بابەتی بازگر و شــەبەق و ناســری حیســامی، هەر لەو پێوەندەدا سەری هەڵدا، کە ئاوێتەبوون لەگەڵ بەحس و بابەتە سیاســییەکانی پێوەند بە خیلافاتی سیاسی نێو ڕەوتە سیاسی حزبییەکەوە،

واتـــا ململانێی نێوان باڵی مەنســـوری حیکمەت (کۆمۆنیزمی کارگەری) و باڵی عەبدوڵڵای موهتەدی و ئیبراهیمی عەلیزادە، کە مەنســـووری حیکمەت بە ناسیۆنالیســـت ناوی دەبردن و ئەم ناکۆکییانە ڕەنگدانەوەی لە ســـەر تەفســـیری سیاسی و ئەدەبی و ئۆردوگا، تەشکیلات و کۆی پرۆیسی حزبەکە دانا و دواتریش ئاکامەکەی ئینشیقاقی لێ کەوتەوە».

بـــەڵام ئەوە بەو مانایە نییە، کـــە جەدەلی ئەدەبی کرێکاری ناسیۆنالیســـتی پێشـــڕەو نەبوو. بەڵێ هەبوو، بەڵام بەو شکڵە پەرەی نەگرت و هەڵ نەکشا، بەڵکوو ڕێبوار پێی وابوو بابەتی (دە ســـاڵ دوای کاک سوارە) قسەکردنە لە سەر ناسیۆنالیزمی کورد و ڕادیکاڵیزمی شۆڕشگێرانە لە وردە بۆرژوازی نیسبەت دەدا، کە دیارە مەبەســـتی ســـەلاحەدینی موهتەدییە، دواتریش ڕەخنە دەگرێت لە دوو بابەتی (گڵکۆی تازە یار) و (کوا وەختی بـــوو)، کـــە یەکەمیان پەخشـــانێکی ســـەلاحەدینی موهتەدییە و دووهەمیان شـــیعرێکی شـــێرکۆ بێکەس (جوامێرە) بۆ مەرگی د.جەعفـــەر شـــەفیعی، ڕێبـــوار لـــەم بارەیـــەوە دەڵێـــت «هەر دووکیان بۆنی ناســـیۆنالیزمیان لێوە بەرزە»، ڕێبوار لە وەڵام بە ڕەخنە لە شیعرەکەی شێرکۆدا دەڵێ «سیمای د. جەعفەری کۆمۆنیست، نەک هەر وەکوو پێشڕەوێکی کۆمۆنیست، بەڵکوو وەکوو شۆڕەسوارێکی کورد نیشان دەدات».

لە ڕەخنە بە ســـەلاحەدین موهتەدیشـــدا دەڵێـــت «پڕە لە زەبوونی و گەورەکردنەوەی مەینەت....».

هەر چەندە ناسری حســـامی هەر لەو ژمارەیەدا وەڵامی ڕەخنەکانی ڕێبواری داوەتەوە، بەڵام دواتر بژاریش دەســـت

لەکارکێشانەوەی خۆی لە پێشەنگ ڕادەگەیەنێت، بە بیانووی ئـەوەی ئەو گۆڤـارە ناتوانێت خزمەت بـە ئەدەبی کرێکاری بکات. لەم بارەیەوە سـەرنجتان بۆ بۆچوونێکی مەنسووری حیکمەت ڕادەکێشـم، سـەبارەت بە مەرگی ئەحمەد شاملوو لە بارەی ئەوەی، ئایا شـاملوو شـاعیرێکی چەپ و ڕادیکاڵ بـوە، یان نا؟ حیکمەت لەم بارەیەوە دەڵێت «شـاملوو ئەلگۆ و سـیمبوڵ و چـرای سـەر ڕێـی بزوتنـەوەی ئێمـە نەبوو (بزووتنـەوەی کرێـکاری کۆمۆنیسـتی)»، هەروەهـا دەڵێت «ئەندامـی هیـچ بزووتنـەوە و ڕێکخراوێکـی ڕادیـکاڵ و ئینساندۆست نەبوو، لە بەرهەمەکانیدا سەبارەت بە حیجابی ئیسـلامی، مافـی منداڵ، بیمـەی بێکاری، قەدەغـەی ئیعدام، سیسـتمی نوێی جیهان، گەمارۆی ئابووری سـەر بە عێراق هیچ هەڵوێستێکی نەبوە».

ڕەنگە ئەم بۆچوونەی مەنسوری حیکمەت ڕوو بە شاملوو لـەوەوە جێگەی سـەرنج بێت بۆ ئێمە، کە ڕێـک پێچەوانەی شـاملوو هەموو تەعریف و پێناسـەکانی بە باڵای ڕێبوار و شیعرەکاندا دەبڕێت.

ڕێبـوار، جیا لـەوەی هەر لە سـەرەتای ژیانییەوە لە ناو بزووتنەوە و ئەحزابێکی سیاسـی و ڕادیکاڵ و ئینساندۆست و بونیادگـوزار و ئەنـدام بـوو، بەڵکـوو لەگـەڵ هەمـوو هەلومەرجێکی دژوار بەرەو ڕوو بوە، لەگەڵ هەموو ڕەنج و ئازارەکانی کۆمەڵگا، ناعەدالەتی دەنگی هەڵبڕی.

دەنگـی هەڵبـڕی، شـیعری ڕێبـوار نزیک نزیـک بوو لە ترادیسـیۆن و ئەلگۆی مارکسیسـتەکان بـوو، یەک ئامانجی

بوو، شیعر و ئەدەبیاتی ڕێبوار مەیدانی داهێنان و تێگەیشتنی فەردی نەبوو، بەڵکوو ژانی هاوبەشی هەموو کرێکاران بوو.
مەنسوور حیکمەت لە بارەی ڕانەگەیاندنی ڕەئی حزبی ئەوان بۆ مەرگی شاملوو دەڵێ «حزبی ئێمە کاتێک بەیاننامەی ڕادەگەیاند گەر شاملوو (نە) یەکەی پراکتیزە بکردایە، بۆ نەبوو؟ بەڵام گەر شاملوو شاعیرێکی کۆمۆنیست بوایە چی؟»
حیکمەت دەڵێت «دەبێت ناودارانی کۆمۆنیست بەرز ڕابگرین»، بەڵێ ئەو گەر کەسێکی کۆمۆنیست بووایە، ڕاگەیاندنمان دەدا، بەڵام شاملوو ناسیۆنالیست و ئێران دۆست بوو، نەک هەر ئەوە، بەڵکوو شاملوو مەرگی کۆمۆنیزمی ڕاگەیاند بوو، شاملوو ئەدیبێکی باش و نەتەوە پەرست بوو، بۆیە هەمان بزووتنەوە بۆی هەیە بە ئازیزی خۆی بزانێت.
حیکمەت سەرەڕای مخالیفبوونی حزبەکەی بۆ ڕاگەیاندن، بەڵام دەڵێت «شاملوو کەسێکی خۆشناو و بەڕێز و ئینسانی بوو، ئەم جۆرە ئینسانانە دەوڵەمەندی بە کۆمەڵگا دەبەخشن»، بەڵام شاملوو چرای سەر ڕێی بزووتنەوەکەی ئێمە نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگر نیم لەوەی هاوڕێیان خۆیان بە ئیمزای خۆیان، کار و بەرهەمی شاملوویان هەڵسەنگاندایە، بە بۆچوونەکانی مەنسووری حیکمەت، بۆیە باشترە لێرەدا بڵێم «ئەم پێناسەیە بۆ ئەدەبیات و شیعری ڕێبوار گونجاوە»، بە بیانووی ئەوەی ڕێبوار نەک هەر هەموو (نە) یەکی بە سیستمی سیاسی و ترادیسیۆنی جامعە گوت و پراکتیزەی کرد و دەنگی هەڵبڕی، هەرگیز ئامادە نەبوو لە کۆشک و ڤێلای تاران دابنیشێت و ستەم و زوڵم قەبووڵ بکات، بەڵکوو نیوەی ژیانی ڕێبوار لە ژێر خەیمە

و هەرزاڵـی گونـد و لادێکانی کوردسـتان بە سـەر برد، لە ژێـر تەپوتۆزی تۆپ و خومپارە و بۆردومانی بێبەزەییانەی تەکنەلۆژیای مۆدێرنەی ئەورووپا و ئەمەریکا»، دەیان ساڵ خۆیشی پێشمەرگە بوو.

ڕێبوار، ڕێک کۆمۆنیسـت، ڕێک شـوێن ڕێچکەی برتولد برێشت، جەوهیل، هاینریش هاینە کەوت.

ڕێبوار، لەمسـی هـەژاری و نەداری و نەهامەتی و کرێی زۆرە ملـێ، کاری مەزرا و چەوسـاندنەوەی ژنان و ناهەقی مەلای مزگەوت کرد، لەمسی خەباتی چەکداری کرد، لەمسی زینـدان و ئەشـکەنجەی کـرد، لەمسـی ژیانـی کولەمەرگی و نەبوونـی و زەبونـی کـرد، لەمسـی هاوپشـتی خەباتـی ئینتەرناسیۆنالی کرد، لەمسی خەباتی پێشمەرگانەی کرد.

بۆیە لە ژیانی ڕێبوار و لە مەرگی ڕێبواریشـدا، وەزیفەی حیزبی سیاسـی دەبێت، بەڵکوو ئەرکێکی هونەر دۆستانە و ئەدەب دۆسـتانەیش دەبێت، چونکە مبارز و کادر و ڕادیکاڵ و پێشـمەرگە بـوو لەپـاڵ شـیعر و ئەدەبیاتـی کرێکاری و چینایەتی.

بۆیە ویسـتم بڵێم «بۆچوونەکانی مەنسـووری حیکمەت تا ئەم سـاتەیش ڕوو بە لێکدانەوەی شـیعرەکانی شـاملوو و ڕێبـوار مەنتقییە و پڕبەپڕی شـیعرەکانی ڕێبوار دەشـێت و دەلوێـت، چونکـە ڕێبوار خۆیشـی نایشـارێتەوە کە نەک ناسیۆنالیست نییە، بەڵکوو کۆمۆنیست و ڕادیکاڵە و ئەمەیش بە سەر زۆربەی شیعرەکانیدا ڕەنگدانەوەی هەیە».

**2020/4/13**

**سەردەمی کۆرۆنا**

(2)

# ڕێبوار
# سمبول و ڕەمزی ئەدەبی بەرگریی

وێڕای سڵاو و سپاس
ئەوا، تێبینییەکانم لەسەر ئەم چوار لێکۆڵینەوەی دوایی، یەکە-
یەکە، ئەنێرمەوە و دەستخۆشانەتان لێدەکەم:
بەسپاسەوە؛ بە دەقەکەدا چوومەوە. زۆر بەپێز و دڵسۆزانەیە.
ئاماژەم بە هەندێک تێبینی کردەوە وەک ئەوەی سروودی ئاسۆی
سۆسیالیسم، بەشێکە لە شیعری دووپەیکەرە (نەک هەمووی!)
بەڵام؛ دڵنیا نیم کەشیعری یەکەم (دەسا ڕاپەڕن...) هی من بێ.
وابزانم، کاک کاڵێ بە شیعری منی زانیوە. تکایە، بەجۆرێک، ئەمە
لە دەقەکەدا بگونجێ.

**مصلح ڕێبوار**
2020-5-10
**سوید**

## یەکەم : دەسا ڕاپەڕن

ڕەنگــە هیــچ ڕوداوێــک هێنــدەی واقیــع ژیــان لەگــەڵ بارودۆخە ســەخت و دژوارەکان، نەتوانێت دەقی زیندوو و نەمر بخولقێنێت.

ئینســان هــەر چەنــدە کائــن و بونەوەرێکی گــەورە و زیندوو بە ئیرادەیە، دەتوانێت ئەفراندن بکات، بۆ شــاعیر و نووسەران زۆرتر ڕاستە، بەڵام دەست و پەنجە نەرمکردن لەگــەڵ ئــەو بارودۆخە دژوار و پڕ مەترســییە، لەگەڵ ئەو هەموو ئەشــکەنجە و ئازارە، شاعیر دەتوانێت جۆرێکی تر ڕەسمی ژیان، شۆڕش، خەون و خۆزگەکانی بکات.

کاتێــک شــاعیر گوێــی لە هــاوار و ناڵــەی زیندانییەکی سیاســی ژێر ئەشکەنجەی زوڵم و ســتەم دەبێت، گوێی لە نەعرتەی جەربەزە و خۆڕاگری ژێر پەتی سێدارە دەبێت.

کاتێــک گوێــی لــە خرۆشــانی خیابــان و شــەقام و کوچەوکۆڵانەکانی شار و گوندەکان دەبێت، کە دژی ستەم و کۆیلایەتی وەســتاون، هەســتاون، خرۆشــاون و خیابان بوەتە سەنگەر و سەدان کەس گەوزاون لە خوێنا.

خیابــان بوەتــە شــوێنی ڕووبەڕووبوونــەوە و ئیعتراز و شــۆڕش و مەوج و شــەپۆلی تەواو ســرودی ئازادی و سەرکەوتن دەچڕێ، ئەو کاتە شیعرێکی جاویدانی پڕبەپڕی خۆشەویســتی لــە دایک دەبێــت، ئەو کاتە شــیعر مێژووی خۆڕاگری شەقام و خیابان دەنووسێتەوە، ئەوە ئەو کاتەیە کە ئایدیا شۆڕشگێڕییەکان لە هونەردا ڕەنگیان داوەتەوە.

ڕەنگــە هەمووتان حەز و خولیایی شــیعرەکانی ڕێبوار

نەبـن و تامەزرۆیـی لـێ وەرنەگـرن، بەڵام ئـەو بە دڵ و خوێنەوە ڕەگی شـیعر و ژیـان و هونەری لەو ڕوداوگەلە، ئینێـرژی وەردەگرێـت، لق و چـڵ و پـۆی داهێنانی دەبنە ستوون و کاریتە و ماڵی و داهێنەرانی شیعر بونیاد دەنێت، ئەو هەسـت و ئیحساسـە، ئەو وێنە و تەسویرە بەرزانەی لە شیعر و ژانی ڕێبواردا دەیبینین و هەستی پێ دەکەین و سـەرنجمان ڕادەکێشێت، ڕەگی لە خیابان و خرۆشانەکانی سـنە ئـاو دەخواتـەوە، ڕەگی هـۆش و خەیاڵ و وشـە و وێنەکانـی دەچێتەوە ناو زیندانی «ئێوین» و «قزل-قەلعە» و ڕەگی شـا-دەماری ئـەو لە بۆتێ، سـیروان، هەورامان، ئاریز، ئاویەر و داڵەهۆ ئاو دەخواتەوە.

سەدای دەنگی شیعری نەمری ڕێبوار لە چریکە و چەهچەهەی زەنوێر و ڕەوەزی ناو دونیای (خانە، حەمە حوسـێن، فوئاد، سدیقی کەمانگەر و جەعفەری شـەفیعی) ئیلهام وەردەگرێت و دەیکاتە مارش و سـروودی نەبەزین و ئەو هەموو وشـە ناسـک و وێنە پـڕ قوربانییانەی لێ بەرهەم دێـت، کە پەنجا سـاڵە دەیانکاتە شیعر، سـروود، گۆرانی، وێنە و شانبەشان و کۆڵبەکۆڵی کۆهسـار، چیا، گوند و لادێی کوردسـتانی پێ دەکات و هیچ بەربەستێک نەیتوانی بیوەستێنێت.

ئـەوە ڕێبوارە، لە ناو قرمژنی شـریخەی گوللە و تۆپ، دەچوە ناو سـەنگەرەکانی پێشمەرگە و دەبوە شورا، دەبوە سیمبوڵ و ڕەمزی بەرگری و مانەوە.

ئەوە شـاعیرە، جۆشوخرۆشـی دەدا بـە ژنان و کچان و لاوانی کوردسـتان، کە بێنە ناو ڕیزی شـۆڕش و کار بۆ

یەکسانی و ئازادی بکەن، ئەو کاتەیش کە دەبینێت ئەوان بە پیر بانگەوازەکەیەوە هاتوون، نازانێت چەندە بە کەیف و شاگەشکە دەبوو، ئیشتیهای شیعر و مبارزەی چینایەتی و دەنگ هەڵبڕین، چ نەمر و پڕ بە ئاواز بوو، کە پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد:

«دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان،
بۆ ڕزگاربوون و دوا ڕۆژی ژینتان،
دەسا ئەی چینی برسی و بەش خوراو
کرێکارانی برسی و بەش خوراو»

دڵنیام گەر ڕێبوار و سروودەکانی ئەو نەبوایە، ئەدەبیاتی کوردی لەم بەهرەیە بێبەش دەبوو، شیعر و سروودی کوردی کەمبودی دەهێنا، بۆیە ڕێبوار، یەکێکە لەو شاعیرانەی دونیای ئەدەبیاتی ئێمە، کە تام و بۆی تایبەتی داوە بە سروودی چینایەتی و شۆڕشگێڕانە و خسوسیاتی تایبەتی کردوە بە بەر شیعری (خیابان، دەنگهەڵبڕین و ئازار و مەینەتی هەژار ئاواکان و فەقیر ئاواکان و ناو کارگەر و مەزراکانی کوردستان)، بۆیە دەڵێم، ڕەنگە ڕێبوار، یەکەم شاعیری کورد بێت، کە زۆرترین شیعر و سروودی نووسیوە، یان دەقیقتر بڵێم زۆرترین شیعری سروودی چینایەتی و کرێکاری گوتوە.

ڕێبوار لەم شیعرەی (دەسا راپەڕن) باس لەڕۆڵی خۆی دەکات لە خیاباندا.

# دەسا ڕاپەڕن

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان
دەسا ئەی چینی دەست و پێ سواو
کرێکارانی برسی و بەش خوراو
بەش مەینەتانی خاوەن هەژاری
کۆیلانی هەڵمی سەرمایەداری

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان
ئیتر با بەس بێ سەر دانەواوی
بەسیە بێدەنگی و دیلی و چەوساوی
ئیتر با بەس بێ ژیانی سستی
گیرۆدەی یاسای کۆنە پەرستی

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان
ساڵەهای ساڵە دەردی گرانە
بەهاری شادی زەردی خەزانە
با خەڵاتی سوور ئاگر بستێنێ
دوا ڕۆژی ڕوون و ئازادی بێنێ

دەسا ڕاپەڕن ئەی بەش مەینەتان
بۆ ڕزگار بوون و دوا ڕۆژی ژینتان

لەم شیعرەدا، کە بانگەواز و مانیفێستی دەنگ هەڵبڕین و ڕاپەڕینە، بانگەوازە، بۆ چینی هەژار و دەست و پێ سواوو، شاعیر ڕێ و شوێنی خۆنیشاندان بەرنامە ڕێژ دەکات، ئەو لەم شیعرەدا حیکایەتی واقیعی ژیانی کرێکار دەگێڕێتەوە، کە چ ژیان و نەهامەتییەک دەچێژن لە لایەن حوکمی سەرمایە و کۆنەپەرستییەوە، شاعیر بانگەواز دەکات، گەر دەتانەوێت دەرچن لە ژینی سستی و چەوساوەیی، گەر دەتانەوێت لە یاسای کۆنەپەرستی و مەزهەبی و داسەپاو نەجاتتان بێت، گەر دەتانەوێت دەردی گران دەستتان لە سەر هەڵگرێت و بەهار بژێتەوە، تەنها ڕێگا بۆ ڕزگاربوون لەو هەموو ئازار و مەینەتی و بەدبەختییە، ڕاسان و ڕاپەڕینە، دەبێت بێنە سەرشەقام و دەنگ هەڵبڕن.

واتا شاعیر، لێرەدا جیا لە هەستی چینایەتی، ڕۆڵی لیدرێکی چینایەتی دەگرێتە ئەستۆ، یەکەم جار کۆمەڵگا هۆشیار دەکاتەوە و هانیان دەدات و هەوڵ دەدات ڕێکیان بخات و هەست و شعوریان بجووڵێنێت بەرەو ئاراستەی هەست بە ماف و داخوازییەکانیان، تا دوا ڕۆژێکی ڕوون و ئازادی بە دی بێنن، ئەمەیش ئەو واقیعیەتەیە کە باسمان کرد، ڕێبوار ڕەگوڕیشەی لە ناو هەموو ئەو پنتانە هەیە کە لەم شیعرەدا هەستی پێ دەکات.

لەم شیعرەدا، جیا لەوەی ڕەنگ ڕێژی ئەوە دەکات کە ئەم چینە برسین و سەردانەواون، ژیان سستن، باسی خاڵە بێ هێز و نێگەتیڤەکانی ئەم چینە دەکات، ئەمە خاڵی بەهێزە، چونکە پەنجەی خستوەتە سەر واقیعیەتی ژیانی ئەم چینە،

کە هەر چەندە دەچەوسێنرێتەوە، هەر چەندە یەکگرتوو نین، بەڵام پێیان دەڵێت و ئەو ئەڵتەرناتیڤەشیان نیشان دەدات، ئەمە ئەو ئەرکەیە کە شاعیر دەیخاتە سەرشانی، بەس و بە تەنها ناڵێ ڕاپەڕن، نا، هەموو ڕێوشوێنەکانی دیاری دەکات.

* * *

ڕێبوار، نەک هەر لە شیعری (دەسا ڕاپەڕن) ئەم نەغمە و چریکەیەی هەیە، نا لە شیعری زۆرتریدا، یان بڵێم لە سرودەکانی تریشدا، هەست بەم هارمۆنیا و مۆزایکە هۆمۆجینە دەکرێت، بەڵام بە گۆڕینی وشە و وێنە و تاکتیکی شیعری، بەڵام ستراتیژ و مەهامی سەرەکی شیعرەکان یەک ئامانج و ئارمانە، کە خۆی لە داکۆکیکەری چینی کرێکار و هەژارانە و دەستنیشانی ڕێگاکانی ڕزگاریان بۆ دەکات و پڕیان دەکات لە حەماسەت و بەرزکردنەوەی ورەیان و سازدانیان بۆ هاتنە مەیدان و خیابان و بەخشینی گیان لە پێناو ئازادی و سۆسیالیزمدا، لە پێناو بیروباوەڕیان و بەدیهێنانی خۆشبەختی و وەستانەوە دژی چەوسانەوە.

واتا ڕێبوار، بەو هەست و بەو وزە شۆڕشگێڕییەی لە ناو دڵی جەماوەری خرۆشاوی خیابان و شار و شەقامەکاندا هەست پێ دەکات، دەیەوێت هانیان بدات بە مافەکانی خۆیان ئاشنایان بکات، دەیەوێت ڕۆشنی بکاتەوە کە چینی سەرمایەدار و بزووتنەوەی سەرمایەداری و کۆنەپەرستی، تەنها لە ڕێگای هاتنەمەیدانی چینی کرێکاران و زەحمەتکێشان، لە ڕێگای ژنان و پیاوانی بەرابەری تەڵەب و عەدالەتخواز، لە ڕێگەی ئازادیخوازان و هەوڵەکانیان بۆ

بەگژداچوونەوەی کۆنەپەرستی مەزهەبی و سەرکوت و ئیستبداد کۆتایی بەم ناهەقی و نابەرابەرییە دەهێنێت.

خاڵێکی تری جێگەی سەرنج ئەوەیە، لە بەشێکی زۆری شیعرەکانی ڕێبواردا، بە تایبەتی لە سروودەکانیدا، ئیحساس و هەڵوێستی هیومانیستی دەبینین، لە بەرانبەر ئەو ئینسانانەی پەراوێز خراون و یان بڵێم ئینسانانی هەژار و بەش مەینەت، کە لە زۆربەی ئەوانە ڕێبوار، مانیفێستێکی هیومانیستی و سۆسیالیستی بەرانبەر ئەدەب و هونەر دەربڕی، واتا هونەر و ئەدەبی ڕێبوار، بوە مانیفێستێکی چینایەتی قووڵ، کە لە پشتییەوە ڕەمز و حیکایەت و کارەکتەرەکانی وەکوو ڕەمزەکانی ناو تابلۆیەک دەم و چاوی ماتەمیان، دەست و پەنجەی قڵیشاویان، بە لەشولاری داکوڕماویان دەبینیت، کە هەموو ئەوانە پێکهاتەی ئینسانێکی ماندوو و کرێکار و زەحمەتکێشە.

یان لە زۆربەی ئەو شیعرانەدا، ئینسانگەلێک دەبینی، کە وەک زرێبار پڕ ڕازونیاز، پڕ سیحر و ئەفسونن، وەکوو ئاربێز سەر پڕ لە هەور و ئەندێشەن، وەکوو دەشتی شارەزوور پڕپڕن لە دەستی پڕ گوڵاڵە سوورە و بۆنە بەرامەی کاڵەکی بێستانی لادێکانی کوردستان.

* * *

## دووەم: خیابان خرۆشاوە

ڕێبوار، لە یەکێکی تر لە شـــیعرەکانیدا بە ناوی (خیابان خرۆشـــاوە) دیسان بانگەوازە لە کرێکاران بۆ هاتنە مەیدان و خیابـــان بوەتە ڕەمزی هەســـتان دژی کۆیلایەتی، خیابان بۆتە سەنگەر و شوێنی شۆڕش.

گەر شـــاعیر لـــە حاڵەتێکدا ئەرکی نیشـــاندانی واقیعیەتی ژیان و کۆمەڵگا بێت، لە هەمان کاتدا ئەرکی تریشـــی هەیە، جیا لە وشـــیاری تاکەکان و چینـــەکان، دەبێت ڕووداوگەلی گـــەورە و حەماســـی بخولْقێنێـــت و پشـــتی ڕووداوەکان ڕوون کاتەوە و مەترســـییەکانی وەها سیســـتمێکی سیاسی سەرکوتگەر و کۆنەپەرستیش لەقاو بدات.

یان بە واتایەکی تر، شیعر شۆڕشە، شۆڕشێکی بەردەوام، یـــان بە واتایەکی تر شـــۆڕش شـــیعرە، کاتێک کار لە ســـەر تێکدانی دونیای باو بکات و سەرلەنوێ بە فۆڕم و ناوەڕۆکی تر دروستی بکاتەوە (عەقڵی شیعری - حسەین لەتیف).

بێگومـــان ڕێبـــوار، بـــەردەوام هەوڵـــی داوە، لـــە ڕێگەی شـــیعرەوە، دونیای بـــاو بە فۆڕم و شـــێوازێکی تر بگۆڕێ و نیشـــان بدات، هەمیشـــە قســـەی ئەو ئەوەیە، لە پشت ئەو ژیان و نەهامەتییەی ئینســـانەکان کارگـــەر و لاوانی تێدان، دونیایەکی بەهاتر و باشتر و گەشاوەتر هەیە، بەڵام دەبێت کار بکەیـــن بـــۆ گۆڕینی ئـــەو ژیانە و هێنانـــەدی ڕیالیزم و شۆڕشێکی چینایەتی یەکگرتوو.

ڕێبوار، ڕەنگە لە هەندێک شوێن لە شیعرەکانیدا پێڕەوی نەزم و فۆڕم و نۆرمی سوننەتی شیعری کردبێت، یان سەر بە مەکتەبەیەکی فکری یان هونەری شـــیعری بێت، بەڵام لە

ناوەڕۆکـدا تەواوی ئەو نـۆڕم و بیرکردنەوانەی گۆڕیوە و زۆرتر و زۆرتر پێداگری لە سەر (شۆڕش، خەبات، یەکسانی ژن و پیاو، وەفا و خەباتی سـووری چەوسـاوەکان، هاتنە مەیدان و حەماسـەت و خوڵقاندنی فەزای شۆڕش) جەختی کردوەتەوە.

# خیابان خرۆشاوە

خیابان خرۆشاوە
هەستاوە زیندوو
سەدان دەست و لەش
پەیکەرە و ڕەمزی هەستان دژی کۆیلەتی...
خیابان سەنگەر
شریخەی تفەنگ و
سەری پڕ لە ئەندێش
بە دار و چەك و مشت؛ بە دەیلەم
خیابان سەنگەر
خیابان چ سەخت و چ بەرینەدڵ بوو
سەدان پشت چەماوە
کە هاتن
بە ماشین
بە پۆتین
دەهاتن بەگژ سەنگەر و خەڵکی جەنگاوەردا...
خیابان چ سەخت و چ بەردینەدڵ بوو
سەدان پشتچەماوە
* * *

چەنێك دەرد و ژان
چەندەها شان و پیل بوو
کە کوتران کە ئێشان
لە پاسگا و ئیدارەی شەرارەت
چەندەها لەش کە گەوزان لە خوێنا...
هەمیسان خیابان شەقامی هەژاری

بەڵام وا دوبارە،
دژی کـۆیلەتـی و مـەینـەتاوا
خـیابان دەبێتە پەڕاوپەڕ
شـەپۆلـی شـەڕ و ئیعـتراز و شـوڕش …

دیسـان لـەم شـیعرەدا، دەنـگ هەڵبڕین و حەماسـەت دەبینیـن، کـە ئیلهامەکـەی ئـەو ژینگە و فەزایەیـە کە ئەو تێیـدا گەورە بوە و تێیدا هەسـتاوە و دانیشـتوە و ڕەنج و ئـازاری لەگـەڵ داوە و ئیلهامی لـێ وەرگرتوە و بە هەمان شـێوە ئیلهامیشـی بەخشـیوە بە کۆمەڵگا، ئـەو لە ڕێگەی ئـەم شـیعرانەوە ئیلهام دەدات بە جەمـاوەر و کرێکاران و زەحمەتکێشان کە هەستن و ڕاپەڕن و بێنە خیابان و هانیان دەدا، ڕێز لە شەهیدانی گیانبەختکردوو بگرن، بەڵام فلاش و مەسج و ئاهو و ناڵەی ئەو خەڵکە زەحمەتکێشەیە بە هەمان شـێوە بوەتە ئیلهام و ئینێرژی بۆ خوڵقاندنی ئەم شیعرە و لەدایکبوونی شیعر و سروودی شۆڕشگێڕانە.

ڕاستە ئەوانەی ڕێبوار ئیلهامی لێ وەرگرتوون، هەموویان ئینسـان و کارگەری زەحمەتکێش بـوون، هەموویان ڕەنج و ئازاریـان چێشـتوە و گرفتـاری ناعەدالەتی و سـتەم و نابەرابـەری بـوون، بەڵام ڕێبـوار لە ناو ئەوانـەدا وەکوو ئەستێرەیەکی ڕاخۆشـاو، وەکوو داینەمۆی خوڵقاندنی ئەم نەزمـە لە شـیعر و دەنگهەڵبڕینـە دەردەکەوێـت و دەبێتە سـیمبوڵ و ئاڵا هەڵگری ئەو ڕەنج و ئازارانە و خستنە ناو دوو توێی شـیعر و سـروودەوە، کە هەموو کۆمەڵگا خۆی تێـدا دەبینێتەوە، خـۆی دەخوێنێتەوە وەکـوو ئەوەی ژانی هەموان بێت.

ئـەوە واقیعیەتـە، کـە لـە هەمـوو کۆمەڵگایەکـدا چەند کەسـانێک دەبنـە ڕەمـز و سـیمبوڵی سیاسـی، ئەدەبی و

کەلتووری و دەبنە پێشەنگی بەگژداچوونەوەی ناعەدالەتی و خولْقاندنی فەزایەکی گونجاو و ئینسانیتر و باوتر، جیا لەوانە ڕێبوار بەردەوام دەبێت لە ستاییشی ئازیزان و ڕزگاریبەخشانی ئینسان بۆ بەدیهێنانی دونیایەکی بەهاتر و باشتر، بەردەوام لە خزمەتی بیروباوەڕ و خزمەتی چینی کۆمەڵگاکەیەتی، بە شێوەیەک وەسفی خەمی گیان بەختکردوان دەکات، کێوەکان لە ژێردا داڕماون هێندە بە سوێ و بە ئازارن.

«خەمی مەرگی ئێوەمان
نایە سەر شانی کێوەکان
کێوەکان ڕمان»

ئەم تەعبیرە دەلالەت و ئاماژەیە بۆ وێنەیەکی جوانی شیعری، کە شاعیر هەست بە ناواخن و دیدی نەبینراوی خەمەکانی ئەو ئازیزانە دەکات، هەست و شعوری ئەوەی پێ دەڵێت، کە خەمی ئەوان تین و هێز بوە، توڕەیی و قینە، تەوژم و تینە بۆ بەدیهێنانی بەیانییەکی ئازادی و شادی و سۆسیالیزم.

واتا شاعیر دەیەوێت بڵێت، خەمی ئێوە ئیلهامی ئێمە بوە، بۆیە بە ڕێزەوە یادتان دەکەین و ئاڵای سووری بیروباوەڕ و خوێنی گەش و سووری ڕژاوی ئێوە هەڵدەکەین.

لێرەدا، خاڵێکی گرینگ هەیە، دەمەوێت باسی ئەوە بکەم، زۆربەی ئەو شیعر و سروودانەی باسمان کرد، لە لایەن هونەرمەند و سروودبێژی شۆڕش (کاڵێ ئاتەشی - غوڵام عەلی ئاتەشین) و کۆڕی مۆسیقای بانگەوازەوە، کراونەتە

سروود و زیاتر و زۆرتر چوونەتە ناو دڵی خەڵکی و سەر زاری کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و کرێکاران و زەحمەتکێشان، چۆن پێشتر وتم، ڕەنگە هیچ کەس بە قەدەر ڕێبوار شیعر و سروودی کرێکاری لە ناو ئەدەبیاتی کوردیدا نەنووسیبێت، بە هەمان شێوە دەتوانم بڵێم هیچ هونەرمەندێک بە قەدەر (کاڵێ ئاتەشی) سرودی چینایەتی و کرێکاری و سۆسیالیستی نەچڕیوە و نەوتوە، بە تایبەتی کە زۆرینەی شیعر و سروودەکانی ڕێبواری کردوە بە سروود و گۆرانی، بە ئاواز و حەماسەتی گەورە.

بێ گومان خەڵکانی تریش، یان هونەرمەندانی تریش لە دوای کاڵێ لەم بوارەدا ڕۆڵیان هەبوە وەک (ناسری ڕەزازی، نەجمەدین غولامی، ڕەزا یوسف بەیگی، بەکری لەگزی، فاتمە محەمەدی)، واتا گەر باس لە مۆسیقای کرێکاری و چینایەتی دەکرێت، یەکسەر کاڵێ ئاتەشی لە ڕیزی پێشەوەیە، لە پاڵ ئەو هونەرمەندانەی تر.

* * *

## سێیەم:
## بەرپێزه گیان بازیتان

خەمی مەرگی ئێوەمان
نایه سەرشانی کێوەکان
کێوەکان ڕمان
بەرپێزه گیانبازیتان
لەو ڕێبازەی خۆی بەرپێزه؛
ڕێی ڕزگارییه!
ڕزگاریبەخشی ئینسان
بۆ سۆسیالیزم؛
بۆ ئازادی یەکجارییه!
خەمی ئێوه تووڕەیی و قین
خەمی ئێوه تەوژم و تین
خەمی ئێوه، تین بوو،
هێز بوو،
بۆ پێشی بردین...
بەری بەیانی ئازادی
دڵان هەموو لانکی شادی
یادتان دەکەین
لە بەر-بەیانی شادی ئازادی
ئازیزترین پێشڕەوان
وره و بێباکیتان
سامی مەرگی تێکشکاند

مەرگی بێباکانەتان
زەبوونی سەرکوتکەرانی
ئاشکرا زڕاند
قەڵای بیر و باوەڕتان
ئیرادەی پتەوی ئێمەی
بە هەموو نواند
بەری بەیانی ئازادی
دڵان هەموو لانکی شادی
یادتان دەکەین
لە بەر-بەیانی شادی ئازادی
خیابان و کووچەی شاران
شەپۆل-شەپۆل،
دەریای خەباتی لێ مۆنج دەدا
هەر سەنگەرێکی بەرزی کێوان
ئاڵایەکی سوورە،
بە یادی ئێوە هەڵکرا...
هاواری زیندانەکان
پەردەی شەوی ڕەش لادەدا
شەوگار شەق دەکا...
بەری بەیانی ئازادی
دڵان هەموو لانکی شادی
یادتان دەکەین
لە بەر-بەیانی شادی ئازادی

(بالـزاک) لە ناخەوە حەزی لـە دادپەروەری دەکرد، دڵ و مێشـکی بۆ دژایەتی سیسـتمی سـەردەمەکەی تەرخان کردبـوو، (تێزەکانی مارکـس و ئەنگڵس لە بارەی ئەدەب و هونەرەوە - وەرگێڕانی فوئاد مەجید میسری).

بێ گومان شاعیر و نووسەری ڕاستەقینە، هەردەم ئەمە لە بەرچاو دەگرێت، ڕێبواریش، بە هەمان شـێوە حـەزی لە دادپەروەرییـە و نەک بە تەنها وەک بالزاک مێشـکی، بەڵکـوو مێشـک و جەسـتە و ژیانیشـی بۆ دژایەتی سیسـتمی سیاسـیی وڵاتەکەی و سیسـتم و نەزمـی جیهانی سـەرمایەداری تەرخان کـردوە، جیا لـەوە بە بـاوەڕ و ئیمانێکی قایم و عەزمەوە وەسـتا، بەرانبـەر سـتەم و سـەرکوتگەری دوو دەورانی جیا لـە سیسـتمی سیاسـی وڵاتەکەی، زیندانی چێشـت و دواتریـش نـەک هەر بـوە دامەزرێنەری سـازمانێکی چەپ و مارکسیسـت، بەڵکوو خۆیشـی بۆ بەدیهێنانی دادپـەروەری و بەرابـەری ڕووی کـردە کێوەکانـی کوردستان و بوە پێشمەرگە و دواتریش تاراوگە، بەڵام چ ئەوەی لە نزیکەوە دەیبینم، چ ئەوەی ئینسان لە ناو شـیعر و ئەدەبیاتی ڕێبوار هەستی پێ دەکات ئەوەیە، کە لە یەکەم لەحزەوە دژی ناعەدالەتی وەستاوە، دژی نابەرابەری بوە، پشتیوانی لە هەژاران و زەحمەتکێشان کردوە، یەکەم پەیامی ڕێبوار و دواین پەیامی بەردەوام ئینسانی دادپەروەرانە بوو.

ئەو بەردەوام ڕوو بەو نەزم و سیستمە سیاسییە قسەی دەکـرد کە چینی بۆرژواز و سـەرمایەداری بە نادادوەری بونیادی نابوو، بەردەوام نەفرەت لەو سیســتم و دەسەڵاتە دەکات و ستاییشــی چەوســاوەکان و کرێــکاران و ژنانــی شۆڕشــگێر دەکات، تەنانــەت ئــەو لە دەورانی ســەرەتای دەیەی نــەوەدەکان، هێندە حەســاس و چینایەتی دەبێتەوە لــە وتارێکدا لە گۆڤاری (پێشــەنگ) دەڵێ «ناســیۆنالیزم لە پێشەنگدا چ دەکا...؟» و دەڵێ «هیوادارم و ئەمەوێ یەخەی ئەو ڕەوتە غەیرە کرێکارییانە داتەکێنن»، لێرەدا مەبەســتم ئەوەیە، ڕێبوار بە ئیمان و بیروباوەڕێک لە پێناو دادپەروەری و یەکسانی کە لە ڕوانگەی ئەوەوە بەدیهێنانی حکوومەتێکی کرێــکاری و کۆتایهاتنی چەوســانەوە  دەســتەبەر دەبێت، پێــی وایە، ناســیۆنالیزم، گرفتێکە لە بــەردەم ئەم ئارمان و ئامانجەی شاعیر و بزووتنەوەی کرێکاری.

تــا ئــەم ســاتەیش، ڕێبــوار وەکــوو کەســێکی چەپ و کۆمۆنیســت و عەدالەتخــواز ماوەتەوە، بەردەوام لە ســەر ڕێباز و مانفێســتی ئینســانی خۆی بوە، هــەر بۆیە ڕێبوار بەردەوام لە ســەر ئەم ڕیتمەی خۆی شــیعر و ســروودی چینایەتــی دەنووســێت و هیــچ هۆکارێــک و فاکتەرێــک نەیتوانیــوە لــە ســەر ئەم ڕێبــازە لای بدات یان سســت و کــەم کاری بکەن، ئەمەیــش ئاماژەیە بۆ ئەوەی ڕێبوار پێی وایــە ژیان و شــیعر دەبێ بە یەک ئاڕاســتە بڕۆن لە پێناو بەدیهێنانی خەون و ئاواتەکانمان.

* * *

## چوارەم: دوو پەیکەرە

ئەم هۆگرییەی ڕێبوار تا دێت لە ناو شیعرەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە و جەسورتر دەبێت، هەر بۆیە لە شیعرێکی تردا بە ناوی «دوو پەیکەرە« (کە سروودی «ئاسۆی سۆسیالیسم» لەو شیعرە هەڵبژێرراوە) لە زاری ژنێکەوە باس لە ڕۆڵە گەنجە شیرینەکەی دەکات، کە وەک پێشمەرگەیەکی ئەم ڕێبازە، لە مەیدانی بزووتنەوەی چەکدارانەدا، گیانی بەخت کردوە و سەرکوتکەرەکان، بۆ چاوترسێنکردنی خەڵکی شارەکەی (سەقز)، تەرمی بێگیانی ئەو ڕۆلە شۆڕشگێڕە، (کە ناوی «نەجمە» بوو) لە دەروازەی شار، هەڵدەواسن! بۆیە دێت و باس لە پەیکەری ئەم گیان-بەختکردوە دەکات، تا ئەوەیش دەڵێ «کە من سەربەرزم بە بەرزیت و نەبەزینت»، ئەم شیعرەی ڕێبوار بەشێکە لەو ئەزموونەی شاعیر کە پێشتر باسم کرد، شیعری ڕێبوار بەردەوام ڕەگێکی لە ناو دڵی دایکان و باوکانی ناو کۆمەڵگای کوردستان ئاو دەخواتەوە، واتا حیکایەت و پاڵەوانەکانی ناو چیرۆک و شیعرەکانی ڕێبوار یان سوپەرمانەکانی ناو ئەم ڕووداوگەلە (شەهیدانن، زیندانیانن، پێشمەرگەکانن، کرێکارانی کارخانەکانن، ژنانی ناو مەزرا و پشت تەونچنەکانن، هاوشاریانی سەر شەقام و ناو خیابانن، یان کچانی غەدرلێکراو و چەک لە شانن، ئەستێرە سوورەکانی ئەم حەرەکەتەن، ئەو ڕەمز و سیمبوڵ کۆمۆنیست و ئینسانە گەورانەن کە ڕابەری سازمان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی ئێران و کوردستانیان کردوە).

واتا ئەو حەماسەتەی دایکی ئازیزێکی گیان بەختکردوو دەری دەبڕێت، ڕێبوار دێت و وشەسازی و ڕستەسازی بۆ دەکات، وێنەسازی و تەسویری بە بەردا دەکات، پەیکەری شانازی و خۆڕاگری لە سەر شەقام و خیابانەکان بۆ دروست دەکرێت، ئەمانە لە زمانی دایکێکەوە دەگوێزێتەوە کە شانازی بە ڕۆڵەکەیەوە دەکات.

دیقەت بدەین لە ناو شیعرەکەدا چی دەڵێت:

«بە شکۆی پەیکەرەتانا
شایی پەنگاوەتە بینم
ئاسۆی سۆسیالیزم ئەبینم»

هیچ شیعرێکی مەزن نییە لە دونیادا بیرکردنەوەیەکی مەزن لە پشت بەرهەمهێنانییەوە نەبێت، ئەوەی دەقێک بە زیندوویی دەهێڵێتەوە ئەو بیرکردنەوە قوڵەیە کە بۆ ژیان و مرۆڤ و بوون لە خۆیدا هەڵگرتوە، شیعر لە خۆیدا چالاکییەکی شۆڕشگێڕانەیە دژی باو دەوەستێتەوە (عەقڵی شیعری - حسەین لەتیف).

بێ گومان ئەم بیرکردنەوەیە لە پشت دەقێکی شاعیرەوەیە، ئەو هاوار و شادییە کە پەنگاوەتە دەرونی دایکێکی شەهید، بیروباوەڕێکە وای کردوە دەقەکە بە زیندوویی بمێنێتەوە.

# شیعری دوو پەیکەرە

دڵەی فێری خورپە و خەتەر
دڵەی گەنجی ئامانج پەروەر
بووەتە پەیکەر - تا شێك و دێ
دوو پەیکەرەم بۆ داتاشێ
پەیکەرێك لە دەروازەی شار
شەهیدێکی ڕاوەستاو
پێشمەرگەیەکی کرێکار
دوژمن هێندە لێی ترساوە
بۆ چاوترسانی خەڵکی شار
تەرمی لە سەر ڕێ داناوە
کەچی، بووەتە شمڵی هەستان
دژ بە زوڵم و زۆر ڕاوەستان

بەرامبەر بەو بەژنێکی بەرز
پەیکەرەی ڕەنج، کێوی سەر ئەرز
پەیکەری دایکی پێشمەرگە
ڕەنج کێشاو و دڵ بە بەرگە
قسەی شیعراوی لە زارە
ئەسرینی لە سەر ڕوخسارە
نیگای شەوقی بروسکەیە
دەنگی نرکەی تریشقەیە
وەك پەیکەرەی ڕەنجی ئینسان

دەگرمێنێ لەگەل باران:

ڕۆڵەی شیرینم، گەنجەکەم!

بەرامەی تاڵی ڕەنجەکەم!

پەیکەرت بەرزە؛ نابەزێ!

وەك سوارێك کە دانابەزێ!

ئەگەر بەسەر پەیکەرەتا

ئاسمان بگری هەتا هەتا

کێو بناڵێ و هەور شیوەن کاو

من سەرشین بم، کەمە هێشتا!

بەڵام سەربەرزم بە بەرزیت

دڵ قایمم کە نەبەزیت

لە ژینی بەش مەینەتمانا

لە ژێر دەستی زاڵمانا

لە کۆت و زنجیر بەو لاوە

چیت هەبوو؟ چیت لە دەست داوە؟؟

منیش ڕەنجم کوێرەوەریم،

تاڵیم، دەردم، دەربەدەریم،

زیاتر نابێ بە مەرگی تۆ

بۆیە وتم ئەرێ، بڕۆ!

لەگەڵ کاروانی خۆش ئاژۆ

لەگەڵ هاوزنجیرانی خۆ

بڕۆ...بێ ئاوڕدانەوە،

بیرە-بیرە و بادانەوە

هەر چەند داخێك لە دڵمایە
تەرمی شیرینت تەنیایە
نیت لە كۆڕی هاوڕێكانا؛
بەڵام تینی لە لەشیانا
ورشەیت لە چاوی گەشیانا
وزەیت لە پەلاماریانا
سروودیت، لە سەر زاریانا!
دڵەی شاگەشكەی سەرەڕۆم
دڵەی نەسرەوت و بێخەوم
دڵەی فێری خوڕپەو خەتەر
دڵەی گەنجی و ئامانج پەروەر
لەبەر پێی پەیكەرەكانا
چەپكێك شیعری گەشی دانا
وتی پێیان: ئازیزەكان،
زاڵمان تۆقیون لێمان
ستەمكاری جەللادەكان
شەوگاری ڕەشی خەفەقان
گەر بە قورسی كێوەكان بێ،
پڕ بەینی ئەرز و ئاسمان بێ
دەریای ورەی خەباتكاران
دەرەتانیان لێ دەتەنێ
لە جەسووری شۆڕە لاوان
دوژمن ماتەو تەنگە زیندان
بە جەربەزەی هاوڕێكانا

نـــەتـــرســـی شـــەهـــیـــدەکـــانـــا
لـــە مـــەیـــدانـــا لـــە زیـــنـــدانـــا
بـــە شـــکـــۆی پـــەیـــکـــەرتـــانـــا
شـــایـــی پـــەنـــگـــاوەتـــە بـــیـــنـــم؛
ئـــاســـۆی ســـۆســـیـــالـــیـــزم ئەبینم

**19/2/1361**
**9/5/1982**

دیقەت بدەن لەم شیعرەدا شاعیر چۆن باوەڕێکی هیومانیستی، چۆن فەلسەفەی مارکسیزم و ئاییننامەی ئەم حەرەکەتەی لە زمانی دایکێکی شەهیدەوە تێکەڵ بە شیعرەکەی کردوە.

«لە کۆت و زنجیر بەو لاوە
چیت هەبوو چیت لە دەستداوە؟»

هەمان دەقی فەلسەفی مارکسە کە دەڵێت «کرێکاران لەم شۆڕشەدا، بێجگە لە زنجیرەکانیان هیچ لە دەست نادەن، بەڵام جیهانێک بە دەست دەهێنن، کرێکارانی جیهان یەکگرن».

ڕێک بەراوردی شەهیدێکە بەو ئارمان و ئامانجەی مارکس بۆ کرێکارێک هەیەتی، تەنانەت دایکی دەڵێ «منیش بە مەرگی تۆ، ڕەنج و کوێرەوەریم زیاتر نابێت».

واتا لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەمواندا، ئەوە ئامانجەکەیە، شەهید ئەگەر چی نییە لەگەڵ هاوڕێکانی، بەڵام وزەیە، تینە، ڕستەیە، سرورودی سەر زاری هاوبیران و هاوڕێیانییەتی، ئەمەیە ئامانجی گشتی کە شاعیر دەیخوازێت.

**2020/4/12**

**سەردەمی کۆرۆنا**

**قەشان**

(3)

# خەسڵەتەکانی (هیۆمانیستی، ژنبوون و جوانناسی) لە شیعری (شیرین ئەدویَ)ی ڕێبواردا

سوپاس بۆ کارەکانتان و ماندووبوونتان
ئەمەش فایلی وۆردی لێکۆڵینەوەی «شیرین ئەدوی»تان بۆ
دەنێرمەوە

**مصلح ڕێبوار**
2020-5-10
**سوید**

هەمیشە چرپە لە قیژە کاریگەرترە، شاعیر چۆن
هەڵوێستی دەبێت، پێویستە دەربڕینی هەبێت.

ڕێبوار، جیا لەوەی زۆربەی ژیان و شیعرەکانیشی تەرخان کراوە بۆ ڕەهەندە سیاسییە، کرێکارییەکەی، بەڵام جیاواز لەو ڕەهەندە، سەیری شیعرەکانیشی کردوە بە واتایەکی تر، شیعر هەر ڕیالیزم نییە، بەڵکوو ڕۆمانسییەت و گۆرانیشە.

# شیرین ئەدوێ

«شیرین ئەدوێ، کاڵی شیرین!
گفتوگۆت چەندە شیرینە؛
ئەی ناسکە چاو کاڵەکە
کە گەشترین گوڵی نێرگز
ئەبێ زۆر زۆر منەتبار بێ
ئەگەر بڵێم
وەك چاوەکانت ڕەنگینە!
* * *
شیرین ئەدوێ، تەڵی ناسك
تەڵی ناسکتر لە لاو-لاو
کە گۆمی مەنگی چاوانت
پڕ-پڕە لە شادمانی
شادمانی مەعسوومانە
دڵی پاراوی شۆڕشگێڕ
پڕ دەکەی لە گورج-وگۆڵی؛
* * *
تەڵی تەری نەرگسی باخ؛
ڕازێنەری سەنگەری شاخ!
بۆکوێ؟
بۆ شار ئەچیتەوە؟
جەخار و داخ!!»

شــاهیدی مۆدێلێکی ناســک و ڕۆمانسی شیعری ڕێبوار دەبین، کە تایبەتە بە مەنەلۆگێک لەگەڵ کچێکدا، کە دیارە لە نزیکەوە بینویەتی، شــاعیر ئەم ژنە یان کچە وەها وەســف دەکات پڕ لە تەعبیر و وێنەی وەها دەڵێی ئەفسانەی جوانی یــان شــاجوانی بینیوە، دیقــەت بدەین لە (شــیرین ئەدوێ، گوڵی نێرگــز، چاوی ڕەنگین، تەڵی ناســک، لاو-لاو، گۆمی مەنگ، تەڵی تەڕی، نێرگســی باخ، ڕازێنەر، سەنگەری شاخ) هەموو ئەو چەمک و وشانە هێندە ناسکن، تەنها لەگەڵ ڕۆح و جوانــی و کائینێکی وەک ژن یــەک دەگرێتەوە، بەڵام من دڵنیام ڕێبــوار هیچ کات زیادەڕۆیی نەکردوە، لە واقیعیەتی نووســینی شیعر و وەسف و ستاییشــی جوانی، دۆست و هاوسەنگەرانیشــیدا، بەڵکوو گرینگتر لەوە ڕێبوار خۆیشی، کەســێکی فێمینیستە، واتا چۆن هاوار و ئیعتراز و نەفرەتی لــە چەوســاندنەوەی ژن کردوە، بە هۆی ئەو ســتەم و بێ مافی و نابەرابەری بەســەریدا هاتوە، یان نەفرەتی لەو پیاو ســالارییە کردوە کە زاڵە بە ســەر کۆمەڵگادا و ژن وەکوو هاوڵاتی پلە دوو سەیر دەکات کە خەباتی کردوە.

بەڵام شــیعری (شــیرین ئەدوێ) بەرهەمی لەدایکبوونی کچێکــە بەنــاوی شــیرین کە لــە دەیــەی هەشــتاکاندا یان وردتر بڵێم ســاڵی (1985) کاتێــک دێتە دەر لە ڕۆژهەڵات بــۆ پێشــمەرگایەتی بۆ ناو ڕیزەکانی کۆمەڵــە، ڕوو دەکاتە ئــۆردوگای مالوومــە لــە کوردســتانی عێــراق تــا چــەک هەڵگرێــت، لــە ناو ژنانی جەســور و پێشــمەرگەدا شــوێن بگرێت، کە وەکوو لە شــیعرەکەدا دیارە شیرین جوان بوە،

بەڵام پاش ماوەیەک شیرین بڕیار دەدات بگەڕێتەوە شار و پێشمەرگایەتی نەکات، بە هۆکاری جیاواز، بەڵام دیقەت بدەن شیرین دێت بۆ ئۆردوگا و دەڕواتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان (ئێران) و نە دەبێتە پێشمەرگە و دەستبەرداری شۆڕشیش دەبێت.

شیرین ژنە، شیرین ئینسانە، شیرین کوردە، شیرین جوان و نازەنینە.

بەڵام لە ناو ئەو هەموو ڕووداو و ماجەرایە، لە ناو ئەو هەموو ڕووداوگەلەی ڕووی دا، لە ناو تەواوی ژیان و زیندەگی شیرین، جیا لە ڕێبوار کەسێک نەیتوانی ڕووداوەکە، بەسەرهاتەکە لە هاتن و ڕۆیشتنی شیرین تۆمار بکات و بیکاتە حەدەس و ڕووداو.

کەس، کەس نەیتوانی قسەیەک بکات و بیرەوەرییەک لە شیرین هەڵگرێت و وەسفی بکات و ستاییشی بکات، جیا لە ڕێبوار، شیرین و ژن، هاتن و ڕۆیشتنی کردوە بە (شیعر)، کە بەشێکە لە مێژووی ژن، بەشێکە لە مێژووی جوانی ژن، بەشێکە لە مێژووی ژنانی شۆڕشگێری کۆمەڵە کە لەو کاتەدا لەو سازمان و جەریانەدا بەشداربوون.

قسەکە ئەوەیە، لە هاتنی ژنێک بۆ پێشمەرگایەتی و گەڕانەوەی بۆ شار، لەم سات و لەحزە مێژووییەدا، ڕێبوار سێ ڕەهەندی (سیاسی، شۆڕش، ژن بوون و جوانی، گەڕانەوە) دەکاتە ڕەمز و ڕموزی ئەم شیعرە.

**ڕەهەندی یەکەم:** لە سەرەتای شیعرەکەدا، ڕێبوار تەنها وەسفی جوانی شیرین دەکات، وەکوو کارمامزێکی ڕەزا

سـووک، وەکوو گوڵە نێرگزی بەهارانەی کوردسـتان، کە چاو کاڵێکی جوانتر لە گوڵی نێرگز، تەنانەت دەڵێت «نێرگز بەو جوانییەی خۆیەوە، ناگات بە چاوە جوانەکانی تۆ».

ڕێبـوار، ژن یـان (شـیرین) ڕەگەزێکـە کـە دەتوانێـت ڕووناکی باشتر ببەخشێتە مۆمەکان، سەوزی جوانتر بداتە گەڵاکان، سـپی بوون بداتە بەفر، شـیرین ببێتە فریشـتەی سیحراوی.

**ڕەهەنـدی دووهـەم:** بەشـی دووهەمی شـیعرەکە، جیا لە بەردەوامی وەسـفی جوانی شیرین، کە وەکوو تاڵی ناسکی لاولاوی سـپێدە و بەیانیـان گـەش و جوانە، بـەڵام دواتر پارادۆکسێک هەست پێ دەکەین کە دەڵێت:

«گـۆمی مـەنگـی چاوانـت
پـڕ پــڕە لـە شـادومـانـی»

گەورەیی شـاعیر ئەوکاتەیە کـە دەتوانێت لەپاڵ مەرامە شـیعرەییەکانی خۆییدا، سـەردەمەکەی خۆشی بگێڕێتەوە یـان وەکوو جـەلال ئەمین دەڵێـت «لە نێو هەموو گاشـە بەردێکـدا پەیکەرێکـی جوانـی شـاراوە هەیە، ئـەوە تەنها هونەرمەندانن، پەیکەرە جوانە شاراوەکانی نێو حەشارگەی گاشە بەردەکان دەدۆزنەوە».

دەمەوێـت بڵێـم «ئـەوە ڕێبـوار، جیا لـەوەی چیرۆکی سـەردەمەکەی خۆی لە ڕێگای ئەم شـیعرەوە دەگێڕێتەوە (سـەردەمی شـۆڕش، سـەردەمی هاتنـی کچـان بـۆ پێشـمەرگایەتی، شۆڕشی چەوسـاوەکان و مەعسومەکان، سـەنگەری شاخ)»، لە هەمانکاتدا وەکوو گوتم: ڕووداوێکی

ســادەی هاتنی کچێک بۆ پێشــمەرگایەتی شیعرێکی گەورە بەرهەم دەهێنێت.

گــەر بگەڕێمەوە، ســەر وجودی پارادۆکس لە شــیعری (شــیرین ئــەدویَ) وەکــوو گوتــم لــە بەشــی دووهەمــی شیعرەکەدا، شیرین لە یەک کاتدا گۆمی مەنگی چاوانی پڕە لە شادومانی، دواتریش دەڵێ «شادومانی مەعسومانە».

گۆمی مەنگ جیا لە جوان ناسییەکەی ئاماژەیە بۆ مەنگی و بۆ خەم، بەڵام لە هەمانکاتیشدا دەکرێت شادومانیش بێت.

لــەوەش گرینگتــر شــادومانی چــاو، بۆ شــادەکانە، بۆ خوا پێــداوەکان و چینە دەوڵەمەندەکانە، بەڵام شــادومانی چاوەکانی شیرین بۆ مەعسومانە، بۆ بێ بەشەکانە، ئەمەیش خاڵی دووهەمی پارادۆکســی ناو شــیعرەکەیە، کە دەکرێت پارادۆکس یەکێک بێت لە ڕەگەزەکانی شیعر و ئەدەبیات و پێوەندیشی هەیە بە توانا و سەلیقەی شاعیرەکەوە.

**ڕەهەندی سـێیەم:** گەڕانەوەی شــیرینە بۆ شار، کە چ داخ و جەخارێکی دروســت کردوە؟ بۆ کوێ؟ بۆ گەڕانەوە بۆ شار، واتا گەڕانەوە بۆ ژێر دەستەیی، بۆ ستەم و بۆ حکومی مەلا، بۆ بێ-بەش بوون لە خەباتی شاخ و شۆڕش، بۆ بەشدار نەبوون لــە شــۆڕش و ڕزگاری و چینایەتــی، بۆیە شــاعیر داخ لەوە دەخوات، شــیرین کچە پێشمەرگەی ناو ڕیزەکانی سازمانێکی چەپ و مارکسیســت گەڕاوەتەوە بۆ ژێر دەســەڵاتی حکومی مەلا، کە ئەمان سەنگەری شۆڕش و شاخیان گرتوە.

هەر لە بەشی ســێیەمی ئەو شیعرەدا، شاعیر هەوڵ دەدات شیرین نەگەڕێتەوە شاری مۆدێرنە و شاری سخناخ بە عەسکەر و پاسدار، شاری خامۆش لە ئازادی و شاری بێ مافی.

هەوڵ دەدات، لە شاخ بمێنێتەوە، لە ناو شۆڕش بمێنێتەوە، تا دڵی پاراوی شۆرشگێڕەکان، پڕ بکات لە گورجوگۆڵی.

وارده، خەباتی هاوبەشـــی نێوان ژن و پیاو، کوڕ و کچ، کاریگـــەری ســـایکۆلۆجی هەیە لە ســـەر شـــۆڕش و ڕەنگە هەســـت و ئیحســـاس و خۆشـەویســـتی زۆرتـــر بـــکات بۆ سەنگەری شۆڕشگێڕان.

بـــەڵام شـــیرین، دوا جار دەگەڕێتەوە شـــار و ســـەنگەر جـــێ دەهێڵێت، بەڵام شـــۆڕش بەردەوام مایـــەوە، ئەوەیش کە دەقێکی شـــیعری جوانی بەرهەمهێنا، هاتن و ڕۆیشـــتنی شیرین بوو.

بـــەڵام هیـــچ شـــیعرێکی مـــەزن نییـــە، لـــە دونیـــادا بیرکردنەوەیەکـــی مەزن لە پشـــت بەرهەمهێنانییەوە نەبێت، ئـــەوەی دەقێک بە زیندوویی دەهێڵێتـــەوە، ئەو بیرکردنەوە قوڵەیە کە بۆ ژیان و مرۆڤی بوون لە خۆیدا هەڵی گرتوە.

بیرکردنەوەی ڕێبوار، بەو قووڵییە لە شیرین و حیکایەتی ئەم هاتن و ڕۆیشـــتنە وای کـــردوە، ئەم دەقە بە زیندوویی بمێنێتەوە، چونکە هەڵگری خەســـڵەتە پۆزەتیڤەکانی ژیان و مرۆڤ بوونە.

ڕێبوار پێش هەر شتێک، وەکوو ئینسان سەیری شیرین دەکات، دواتر وەکوو ژن، پاشان جوان، شۆڕشگێر...

هەر بۆیە لە ناو شیعرەکەدا هەر سێ خەسڵەتی (ئینسانی، ژن، جوانی) کۆ بوونەتەوە.

**2020/3/10**

**سەردەمی کۆرۆنا**

# (4)

# میوانی تۆن
# دوالیزمی شیعر و شۆڕش لە خاکی ژیاندۆستیدا

دیسان سڵاو و ڕێز
کۆپیێچی ئەم پەیامە، نووسراوەکەی بەڕێزتانە لە سەر شیعری «میوانی تۆن». ئەوەی گرنگە، میوانەکان (تەرمە گوللە-باران-کراوەکانی) براکانی فوئادن کە لە تەوریزەوە هاتوونەوە! ڕەنگە، بەوبۆنەوە، بتانهەوێ خۆیشتان دیسان دەستکاری بکەن....
نوکتەی دووهەم: لای منەوە، پێم وایە وەڵامی هەموو بابەتەکانم داوەتەوە. تکایە، دڵنیام کەن کە هیچ بابەتێک پشتگوێ نەخراوە!
ئیتر خۆشیتان؛
**مصلح ڕێبوار**
2020-5-13
**سوید**

# میوانی تۆن

به دووچاوی وەك زرێبار گەرمی گرینە
دەشتی شینی مەریوانە سەرگەرمی شینە
لە (تاڵە سوار) دائەبەزن دوو سواری سوورپۆش
میوانی تۆن کاك فوادی دڵگەرم و ڕووخۆش!
میوانی تۆن هاتوونەوە لە تەورێزەوە
میوانی تۆن بیانگرە لە ئامێزەوە!
لە هەواڵی هەڤالانی تەورێز و تاران،
چەپك چەپك گوڵیان پێ یە پڕپڕ بە دامان
بیان دوێنە بابۆت بڵێن سروودێکی نوێ
گەش و ڕوونتر لەو سروودەی کە بیستووتە دوێ
دەستە دەستە لاوانی سەربەرز و شۆڕشگێڕ
بەرانبەر بە جووخەی ئیعدام، بە دەنگی دلێر،
ئەگوڕێنن، تەخت و بەختی دوژمن ئەلەرزی
ئەڵێن: دوژمن ڕاوەستاوی بەرانبەر بە کێ؟؟
دژی سێلاوی باوەڕ و هێرش هەستاوی
وا بەیانە، بۆیە وایە، ئەی سەر لێشێواو
ئەستێرەکان ئەتوێنەوە ناو نووری هەتاو
زەردەخەنەی گزنگی خۆر، لە زاری لاوان
پەرچەمی فەتحی بەیانە، کاتی تیرباران
ئەستێرەکانی گەلی کورد لەگەڵ پێشەنگان
شەبەقی سووری ئاسمانی هیوایان نەخشان
شەهیدانی شۆڕشگێڕمان پێشەنگی خۆرن
بناغەی بنکەن-کراوت، بە خوێن ئەشۆرن

شــیعر و شــۆڕش، دوو دونیای تەواو لێک نزیک و لێک گرێدراون، یان ئاوێتــەی یەکن، واتا یەکێک لە فاکتەرەکانی داینەمۆی شــیعر، شۆڕشــە و بە پێچەوانەشــەوە، شۆڕش حەماســەت و ڕەنــگ و بۆنی لــە شــیعرەوە وەردەگرێت، بەشێک لە ئینێرژی شۆڕش بە شیعری جوان و حەماسییە، واتا دوو دونیای مۆزایک و هۆمۆجین کاریگەرییان لە سەر یەک هەیە.

دوالیزمێکــن بــۆ هەڵچــوون، باڵاکردن، گەشــەکردن و بەدیهێنانــی دوو جیهان، دوو وێنــە، دوو تێڕوانین کە هەر دووکیــان مەملەکەتێکــی ئــازاد و جوانن، دوور لە ســتەم و ناعەدالەتــی، بەهرەمەنــد لە ژین و عیشــق لە بەدیهێنانی دونیایەکی جوانتر و ئینسانی تر، بێ گومان ئەو بۆچوونانە قســەیە لە شــۆڕش و شــیعرێکی ئامانجــدار و وەفادار بە ســیمبوڵ و ڕەمزەکانــی شۆڕشــێک کە لە پێنــاو ڕزگاری مرۆڤایەتی و دونیایەکی بەهرەدارتر گیان لە دەســت دەدا، شــیعرێک لە پێناو ماچی ســەرمەدی و ژوانــی ئازادانە لە گۆڕەپانی ئەویندا.

یەکێکــی تر لەو شــیعرانەی کە ڕەنگە زۆر کەس نەزانن شــیعری ڕێبــوارە، شــیعری (میوانــی تــۆن) کە بــۆ فوئاد سوڵتانی وتراوە.

ئەم شــیعرە ئەگەر چی مێژووەکەی دیار نییە، بەڵام دیارە هی هەشــتاکانی ســەدەی ڕابــردوە، واتــا دوای کۆچی فوئاد نووسراوە، ڕێبوار باس لە تەعزیە و پرسە و خەمباری زرێبار و دەشتی شینی مەریوان دەکات بۆ ئازیزێکی گیان بەختکردوو.

زرێبـار، وەکـوو ڕەمزی سروشـتی مەریـوان، ئاویش وەکـوو ڕوندەک و فرمێسـکی تەعبیرکراو، لە پاڵ دەشـتی مەریوانـی زادە و جێگـەی لەدایکبـوون و سـەر و کاری ڕۆژانـەی لەگەڵ یەکێتیـی جووتیـاران و ئاواییەکانی ئەو ناوچەیـە، تێکەڵبوونی ئەوینی زەحمەتکێشـان و ڕابەرێکی دڵسۆز و جێگە متمانەی ئەوان وەسف کراوە.

واتا شاعیر فۆکەس و جەختی زۆرتری لە سەر شوێنی ژیانی فوئاد دەکات و نزیک دەبێتەوە لە شوێنی لەدایکبوونی.

«تاڵـە سـوار»، نزیک بـە ئاواییـی «ئەڵمانـە»، زێد و گونـدی لەدایکبـوون و گڵکـۆی فوئـادە، بۆیە شـاعیر ئەو وێنەیـە دەکێشـێت بۆ خوێنـەر تا بزانێت بـاس لە کێ یە؟ (دوو سواری سور پۆش) مەبەست؛ «ماجد» و ‹ئەمجەد›» دوو بـرای فوئـاد، دوو کارەکتـەری چەپ و کۆمۆنیسـتە کـە لە زیندانی شـاری «تەورێـز» گوللە-بـاران کراون و تەرمەکانیـان، هێنراوەتەوە بۆ «ئەڵمانە» کە هەر لە هەمان گڵکۆ، لە تەنشـت برای گەورەتریان: کاک فوئاد، بنێژرێن و ببنە میوانی هەمیشەیی کاک فوئاد

دوو میوانـی ئازیز، کە لە تەورێزەوە هاتوون، کراونەتە سـیمبول، کـە کاتێـک قسـە لـەوێ دەکرێت، واتا قسـە لە جێگەیەکە کە بەشێکی کارەکتەرەکانی ئەو ڕێکخراوە چەپ و شۆڕشگێڕن، لەوێ خوێندکاران لە تەشکیلاتیشدان، چونکە تەورێـز و تاران کانگای ئەو جەمعە لاوە خوێندکارانە بوو، کە ئەوکات، لە دەیەی شەستەکان، ئەم جەریان و گەڕایشە سۆسیالیست و مارکسیستەیان بونیاد نا.

شاعیر، فوئاد ڕادەسپێرێت ئەم میوانانە بگرێت لە ئامێزەوە، بپرسێ حاڵوئەحواڵی هەڤاڵانی تەورێز و تاران؟

بپرسێ هاوڕێیانی لە چ وەزعیەتێک و بارودۆخێکدان؟ ئاخۆ ڕەوتی ڕوو لە گەشەی ئەو جەریانە هەر وا چۆتە پێش؟ ئاخۆ ئەوانەی لە زیندانن هەر بە ئیمان و ورە و عەزم و جەزمەوە بە پێوە ڕاوەستاون ڕوو بە دوژمن وەک شێر وەستاون؟ ئاخۆ ورەی پۆڵاین ئاسایان، تەختی ستەمکاری هێناوەتە لەرزە؟

ئەم شیعرە چیرۆک و حیکایەتی ئەو مێژوە دەگێڕێتەوە کە لە (1969) دەست پێ دەکات تا ئێستایش بەردەوامە، حیکایەتی دووری نێوان فوئاد ڕابەری دامەزرێنەر و ئەلگۆ و لیدەری خۆشەویستی ئەم حەرەکەتە لە مەریوانەوە تا هەزاران فرسەخ دوورتر لە براکانی لە تەورێز و هاوڕێکانی لە دوور و نزیک کە بە «تەورێز و تاران»، ئاماژەیان پێ دەکات.

بەڵام باس لەو ئیمان و ئارمان و ئامانجە هاوبەشە دەکات، کە دووری نێوانیان ناتوانێت بەر بەم حەماسەت و شۆڕشە بگرێت، چونکە ڕابەر و لیدەری حەرەکەتەکە دڵی بۆ هاوڕێیانی کردوەتەوە لە تەورێز و تارانەوە تا مەریوان بە بۆنوبەرامە و بەرنامەی ئەوان ڕەنگرێژ کراوە.

(شیعر و شۆڕش لەم شیعرەی ڕێبواردا بە تەواوی هەنگاو و سەرەتاکانی ڕەنگرێژ کراوە، شیعر و شۆڕش ڕەگیان لە خاکی ژیاندۆستی دایە، هیچ شیعرێک نییە بە بێ ڕوئیایەکی قوڵی ژیاندۆستی توانای ژیانکردنی هەبێت

و بمێنێتەوە، هەموو شۆڕشـێکیش بـە بێ ڕوانینێکی قووڵ بۆ ژیان و مرۆڤ دەبێتە بزوتنەوەیەکی چەکداری لە جیاتی بونیادنان و دروسـتکردن، وێرانە بەرهەم دەهێنێت، عەقڵی شیعری - حسەین لەتیف).

ئـەم شـیعرە لـە گەرمـەی شۆڕشـدا نووسـراوە کـە هەموویان لاوانی شۆڕشـگێڕ بـوون و بەرانبەر جووخەی ئیعـدام وەسـتانەوە بە هەموویـان دەستە-دەسـتە لاوانی تازە-پێگەیشـتوو و دڵ گەرم بوون لە پێناو ژیاندۆستی، لە پێناو ژیانێکی شایستەی ئینسانی گیانیان بەخت کرد.

لەوەیـش گرینگتر، ئەو شۆڕشـە ڕوانین بـوو بۆ ژیان و مـرۆڤ، تەواو هیومانیسـتی و ئینسـانی و عەدالەتخواز بوو، چونکە ئینسان پایەی سەرەکی حەرەکەتەکە بوو؛ ژن، ڕێزی لێ دەگیرا و پێشـمەرگە بوو، دژی سیستمی فیوداڵی و چەوسـاندنەوە بوو، شـۆڕش لە گرینگترین ئامانجەکانی بەدیهێنانـی بەرابـەری و حکومڕانێکی سۆسیالیسـتی بوو کە ئینسـان شایستەی ژیانێکی باشتر بێت و و کارەکتەری سـەرەکی ئـەم شـیعرەیش کە فوئـادە، بـوە قوربانی ئەم خەباتە و لەو پێناوەدا گیانی بەخت کرد، بۆیە شـاعیر دەڵێ «شەهیدان شۆڕشگێڕن».

حسێن بەفرین شـاعیر و ڕەخنەگر سەبارەت بە ڕێبوار دەڵێت «بەلای منەوە ڕێبوار تا بڵێی شـاعیرێکی ماندوە بە مـاڵ و منداڵەوە لە پێناوی کێشـە سیاسـییەکەیدا ژیاوە و ئازاری چەشتوە و ئاوارەی وڵاتانیش بوە».

وا هەسـت دەکەم، ڕێبوار، لە پێناو باوەڕەکەیدا دەژی و

هەناسە دەدات، چونکە هێشتا بەوەفایە بۆ ئەو ئامانجەی لە پێناویدا خەباتی کرد و زیندان و ئازار و مەینەتی زۆری چێشت، بەڵام لەپاڵ ئەو ڕەنج و ئازارە فیزیکییەی ناکرێت نکۆڵی بکەین لەوەی دیوە سیاسییەکەی ڕێبوار پڕە لە هونەر و ئەدەبی گەل، بەڵام دیوە ڕۆمانسی و عاتیفییەکەی ڕێبوار ڕەهەندێکی تری شیعرەکانی و ژیانی تایبەتییەتی، واتا دەتوانین ڕێبوار وەکوو کەسێک و شاعیرێکی سیاسی، چینایەتی، مارکسیستی و سۆسیالیستی بناسێنین، یان دیوەکەی تری ڕێبوار وەکوو کەسێکی عاشق و ڕۆمانسی پڕ لە خەیاڵ و قووڵی عشق و تامەزرۆیی پێناسە بکەین، ئەمەیش کارێکی واردە، لە زۆر شاعیری کورد و جیهانیشدا هەستی پێ دەکەین و دەیبینین.

ڕێبوار خۆیشی دەڵێت «لەم چەرخەدا ئەدەبی کرێکاری و کۆمۆنیستی سیمایەکی تازە و تایبەت لە شیعر و هونەری کوردی دەنوێنێت، بەم جۆرە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی کوردەواری پەیامی جۆربەجۆری خۆیان بەها و زەوقەکانیان لە جیهاندا دەگەیەنن».

بێ گومان ئەو بۆچوونەی ڕێبوار ڕاستە، ئەگەرچی پێشتر ئەدەبی کوردی غائب نەبوە لەم جۆرە ئەدەب و شیعر و هونەرە، لە بابەتی قانع، بەڵام زۆریش نەبوون، بەڵام دەکرێت دەیەی حەفتاکان و هەشتاکان چ لەم دیوو چ لەو دیوو (باشوور و ڕۆژهەڵات) ئەم مۆدێلە لە شیعر هەستی پێ بکەین، ئەگەرچی هەندێکیان ڕەنگە نەچنە چوارچێوەی قاڵبی ئەدەبی کرێکاری، بەڵام بوونە خاوەنی ئەدەبی بەرگری و هیومانیستی، یان داکۆکی لە ژنان و

منداڵانی وەک (شێرکۆ بێکەس، لەتیف هەڵمەت، ئەنوەر قادر) لە ڕۆژهەڵاتیش سەرەڕای پێشەنگانی شیعری نوێی کوردی (فاتح شێخ لئیسلامی (چاوە)، سوارەی ئێلخانیزادە، عەلی حەسەنییانی..)، بەڵام پێشەنگانی ئەم ئەدەبەی کە ناومان نا ئەدەبی کرێکاری و چینایەتی. دەکرێت ناوی (ڕێبوار) پێشەنگ بێت! دواتر، (ئەحمەد بازگر، بژار، حسێن بەفرین، حەمە عەزیز، سلێمان قاسمیانی (کاکە)، نەکەرۆز) ڕۆڵی گرینگیان هەبوو لەم بارەیەوە.

بۆیە لە ناو شیعرەکانی ڕێبوار هەست دەکەی لە کوێ ڕووداوێک بۆنی ئەم ئەدەبیاتەی لێ بێت، حازرە و ئامادەگی هەیە.

لە شیعری (میوانی تۆن) کارەکتەری شەهید، یان گیانبەختکردوو، تام و بۆی کرێکار و چینایەتی پێوەیە، ڕووداوگەلی ئەو سەردەمە تام و بۆی چینایەتییان لێ دێت، بۆیە ڕێبوار حازرە.

ناسنامەی ئینسانی زەحمەتکێش لە شیعرەکەدا بە ئاشکرا دیارە و ڕێبواریش قاڵبی میهرەبانی و باوەشی گەرم و حەماسەت و گەورەیی و کارێزمابوونی کردوە بە بەریدا، بەڵام هەرگیز لەم شیعرە و زۆربەی شیعرەکانی تری ڕێبوار دەست لە وێنە و بیرەوەری و ئینسانی کرێکار و زەحمەتکێش هەڵناگرێت.

**2020/3/17**

**سەردەمی کۆرۆنا**

**سلێمانی**

(5)

# شیعری گۆرانی و ڕۆمانسییەت لای ڕێبوار

دیسان سڵاو؛
کۆپیێچی ئەم پەیامە، ئەو بابەتەیە کە جێ مابوو! سپاستان دەکەم ئەگەر ئاگادارم کەن کە ئایا وەڵامی هەموو بابەتەکانی تائێستام داوەتەوە یا بابەتێک ماوە!؟
هەڵبەستی دووەم، بەیارمەتی بەڕێز نەجمەی غولامی، لە سەر هەڵبەستێکی دێرینی من، سازمان کرد و کردمانە هەڵبەستێکی گونجاو؛ لە زمان منداڵێکی ئاوارەی کوردەوە لە دژی شەڕە نگریسەکەی نێوان عیراق و ئێران لە ١٩٨٠کاندا ...
ئەو هەڵبەستەی (وەک چۆلەکە) کە بوو بە بنەمای ئەم شیعرە، هەڵبەستێک بوو بۆ منداڵێکی خنجیلانەی دایک-تەورێزی و باوک سنەیی؛ بەناوی «بەهار» کە دایکی، هەر بە لاوی، کاتێک «بەهار» زۆر منداڵ بوو، بە شێرپەنجە، تێداچوو! «بەهار» لە نێوان ماڵی باوکی لە سنە (کوردستان) و ماڵی داپیرەی لە تەورێز، هات و چووی ئەکرد و هەرکات ئەهاتەوە، ماڵمانی پڕئەکرد لە شادی...

**مصلح ڕێبوار**
**14ی مەی 2020**
**سوید**

## (1)

ڕێبـوار، شـاعیری ڕادیکاڵ و کۆمۆنیسـت، جیا لەوەیی خاوەنی دەیان شـیعر و سـرودی کرێـکاری و چینایەتییە، پاش ئەوەی (2013) زۆربەی شیعرەکانیمان کۆ کردەوە*، دیوانـی (بـۆ ئـازادی) چاپمان کـرد، بەڵام هێشـتا وەکوو خۆیشی دەڵێ «زۆری شیعری تری ونن، یان فەوتاون یان هێشتا کۆ نەکراونەتەوە».

بـەڵام پـاش بەردەوامـی و گـەڕان و پێداچوونـەوە و هـەوڵ بۆ زیندووکردنەوەی هەموو یان بەشـێکی زۆرتری شیعرەکانی بەمدواییيانە چەند شیعری ڕێبوارمان دۆزییەوە، کە لە فەوتان ڕزگار بوون:

## یەکەم: تاسەم لێت نەشکا

تاسەم لێت نەشکا، گیانی شیرینم
وامن ڕۆیشتم، سا کەی بتبینم
ئەستێرەی دووری، ئاسمانی ڕەشی
ئاسۆی ڕووناکی، بە دیمەن گەشی
دڵ کەیلی گەشی، ئاسۆی گەشی دور
بە بێ کۆکردن، لە کۆسپ و سنوور
تا ڕۆژی ژینی، سەربەست و ئازاد
سەربەست بتبینم، سەربەست و دڵشاد

شـیعرێکی سـاده، بـەڵام پڕ لـە وێنـە، پڕ لـە دیمەنی جوان و ناسـک (شـیعر هەر چەندە ژێرخانی ڕۆشـنبیری ئێمەیە، دەکرێت لە ناو شـیعردا بۆ گوتاری ئاینی، گوتاری نەتەوایەتی، بۆ گوتاری سیاسی، بۆ گوتاری ئازادی، ئازادی ژن بگەڕێین... شیعر هەموو ئەو ئەرکانەی پێ سپێرراوە – عەقڵی شیعری – لەتیف حسێن).

ڕەنگـە یەکێـک لـەو شـاعیرانەی ئـەو هەموو ئـەرک و بەرپرسـیارێتییەی خسـتبێتە سـەر شـیعرەکانی، یـان نـاو شـیعرەکانییەوە، بـە تایبەتـی گوتـاری چینایەتـی، گوتاری کرێـکاری و گوتاری جوانناسـی و داکۆکی لـە مافی ژنان و عەدالـەت و بەرابـەری، گوتـاری ڕۆمانسـییەت و ڕیالیزمی پرۆلیتاریا ڕێبوار بێت.

پێی وایە، نەک هەر ئینسانەکان، وەزیفەیان ئەوەیە، بەڵکوو پێی وایە، شـیعر، ئـەدەب، هونەر و ژانراکانـی تریش، دەبێت ئەمە وەزیفەیان بێت.

ڕێبوار، کە زۆرتر شیعری سیاسی و کرێکاری و چینایەتی بـۆ چینەکەی وتوە، بەڵام لە پاڵ ئەوانەیشـدا، دەقی شـیعری ڕۆمانسـی و غرامـی جوانـی نووسـیوە، کـە یەکێکیـان ئەم شیعرەیە (تاسەم لێت نەشکا)، ئێمە ئەوکاتەی دەستمان کرد بە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە لە شـیعرەکانی (ڕێبوار) لە دیوانێکدا بـۆ یەکەم جـار چاپمان کرد، بە ناوی (بـۆ ئازادی – 2013) بۆمان دەرکەوت، ئەمە هەموو شیعرەکانی (ڕێبوار) نییە.

ڕێبوار دەگێڕێتەوە ئەوکاتەی سەفەرم کرد بۆ سوید، کە تەنها دەفتەری شیعرەکانم لە جانتا دەستییکەمدا بوو، بەڵام

لە ناو وێستگەی میترۆ کەسێک پەلاماری دا و بردی، بە حسابی خۆی پڕیەتی لە دۆلار و کرۆن، بەڵام من ڕەنج بە خەسار بووم و کابراش دڵنیام هیچی پێ نەبڕا و شیعرەکانم زۆری فەوتان.

شایەد، ئەم شیعرە و ئەو شیعرانەی دۆزیومانەتەوە و خەریکی گەڕانین بە دوایاندا، بەشێکی ئەو شیعرە فەوتاوانە بێت، کە هیوادارم هەموو ئەوانە بدۆزینەوە لە چاپی دووهەمی دیوانەکەیدا چاپی بکەین.

ئەم هۆنراوەیە کە ساڵی (1985) نووسراوە، چیرۆکی ئەویندارییە، کە پێ دەچێت ناکام مابێتەوە، پڕە لە چاوەڕوانی و سەفەر و لەگەڵ ئەوەیشدا خوازیاری سەربەست و ئازادییە، بۆ ئەو مەدلوولەی کە لە شیعرەکە باس دەکرێت، دیار نییە، کارەکتەری بەرانبەر، یان مەدلوولی ناو شیعرەکەی کێیە؟

بەڵام دیارە کە ماوەی زەمەنی و دیدار و ناسینی ئەم دوو کەسە، کەمە. شاعیر دەڵێ «پێ ڕانەگەیشتم، تاسەم لێت بشکێت»، ناچار بە سەفەر دەبێت، بەڵام پرسیاری ئەوە دەکات و جێی دەهێڵێت، ئەی کەی بتبینمەوە؟

لەم شیعرە دیار نییە، ئایا چیرۆکی شیعرەکە و کات و سەردەمی دەرچوونی شاعیرە لە شارەوە بۆ شاخ و پێشمەرگایەتی، جێهێشتی یار و مەدلوولە؟ یان کاتەکەی دەیەی هەشتاکانە؟ کاتێک کە شاعیر لە کوردستانەوە سەفەر دەکات بۆ ئەورووپا؟ دیارنییە!.

بەڵام لە هەروو حاڵەتدا داوای ژیانێکی ئازاد و سەربەست دەکات، بەڵام بێ ئەمەل نییە لە بینینەوەی یار،

لەو شوێنەی کە دەڵێت:

«دڵ کەیلی گەشی
ئاسۆی گەشی دور
بەبێ کۆکردن
لە کۆسپ و سنور»

دڵ کەیلی ڕوانینە بۆ ئاسۆی دوور، بە تێپەڕێن لە کۆسپ و کەندی سنوور، بەم شێوەیە بێت دەکرێت بڵێین «حاڵەتی دووهەمی کۆچ و سەفەری شاعیرە».

بەڵام هەر چۆنێک بێت، شیعرەکە سادە و ساکارە، بەڵام جوان و پڕ گوزارشتە، کە شایستەی ئەوەیە وەکوو کارێکی جوان سەیر بکرێت، بە تایبەتی کە لە فەوتان ڕزگاری بوە، ساڵی (1985)یش لە لایەن نەجمەدین غوڵامییەوە کراوەتە گۆرانی و یەکێکە لە گۆرانییە جوانەکانی.

# (2)

## دووهەم: شیعری وەك چۆلەكە

وەك چۆلەكە چڵاوچڵ
وەك پەروانە گوڵاوگوڵ
شارە و شاری كوردستان
ئەكەم لەبەر بۆمباران
دایك و بابم بێكارن
ڕووت و برسی و هەژارن
ماڵ وێرانە و ڕووخاوە
خومپارە و بۆمب لێیداوە
جەژنم كوا؟ نەورۆزم كوا؟
گۆرانیم كوا؟ سۆزم كوا؟
شەڕ هەمووی لێ تێكداوم
ئاخ بۆ برای كوژراوم
دایەی شیرین بابەگیان
با هاوار كەین بە گشتمان:
شەڕ دەسبەجێ تەواو بێ!
خێر و خۆشی لە ناو بێ!
دنیای ئێمە با شاد بێ!
دنیایەكی ئازادی بێ!

ئەم شـــیعرەش، کە تازە دۆزراوەتەوە، لە ناو دیوانەکەدا نییە، بەرهەمێکی تری ڕێبوارە.

هــەر چەنــدە، مێــژووی بنەمای ئەم شــیعرە، هــی دەیەی شەستەکانە، بەڵام لە ساڵی (1988) کە هاوکاتە لەگەڵ شەڕی عێراق – ئێران و سەروبەندی کۆتایی شەڕی نەگریسی نێوان دوو ئەژدیهــای ناوچەکە بوو، بەڵام هــاوکات بوو لەگەڵ دوو ڕووداوی جەرگبــڕ لە کوردســتانی عێــراق، ئەوانیش، یەکەم: کیمیابارانکردنی هەڵەبجەی شــەهید لە لایەن ڕژێمی بەعس و سەدام حسێن، دووهەم: پرۆسەی ئەنفالکردنی گەرمیان و شار و شــارۆچکەکانی کوردستان لە لایەن بەعسەوە، کە ئەوپەڕی ئەوجــی بەربەرییەتی بەعس و وڵاتانی بــێ دەنگی عەرەبی و ئیسلامی، دیموکراسی، بەناو خۆرئاوا و ئەمریکا بوو.

شیعرەکە، باس لە شەڕ و ماڵوێرانی و بۆردومانی شار و لادێی کوردستانە، بەڵام دیسان دەبێ بڵێم مۆرکی چینایەتی و ئەدەبی پێشڕەو و کرێکاری بە شیعرەکەوە دیارە.

«دایــــــك و بــــابــــم بــــێــــکــارن
ڕووت و بــــرســــــــی و هــــــــەژارن
دنـــیـــای ئـــێـــمە بـــا شـــاد بـــێ!
دنــــیــــایەکی ئــــــازاد بــــــێ!»

واتا چەمک و مفاهیمی (ڕووت و برســی و هەژار) یان (دنیــای شــاد، دنیای ئازاد) لــەو چەمکانەن کــە زۆرتر لە ئەدەبیاتی چەپ و کرێکاری شوێنیان گرتوە، بەڵام دەکرێت

ئەم چەمکە کرێکارییانە بۆ دایک و باوکی تاکێکی کوردیش ڕاست بێت، بەڵام کۆی شیعرەکە باس لە شەڕ و نەهامەتییە کە بە سەر کورددا هاتوە، بە تایبەت لەو شوێنەی کە دەڵێ:

«جەژنم کوا؟ نەورۆزم کوا؟
گۆرانیم کوا؟ سۆزم کوا؟»

نەورۆز، وەکوو ڕەمزی شادی و ژیانەوەی گەلی کورد چاوی لێ دەکرێت و بۆیە ڕێبوار بە دەنگی بەرز هاوار دەکات، ئێران – عێراق، ڕێگا نادەن خەڵک جەژن و مەراسیمی نەورۆزیش بکەن، کە دیارە بۆ کوردی هەر دوو دیووی دەڵێت، دیارە مەبەستی لە برای کوژرا، برا کوردەکانییەتی لە شەڕدا؟ کام شەڕە؟ شەڕی کۆمەڵە – ئێران؟ یان یەکێتی و بەعس؟ کە لە هەر دووکیان براکانی دەبوونە سوتەمەنی شەڕ و دوو حەرەکەتی چەپ و مارکسیستی بوون لەو کاتەدا.

ڕێبوار، وێنایەکی گەورەی شەڕ و نەهامەتییەکانی کردوە لە دەیەی هەشتاکان، کە هەرگیز نە خۆی نە کورد خوازیاری نەبوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی قوربانی ئەو شەڕە کورد بوە، بە دەنگی بەرز هاوار دەکات «شەڕ دەستبەجێ تەواو ببێت»، وەکوو کەسێکی عەدالەتخواز.

بەڵام جیا لەوانە (ڕێبوار) وێنە و مانا و مەدلوولی جوانی لەم شیعرەدا بەرهەم هێناوە، گە ئەگەر چی سادەن، بەڵام پڕن لە وێنەی واقیعی و دەلالەتی گەورە، یان بڵێم «هەمیشە

ڕێبــوار چرپەی کــردوە نەک هاوار و دەنــگ بەرزکردنەوە»، (نووســەر کــە وەختی نووســینی هات، دەبێت بــە ژێر باری نیگەرانییەکەوە تا ئەوەی هەراســانی دەکات و نەینووســێت، ئارام ناگرێت)، نووســین ئەوەیە «بەهرە یان توانای ئەوەمان هەبێت لە چیرۆکێکی ژیانی تایبەتی خۆمان وا بگێڕینەوە، وەک چیرۆکەکە تایبەتبێت بە ژیانی کەسانی دیکە و چیرۆکی ژیانی کەســانی دیکــەش وابگێڕینەوە، وەک باس لــە ژیانی تایبەتی خۆمان بکەین- تاڤگەی زیوو - حەمە سەعید حەسەن».

لەم شــیعرەدا ئەوەی ڕووی داوە، ڕێبواری هەراسان کرد، هــەر ئەو کاتەش لە ژێر زەبر و زوڵمی بەعس، نوســیویەتی و بێ دەنگ نەبوە، گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە، هەم ژیانی شەخســی ڕێبــوار و هاوماڵەکانییەتی، هەم ژیانی زۆرینەی کۆمەڵگایە، لە هەر دوو حاڵیشــدا ژان و ئازاری هەموانە، بەڵام ڕاستگۆیانە و بەرپرسیارانە دەیگێڕێتەوە، هەر بۆیە حیکایەتەکە کاتێک دەبێتە بەرهــەم و شــیعر و خۆی نمایش دەکات و هــەر ئەو کاتەیش ســاڵی (1988) لــە لایەن نەجمــەی غولامی دەکرێتــە گۆرانی و لــە ژێر سانســۆری بەعــس ڕزگاری نابێت و ئــەم گۆرانییە (شیعرە) - چوار گۆرانی تری کاسێتەکە سانسۆر دەکەن، بەڵام کەنگێ هاوارەکانی بۆ ئازادی، لە ژێر سانســۆر مانەوە، کەنگێ ئازادی قەفەس دەکرێت و دیل دەکرێت، بۆیە سەرەڕای هەموو سانســۆرەکان، بەڵام ئەو شــیعرە هەر بە زیندوویی مایەوە لە قەفەســی دیلی بەعس و سانسۆر ڕزگاری بوو لە شەقەی باڵی دا و تا ئێستایش شیعر و گۆرانییەکە بە زیندویی مانەوە.

**2020/4/20**

**سەردەمی کۆرۆنا**

## چاپکراوەکانی ئەنوەر حسێن (بازگر)

**1- (تیر)ستان**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2003**

**2- خوێندنەوەیەك بۆ مەسەلەی گۆڕانی سیاسی لەعێراقدا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2003**

**3- قەدەر**

شیعر- **2005**-چاپی یەکەم

**2007**-چاپی دووەم

**4- کورد لە ئاڵووگۆڕانکارییەکانی عێراقدا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2005**

**5- ئاشنابوون بە ئەفلاتوون**

پێشەکی و پێداچوونەوە-**2005**-چاپی یەکەم

**2005**-چاپی دوەم

**6- ڕۆمانێك لەگفتوگۆدا – چەند دیدارێك سەبارەت بەشاری مۆسیقارە سپییەکانی بەختیار عەلی**

دیدارو چاوپێکەوتن-**2006**

**7- فایل**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2007**

**8- کورد و قەیرانەکانی عێراق**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2007**

**9- ئاشنابوون بە ئەرستۆ**

پێشەکی و پێداچوونەوە-**2007**

**10- یاداشتەکانی ڕۆژانی تەنیایی، گابرێل گارسیا مارکیز**

پێشەکی و پێداچوونەوە-**2008**

**11- دۆکیۆمێنت**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی**2008**-چاپی یەکەم

**2008**-چاپی دووەم

**12- دیدار لەگەڵ سێ شاعیری چەپی کوردستانی ئێران - لەئارێزەوە تا سازو زوڵفا – چوار دیدار لەگەڵ چوار شاعیری ڕۆژهەڵاتی کوردستان**

دیدار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی-**2009**چاپی یەکەم

**2010**-چاپی دوەم

**13- عێراقی ناهۆمۆجین**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2010**

**14- چاوەکانی باران**

شیعر-**2010**

**15- سانسۆر**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2011**

**16- عێراقی مۆزایك و ناهۆمۆجین**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2011**-چاپی یەکەم

**2011**-چاپی دوەم

**17- مۆدێلی حیزبایەتی لەکوردستان**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2011**-چاپی یەکەم

**2011**-چاپی دوەم

**18- لۆژیك، ئەپستمۆلۆژیا، میتافیزیك لە دیدیی فەلسەفییەوە**

فەلسەفە- **2011**-چاپی یەکەم

**2012**-چاپی دوەم

**19- چۆن بۆت بدوێم - دیوانی شیعری ئەحمەد بازگر - گۆمەشین - دیوانی شیعری ئەحمەد بازگر**

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پێشەکی، شیعر**2011**- چاپی یەکەم

**2021**-چاپی دوەم

**20- سەردەمی چاوەڕوانی**

دیوانی شیعر-2012

**21- کاتی دواین قسەیە**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-2012

**22- ڕۆڵی (ی.ن.ك) لە دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگەی کوردستان**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2012

**23- پریسترۆیکای بەهاری عەرەبی**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2012-چاپی یەکەم

2014-چاپی دووەم

2015-چاپی سێیەم

2021- چاپی چوارەم

**24- قەقنەسێك بەسەر ئاویەرەوە**

دیدار لەگەڵ مەزهەری خالقی-2012

**25- شاهێنی ئاناوازا**

دیدار لەگەڵ عەبدوڵڵا حەسەن زادە-2012

**26- گوڵە گەنمێکی قەرسیلی سەوز**

دیدار لەگەڵ ناسر ڕەزازی-2012

**27- ملوانکەی شین - دیوانی شیعری شەریف**

کۆکردنەوە و پێشەکی بەهاوبەشی لەگەڵ لوقمان ڕەئوف، شیعر-2013

**28- بۆ ئازادی - دیوانی شیعری موسلیح شێخولئیسلامی (ڕێبوار)**

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پێشەکی، شیعر -2013-چاپی یەکەم

2021-چاپی دووەم

**29- مەلا بەختیار-گوتاری ئەنکەرە، وەرچەرخانی هاوچەرخی کوردایەتی**

کۆ وتاری مەلا بەختیار-2013

**30- پێگەی خۆرهەڵاتی کوردستان لە کۆنگرەی نەتەوەییدا**

دیدار و چاوپێکەوتن2013

**31- لە زرگوێزەوە بۆ ئۆکرانیا-دیداری ئیبراهیم عەلیزادە**

دیدار لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە-2014

**32- لە قەندیلەوە بۆ کۆبانی**

دیدار لەگەڵ جەمیل بایك- هاوسەرۆکی (**PKK**)، موراد قەرەیلان-

ئەندامی کۆنسەی سەرۆکایەتی (**PKK**)

دیدار و چاوپێکەوتن- **2015**

**33- هەژمونی پەکەکە دوای سەرهەڵدانی داعش**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2015**-چاپی یەکەم

**2017**-چاپی دوەم

**34- بەهاری عەرەبی و مەترسییەکانی فەندەمێنتاڵیزم**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2015** -چاپی یەکەم

**2021** چاپی دووەم

**35- هەژموونی هیلالی شیعی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2015**-چاپی یەکەم

**2017**-چاپی دوەم

**36- پێشێلکارییەکانی دژ بە ڕۆژنامەنووسان لە هەرێمی کوردستان**

لێکۆڵینەوە لە ڕەوشی ڕۆژنامەگەری-**2016**

**37- حکایەتی مرۆڤە ستەملێکراوەکان**

خوێندنەوەی کتێب-**2016**

**38- داعش و میلیشیاکان**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2016

**39- فاکت**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-2016

**40- هەرێمی کوردستان و ململانێ ناوچەییەکان لە نێوان دوو زۆن و دوو جەمسەردا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-توێژینەوەی جیهانی-2017

**41- هێزەکانی خۆرهەڵاتی کوردستان و پرسی سەربەخۆیی**

دیدار و چاوپێکەوتن-2016

**42- کورد لەناو عێراقی مۆزایك و ناهۆمۆجیندا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی2017- چاپی سێیەم

2021 - چاپی چوارەم

**43- نفوذ الهلال الشيعي في الشرق الأوسط**

لێکۆڵینەوەی سیاسی- وەرگێڕانی بۆ عەرەبی- عەلی شەمدین-2017

**44- کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان**

**- کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان بۆچی؟**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2018-چاپی یەکەم

2018-چاپی دوەم

**45- کوردستان پاش ڕیفراندۆم**

دیدار و چاوپێکەوتن-2018

**46- بیبلۆگرافیای بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا 2004-2019**

کۆکردنەوەی بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا بەهاوبەشی لەگەڵ بابان ئەنوەر-2018

**47- ڕەوشی ڕۆژنامەگەری لە هەرێمی کوردستان (2008-2018)**

لێکۆڵینەوە لە ڕەوشی ڕۆژنامەگەری- بەهاوبەشی لەگەڵ پەرژین ئەحمەد-2019

**48- جەمیل بایك - فیگەرێكی شۆڕشگێڕ**

دیدار و چاوپێكەوتن-2020

**49- ڕەهەند**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-2021

**50- ڕۆژئاڤا: ئۆپەراسیۆنی تورکیا و ئەجێندای ئەمریکا و ڕووسیا**

دیدار و چاوپێكەوتن-2020

**51- ئەستێرە سورەكانی ئاسمانی چەوساوەكان- شیعری كوردی و ڕەهەندی چینایەتی**

لێكۆڵینەوەی ئەدەبی-2021

**52- بۆ هەواران دێمەوە - دیوانی شیعری حسێن شەبەق**

كۆكردنەوە و ئامادەكردن و پێشەكی، شیعر-2021

**53- كوردستان بەهەشتی ئەوروپا و دۆزەخی ئەفریقا**

لێكۆڵینەوەی سیاسی- 2021

**54 - (تیر)ستان - بەرگی یەكەم - 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی ((تیر)ستان - فاكت)

**55 - (تیر)ستان - بەرگی دوەم – 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی (فاكت – فایل - دۆكیومێنت)

**56 - (تیر)ستان - بەرگی سێیەم – 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی (دۆكیومێنت – سانسۆر – كاتی دواین قسەیە)

**57 - (تیر)ستان - بەرگی چوارەم – 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی (كاتی دواین قسەیە - ڕەهەند)

**58 - پێگەی خۆرهەڵاتی كوردستان لە كۆنگرەی نەتەوەییدا-**
**-2021**چاپی دوەم

(پێگەی خۆرهەڵاتی كوردستان لە كۆنگرەی نەتەوەییدا - كۆنگرەی نەتەوەیی كوردستان بۆچی)

**59 - پرسی ڕیفراندۆم و سەربەخۆیی كوردستان2021- چاپی دوەم**

(هێزەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان و پرسی سەربەخۆیی - كوردستان پاش ڕیفراندۆم)

**اسم الكتاب: للحرية**

**الموضوع**: مجموعة القصائد ريبوار
**اعداد ودراسة والتقديم**: انور حسين (بازگر)
**طبع وتصحيح**: هيوا كاظم
**التصميم**: اوميد محمد
**الغلاف**: ارام على
**الطبعة الاولى**: 2013
**الطبعة الثانية** : 2021

